مامۆستا عوسمان کانی پانکەیی

# سەروەرییەکانی
# یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
# لە رۆژگارە سەختەکانی گەلی کوردا











٢٠٠٨ - سلێمانی

# سەروەرییەکانی
# یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
# لە رۆژگارە سەختەکانی گەلی کورددا

**نووسینی**

**مامۆستا عوسمان کانی پانکەیی**

**کتێبی رووناکبیری ( ٦٤ )**

**٢٠٠٨**

* ناوی کتێب: سەروەرییەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ڕۆژگارە سەختەکانی گەلی کورددا

* نووسینی: مامۆستا عوسمان کانی پانکەیی

* سەرپەشتیار: سەمەد زەنگنە

* پیت چنینی: پشتیوان فەرەج محەمەد، ئاواز فەرەج محمد

* دیزاین و بەرگساز: محەمەد بابۆڵی

* چاپخانە: ڕوون

* چاپی یەکەم، سلێمانی

* تیراژ: ٢٠٠٠

* ژمارەی سپاردنی (١١٢٨)ی ساڵی ٢٠٠٧

* کتێبی ڕووناکبیری ژمارە (٦٤)

* لە بڵاوکراوەکانی بەشی ڕووناکبیری مەکتەبی ڕێکخستنی (ی. ن. ك)

ناونیشان: کوردستان – سلێمانی، گەڕەکی ئەندازیاران، ژمارەی گەڕەك (١٠٥)، کۆڵان (٤١)، خانوو (٤)
Email: basherunakberee@yahoo.com, Tell: 3182182 – 07501162938

# ناوەڕۆك

## سوپاس و پێزانین

بە ئەوپەڕی هەستی پێزانینەوە زۆر سوپاسی هەمیشەیی تێکڕای ئەو کادرو کەس‌و هاوڕێو دۆستانەم ئەکەم کە هاوکاری تەواویان کردم‌و بوون بەسەرچاوەی سەرەکی ئەم نوسینەم لە زانیاری ڕووداوە تایبەتی‌و جۆراو جۆرەکانی ناو کارەساتەکانی کوردستان‌و بەسەر گەلی کوردمان لەشوێنە جیاجیاو داستان‌و بەسەرهات‌و شەهیدەکانی سەروەریمان بەڕاستی هاوکاریان کردم هەندێکیان مەیدانی لەناو داستانەکانی خەباتدا بوون‌و منیش بۆ مێژوو تۆمارم کردووەو لەو بەڕێزانەش کە ئەمانەن:-

بەڕێز کاک مستەفا چاوڕەش، کاک محمود سەنگاوی، کاک شێخ جعفر قەرەداغی، د.شوان عوسمان، کاک ڕابەر، کاک حاکم برایم، کاک عبدالقادر باجلوری بادینی، کاکە رەیس‌و مامە سەعەو کاک حدادو کاک غفوری کۆمیتەی پێشمەرگە دێرینەکان، حمە ڕەزا برایم، کاکە نەبەزی کاکە حمە زرگوێزی، کاک شێخ کەریم چاوڕەش‌و کاک حمەنوری گەرمیانی، کاک حسام عەلی فەرەج، کاک عوسمان حمە کاکی هەڵەدنی، کاک محمد سەنگری‌و کاک ملا حسین، کاک سیروان کوێخا نەجم، کاک شێخ عەلی هەڵەبجەیی، کاک حمە سۆران مامۆستا غازی سالار گەرمیانی، مامۆستا ڕێبوار هەولێری، مامۆستا سۆران خانەقینی، جەمال سیتەکی، کاک بەهزاد خانەقینی‌و کاک عەلی صالح، کاک کەمال تایەر برای شەهیدی سەرکردە مامۆستا جەمال تایەر، کاک نعمەت برای شەهید ڕێباز، د. مجید حمە امین هەولێری، کاک فەخرەدین تەوێڵەیی/هەورامی، کاک محمد حاجی صابر شارەزووری، شێخ ئاراس مامۆستا شێخ محمد باساکی، تۆفیقە ڕەش پێنجوێنی، کاک سەرکەوت بەڕێوەبەری ئاسایش، کاک عەلی چەلەبی، شێخ حمەزیاد شێخ عبدالله، کاک احمد کرێکار کەرکوکی، مامۆستا شێخ مستەفا بادینی، کاک جبار عەلی شاوەیس نەیێی.

لەهەمان کاتدا سوپاسی ناکۆتاییم بۆ هەموو ڕۆشنبیران‌و کارمەندانی ڕۆشنبیری گشتی ئەمیرە عومەر بەشی دیزاین‌و خوێندکاری سەرکەوتوو پشتیوان فەرەج‌و ئاواز فەرەج لەگەڵ بەڵێن مۆفەری‌و مامۆستای بەنرخ مامۆستا نەوزاد وەڵەسمتی زۆر هاوکاریان کردم‌و هەروەها سودوەرگرتن لە گۆڤاری (ڕێبازی نوێ) و (الشرارة)ی ژمارەکانی ١ی ساڵی ١٩٩٠و (١١-١٢)ی ساڵی ١٩٨٩و شرارەی ژمارە (١٢)ی ساڵی ١٩٨٩ نوسینەکانی جینۆسایدو ئەنفالەکان و ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، داوای لێبوردن لەو کەسانە ئەکەم لەیادم کردبن‌و بەگشتی زۆر سوپاسیان ئەکەم.

**نووسەر**

# پێشەکی

﴿ بەناوی خوای پەروەردگار ﴾

خوێنەران و ڕۆشنبیرانی بەڕێز بۆ زانینتان مەبەستی سەرەکی و تایبەتیم لەم نوسینەمدا خستنە پێشچاوی ئەو هەموو ڕووداوو کارەساتە ناهەموارو کوێرەوەری ژیانی چەند نەوەیەکی ڕۆڵەکانی گەلی کوردمانە کە لەماوەی دواچارەکە سەدەی بیستەمدا توشی هاتن لەگەڵ ئەو هەموو ململانێو بەرگریە بێوێنەیە پاڵەوان ئاساییە پڕ لەهەستە شۆڕشگێڕیەی ئەو نەوانەی ئەو سەردەمەیە. توانیان ئەنجامی بدەن بەقوربانیدان بەخوێن و گیانو سامانو ژیانیان بەرامبەر هەموو ئەو ڕژێمە یەك لەدوا یەکەکانی داگیرکەرانی کوردستان بەتایبەتی ڕژێمی هەرە دڕندەیی بەعسی صەدام کە بە ئەوپەڕی تواناو بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکەکانی هەتاکو کۆکوژی کیمیایی و هێرشی بەربڵاوی ئەنفال و سامانی ولاتی بۆ لەناوبردنی گەلی کوردمانی بەکار دەهێنا ئەم نوسینەم کۆمەڵێك بەڵگەنامەی باوەڕو متمانەی مێژووییە وەکو خۆی خستومەتە پێش چاوی نەوەکانی ئایندەمان هەتا بزانن گەلی کوردو ئەو نەوانەی نێوان دوو ڕوداوی مێژوویی لەماوەی ڕۆژانی (١٩٧٥/٣/٦) کارەساتو ڕۆژی ڕەشی کورد هەتا ڕۆژانی (١٩٩١/٣/٥)ی ڕۆژی سەرەتای ڕاپەڕین و سەرکەوتنی بەهاری گەلی کورد چی ڕویداوە بەسەر ڕۆڵەکانی ئەم گەلە ستەمدیدەیە، با نەوەکانی ئایندە شانازی پێوە بکەنو ڕوداوەکانی یاد بکەنەوەو بیکەنە بەردی بناغەی وشیاریو پارێزگاری لە دەسکەوتەکانیان و گەشە پێکردنیان و هەتا ڕزگاری و ئازادی تەواوی کوردستان و گەلی کورد بەگشتی لەهەمان کاتدا زۆر داوای لێبوردن لەهەر کەمو کوڕیەك ئەکەم لەڕووی حیزبیەوە دڵنیابن مەبەستم هیچ لایەنگیریەکی بیری حیزبایەتی نیەو لەڕووی کەسایەتی و بۆچونەوە ڕێزم بۆ هەموو حیزبو خەڵکە شۆڕشگێڕە کوردستانیو نیشتمانیەکان و جەماوەری گەلی کورد بەشارو گوندنشینەوە کە بەڕاستی ڕۆڵی جوامێرانەی مێژووییان هەبووە من نەم توانیوە نرخی تەواویان بدەمێ تەنیا ئەگەر چەند دڵۆپێك لەو دەریا گەورەیە ئەوەندەم توانیوە.

**نووسەر**

**دووشەممە/٢٠٠٣/٧/٢١**

# هەندێ کارەسات
# لەدوا ساتەکانی کۆتایی شۆڕشی ئەیلولدا

لەدوا ڕۆژەکانی مانگی ٢ ی ١٩٧٥دا چەکدارەکانی ڕژێمی عێراق لەنیوە شەوو هەتا بەرەبەیاندا شارۆچکەی سیدصادقیان داگیرکردو بۆ ڕۆژی دوایی هێزی عەسکەری ڕژێم گەیشتنە شارەکەو سنوری ناوچەی شارەزور لەناحیەی عەربەت و زەڕایەنەوە گۆڕا بۆ دێکانی هەتا نزیك زەڵم، بەرگری لێ‌نەکراو ناچار هەرچی بارەگاو هێزی پێشمەرگەو تەنانەت ڕێکخستن‌و کادرەکانی لە (ڕێکخراوی سیدصادق) بەگشتی‌و بەرەو دێی (چنارە)ی بناری شاخی سورێن بڕۆین‌و خەڵکی دێکان کەوتنە بارێکی نائاساییەوە لەنێوان ئەم دوو هێزەدا. من (نوسەر) ئەو کاتە ئەندامی ڕێکخراوی سیدصادق بووم‌و مامە عبدالخالق هەورامی بەرپرسمان بوو ئەندامەکانی تریش بریتی بوون لە:– کاك حەمە دۆلاشی‌و کاك عەبدول مەلا عەلی ناوگردانی‌و خوالێخۆش بوو کاك تەحسین کوێخا تالیب شانەدەری‌و خوالێخۆشبوو کاك حسێن حەمە فەرەج و مام حەبیب بیارەیی‌و کاك فایەق براخاس هاواری لەم کاتەدا کۆمەڵێك ئەندامی دیاری وەکو کادرەکانی دێکان بەچەکی خۆیانەوە لەگەڵمان دەرچووبوون لەوانە:– خوالێخۆشبوو کاك حەمە ئەمین فەتاح شاتوانی کە بەڕاستی پیاوێکی بەهیممەت بوو، هەروەها کاك نوری حاجی فەتاحی بیەرەشکەیی‌و شەهید ڕەوفی خەلیفە سەعیدو کاك عەلی عبدالقادر صۆفی ڕەحیم قاڵیجۆیی‌و کاك حەمە ڕەشید مارف قاینجەیی‌و کاك عومەری حاجی فەتاح و کاك واحید مامە دێوانە عەلیاوایی. بەمەبەستی هاتنە خوارەوە بۆ دێکانی سنورەکەمان‌و گرتنەوەی ڕێخستنەکان من‌و کاك فایەق هاواری بەشێوەی دوو مەفرەزە لەگەڵ هەندێ لە کادرو ڕێخستنەکانمان لەشەوێکدا لەدێی کانی ئاسکان‌و قاینجەوە دەستمان کرد بە جەولە بەدێکانداو کۆبونەوە بە دانیشتوانەکەیان هەتا دێکانی نزیك سیدصادق ڕۆیشتین وامان کرد کەزۆر لەڕێکخستن‌و جەماوەرەکەمان وریا کردەوەو دوای ماوەی هەفتەیەك زیاتر پێکەوە گەڕاینەوە بۆ دێی کانی ئاسکان کە مامە عەبدولخالق‌و برادەران لەوێ بوون بەمەبەستی نوسینی ڕاپۆرتی سەری مانگ‌و زانیاریەکانی ئەنجامی جەولەکەمان لەماڵی مامە حاجی عەلی ناوێك کۆبوینەوەو لەناوەڕاستی ڕاپۆرت نوسینەکەماندا بووین پێشمەرگەیەکی هێزی خەباتی ئەو کاتە بەناوی کاك دارا حاجی محەمەد ڕەزا موانی خۆی کرد بەژووردا بەزۆری خۆی‌و هاتە لامان‌و وتی ئێوە ڕێکخراون‌و کۆبونەوە ئەکەن، بەڵام بابزانن ئەم شۆڕشە کۆتایی

هاتووه، مامه عەبدولخالق بەتوڕەیی وەڵامی دایەوەو كاك دارا ووتی من لەبەرخاتری مامۆستا عوسمان خزمەت هاتووم ئەم هەواڵەتان بدەمێ كەیفی خۆتانە ئێمە هەموومان شپرزە بووین و هاتینە دەرەوە سەیرمان كرد ڕۆژگارێكی زۆر نائومێدی هاتۆتە پێشەوە هەر پێشمەرگەیەو بەدەم و چاوی هەڵبزڕكاوی بێزاریەوە ڕوو لەشوێنێك ئەكەن و پۆلیسە هەڵاتووەكان و زۆر لەفەرمانبەرەكان بەپەلە بەرەو شارۆچكەی سەید صادق و خۆبەدەستەوەدانەوەی ڕژێم ڕێگایان بەپێ گرتوەتەبەر لەگەڵ جۆرەها پێشمەرگە بەچەك و بێچەك، لێرەدا سەرەتای ماڵ وێرانی و هیوا بڕاوی ڕەنج بەفیڕۆدانەكەی هێزی پێشمەرگەو گەلی كورد دەستی پێكرد، ژن و پیاوی دێكان لەهەمووی زیاتر وەكو كۆستێكی هەرە گەورە دەست لەئەژنۆو ژنان لەچەند ماڵێكدا وەكو شیوەن بان و هاواری گریانیان بەرزبوەوە بەردەوام ئەو چەند ڕۆژە بەتایبەتی كە پێشمەرگەو كوڕە پێشمەرگەكانی خۆیان بەو جۆرە ئەبینیەوە، ئێمە وەكو ڕێكخراو هەرچەند كەسێكمان بەرەو شوێنێك و مامە عەبدولخالق بەرەو ناوچەی هەڵەبجە ڕۆیشت كە بارەگای لە شارۆچكەی بیارە بوو، ئەو كادرو پێشمەرگانەیش ماڵیان بەرەو ئۆردوگاكانی ناو ئێران و شوێنە سنووریەكان ڕۆیشتبوون بەپەلە ئەچوون بیانگەنێ من بەرەو دێی وەڵەسمت و دێكانی خڕنوك و سیامیوە ڕۆیشتم بەلای هەر دێیەكدا ئەڕۆیشتین گوێمان لە شیوەن و گریان بوو، ژنان بەدەم گریانەوە ئەیانلاواندەوە بۆ پێشمەرگەو ئەیانوت: بەقوربانی ڕەنجە بەخەسارەكەتان بین، من لەگەڵ دەستەیەك پێشمەرگە گەیشتینە دێی دۆڵە سوورو كانی سپیكەی دێی سەرجادەی پێنجوێن و لەم كاتانەدا سەیارە زۆر كەم بوو جگە لەوەی هەندێ ڕێگاكان مین (لوغم) ڕێژ كرابوون بەتایبەتی لەنزیك دۆڵە سوور بۆ كەولۆس و لەولاشەوە لەنزیك ڕێگاو پردی زەڵم لێرەشدا خەڵكی هەژار زۆر كەوتن بەسەر لوغمداو ئێمە لەچاخانەكەی دێی (كانی سپیكە) دانیشتین پێشمەرگەی پەرتەوازەو خەڵكی زۆری لێ بوو لەناویاندا هەندێ پێشمەرگەی سنوری گەرمیان و قەرەداغ و كە پێشتر وەكو مەفرەزە چووبونە ناوچەكەو لەم كاتەدا بەچەند هێسترێكەوە هاتبوون بۆ پێویستی و تەقەمەنی كە ئەم دەنگو باسەی كۆتایی شۆڕشیان بیست بوو هێسترەكانیان بەرەڵا كردبوو بێخاوەن و زۆر بەخێرایی ئەم هێسترانە بەكەل و پەلەكانیانەوە ڕێگای بەرەو پێنجوێنیان گرتبوو دیمەنێكی زۆر غەمبارو ناخۆش بوو، پێشمەرگەكانیش ئەگریان و نەیانئەزانی چی بكەن و بۆ كوێ بڕۆن. لەچەند شوێنێكەوە دیمەنی ژن و منداڵە شەهیدەكانیان بەسواری ووڵاخ بەرەو سنووری پێنجوێن ئەیانهێنان بە جلی ڕەشەوە لەناو دەریایەك غەمی نائومێدی خوێنی شەهیدەكانیاندا بەرەو ناو ئێران و ئۆردوگاو چارەنوسی نادیاریان ئەبردن، یەك پارچە هەوای ناوچەكانی

كوردســتان بەشــێوەی تــەم و مــژاوی دەرئەكــەوت و مرۆڤــەكان تــەنیا بەلاشــە ئــەجوڵان و هەریەكە بەلایەكدا بەتاك و خێزانی هەنگاویان ئەنا، چەك لـە پێنج دینـارو فـڕێ دان و هـەتا پانزە بیست دینار ئەفرۆشراو فڕێ ئەدرا، لەناو پێنجوێندا زۆر ئەكرا بەتایبـەت خـەڵكی پێنجوێن، لێرەدا دیاردەی كۆتایی هاتنی شۆڕشەكە دەركەوت.

## کۆتـایی هاتنی شۆڕشی ئەیلول ( هەرەس )

بریتییە لەشکستو کۆتایی هاتنی تەواوی شۆڕشـی پێشوو کە بەشۆڕشـی (ئەیلول) نـاو ئـەبرا لەبـەر ئـەوەی لەمێـژوی (١٩٦١/٩/١١)ەوە دەسـتی پێکردبـوو لـە(١٩٧٥/٣/٦) کۆتایی پێهێنرا بە پیلانێکی دەوڵەتی لەنێوان (هواری بومەدێنی) سەرۆکی جەزائیرو حەمە ڕەزای شای ئێرانو صەدام حسێن جێگر سـەرۆکی ئەنجومـەنی شۆڕشـی عیراقی ئەو کاتە کە (احمد حسن بکر) سەرۆك کۆمار بوو، ئەم شۆڕشە لەو کاتەدا خۆی بەخاوەنی زیـاتر لە سەد هەزار پێشمەرگە ئەزانیو زۆرتـرین سنورو ناوچە شـاخاویەکان لـەژێر دەسـەلاتیاندا بـوو، بـەدێهاتو هەنـدێ شارۆچکەوە هـەتا ئاسـتی قـەزاو ناحیـەش پیلانەکە بەرێکـەوتنی شـای ئێـران بـەوەی کـە هاوکـاریو پـشتیوانی شۆڕشـەکە نـەکات لەبەرامبـەردا ڕێگـای کەشتیەوانی لەبەشێك لـە شـەتی عەرەبدا بدرێت لەلایـەن عیراقەوە کە چەندەها ساڵ بوو ناکۆکیـان لەسـەر بـوو لـەم کاتـەدا لەسـەر خـوێنی کـوردی هـەزار هـەردوو داگیرکـەری کوردستان مامەڵەی خۆیانیان پێکردو گەیشتنە ئەنجام، لەکاتێکدا کە بەهـەزارەها خێـزان ئاوارەی ناو ئێران بوون لەناو تەلبـەنی ئوردوگاکانـدا ئـەژیان لـەناو خێمـەو چادردا هـەر لـە سنوری سەرپێڵی زەهاوی نزیك خانەقینو دوایی کامێرانو سەولاواو سنوری ورمـێ بـەلای چۆمان و گەلاڵـەداو دوایـی کـەرەجی نزیـك تـاران. هـەرەس لـەو کاتـەدا کارەسـاتێکی زۆر جەرگبڕبوو لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵەدا پەژارەو غەمێکی سەخت کشا بەسەر گەلی کوردا لە هـەموو شـوێنێکی کوردسـتان بەگـشتیو شـوێنە ئازادکراوەکـان و نـاو خێزانـە ئاوارەکـان بەتایبەتی شیوەنو گریان بوو وەکو پرسەی چەندەها کۆست کەوتوو بەتایبـەت لەکاتێکدا کوڕو باوکو پێشمەرگەکانیان بەبێ چەكو بەرەگو شێوە شکستی ئـەبینی بـەرەو ماڵەکـەی ئەگەڕایەوە ئەبوو بەگریانو شیوەنێکی بە کۆمەڵ شپرزەیەکی یـەکجار نـاخۆش کەوتـە نـاو هێزی پێشمەرگەو خێزانە ئاوارەکان کـەس خـاوەنی ڕاو بەرنامەیـەکی یـەك سـەعاتی نـەبوو هەریەکـە لەچـەند سـەعاتێکدا جۆرەهـا بڕیـاڕی ئـەگۆڕی، هەرچـەند هـەرەس بەتـەواوی لـە ١٩٧٥/٣/١٩ ڕاگەیەنرا بەڕادیۆی ئەو کاتە کە بڕیارێکی یەکجار جەرگبڕبوو بۆ هـەموو گـەلی کـورد تەنانـەت بـۆ بەشـەکانی دیکـەی کوردسـتان، بـەلام دوای ئـەوەیش زیـاتر بڕیـارەکـانی هێزەکانی پێشمەرگە بوزۆریو ئاوارەکانی ئۆردوگاکانیش بێچارەنووسو خۆدانە دەست قەدەرو ڕوو بـەرەو خـۆ بەدسـتەوەدان (تـسلیم) بونـەوە بەڕژێمی بـەعس لـەڕێگای نـزیکترین سەربازگەوە بوو بەچەکەکانەوە کە بەهەزارەها چەك لەماوەی چەند شەوو ڕۆژێکدا درانـەوە

بەدەسـت ڕژێمـەوە بـە ئەوپـەڕی لارە ملیـی و بێدەسـەلاتیەوە لەولاشـەوە خێزانـە پەناهەندەکانی ناو ئێران بە ئەوپەڕی دڵشکاوی و بێ ئومێدیەوە بەرەو سنور ئەگەڕانەوە، دوای ئـەوەی هـەموو خۆیـان ئەگەیانـدە سـەربازگەیەکی ڕژێـم و نوسـراوی تایبـەتیان بـۆ ئەکردن و ناویان ئەنا بە (عائدون الى الصف الوطني) و ئەوەی خاوەنی کاری ئیداری بوایە ئەگەڕایەوە سەر کاری ئیدارەکەی لە مامۆستاو فەرمانبەر، بەلام مامۆستاکان تا نزیکەی (١٥) ڕۆژ ئەنێرانە قوتابخانەیەك هەرچەند مامۆستا لەوێ پێکەوە ئیمزایان پێئەکردن و دوایی بۆ شوێنە کۆنەکەی خۆیان کە پێش مانگی ٣/١٩٧٤ لەوێ بوون.

لـەم هەرەسـەدا ڕژێـم وەکـو هـەموو ئـاوات و خەونـەکانی هاتبێتـەدی بـە ئەوپـەڕی خۆشیەوە ئاهەنگی سەرکەوتنی ساز ئەداو شەوانە بەتەلەفزیۆن و ئەم دیمەنە ناخۆشەی تەسلیمبوونەوەی پێشمەرگەو خێزانی ئاوارەی پیشان بەخەڵکی ئەداو چەك و تەقەمەنیش بەرەو ڕوو ئەکرایـەوەو کەڵەکـە ئـەکران، لەترسـانا ئەویـشی بدۆزیاتـەوە ئـەیبرد بۆیـان بـەم جۆرە هـەرەس ڕۆژگـارێکی تـاریکی لەمێـژووی کوردا دروست کرد، کە زۆربـەی کـورد بـە ئەوپـەڕی لاوازی و بـێداری دەسـتی و بەملکەچی تەسلیم بەدوژمنەکەی کردەوە کە چەند ڕۆژێـك لـەوەوپێش لەسـەنگەردا بـەرەو ڕوی ڕاوەسـتابوو، لـەپڕ هـەرەس خستنیە نـاو ئـەو ڕۆژگارە ڕەشەوە هەرەس زەمینەیەکی سەخت و لەباری خستە بەردەم دوژمنـی گـەلی کورد بەگشتی و هێزی عەسکەری بەتایبەتی کە بەئارەزووی خۆی بەرنامەی خۆی دەست پێکرد لەگەڵ ئەوەشدا جاڕی لێبوردنی گشتی دیاری کرابوو لە ڕێکەوتننامەی (٦/٣/١٩٧٥)دا لەجەزائیر، بەلام کەوتنە گواستنەوەی زۆر لە لێپرسراوو ئەفسەرەکان بۆ خوارووی عێراق و لەوەزیفەی مەدەنیداو دروستکردنی بـەناو سـەربازگەو شوێنی مەشق بۆ ئەوانەی گوایا سەربازیان لەسەرەو بۆ هێزەکانی پۆلیس کە بەڕاستی دەوری چاکیان هەبوو لەم شۆڕشەدا بۆیە دەزگاکانی ڕژێم بە چاوی تۆڵەوە معاملەی لەگەڵ دەکردن. ئـەو سـەرکردەو کەسـانەو خێزانانەیش لەئێران مانەوە ڕژێمی شای ئێران پەرتەوازەی کردن هەرچەند ماڵێك پێکەوە بـۆ شـارە فارسـی نـشینەکان و دوورخـستنەوەیان لـە شـارە کوردنـشینەکان و بـە زۆری لێپرسراوەکانیان بۆ شاری کەرەجی نزیك تاران کە تیایدا زۆربەی بەرزانیەکان بوون. جگە لـەمانیش هەنـدێکی ڕۆیشتن بـەرەو دەرەوەی ئێران و وڵاتـەکانی ئـەورووپا لەگـەڵ ئـەم بارە پـشێوی و ناهـەمواری و سـەرگەردانی کوردیـەدا بـەردەوام تەسـلیم بوونـەوە هـەبوو بـەرەو ڕژێمی عێراق لە هەموو سنوورێکەوە کە لەدوایدا ئەمانیشیان بەماڵـەوە ئەبردە خوارووی عێراق و لەدێکاندا دایان ئەنان ڕووبەڕووی مختار یان دەزگایـەکی حزبی ئـەو سنوورەیان ئەکردن. بۆ مێـژوو ئـەیڵێم هـەرەس برینێکـی زۆر قوڵ و دیـاری بوو لەهـەموو جەستەکانی

گەلی کورداو ئەوی لەکاتی هەرەسدا ژیابێت یان لەشۆڕشەکەدا بەشداری کردبێت بە ئەوپەڕی بەڵگەی زیندووەوە ئەگاتە ئەو ئەنجامەی هەر بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی یان چەکداری پێشمەرگایەتی کە مەبەستی گەیاندنی گەلی کورد بێت بەهەر مافێکی نەتەوایەتی ئەگەر پشت بە هاوکاری و پشتیوانی هەر دەوڵەتێك لەدەوڵەتە ناوچەیی و داگیرکەرەکانی بەشەکانی کەی کوردستان ببەستێت ئەوەیە ئامانجەکەی بێگومان و بێ‌لێکدانەوە کارەساتی شکستی و هەرەسە ئەگەر چەندەها ساڵیش درێژە بکێشێت، چونکە هەرکاتێك یەکێ لەو دەوڵەتانە بزانن هەر بزووتنەوەیەك لەناو پارچەیەکی کەی کوردستان و لەدژی دەوڵەتە سەردەستەکەی کە بکرێت هەر بەزوویی لەلایەن دەزگا تایبەتیەکانەوە سەرکردەکان و بەرپرسی ئەو بزوتنەوە بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردنی جم و جۆڵ و بەرنامەو چالاکیەکان و لەهەمان کاتدا بەکارهێنانیان وەکو وەرەقەیەکی زەغت یان چەکێك دژی دەوڵەتەکەیان بۆ ملکەچ پێکردنی ئەو دەوڵەتە لەپێناو بەرژەوەندی خۆیان کە چەندەها ساڵ بێت ناکۆکیان هەبێت لەسەری وەکو ئەڵێن (بە بەردێك دوو نیشانە ئەشکێنی) هەم شۆڕشەکە نایەڵێت بەئەنجامی خۆی بگات لەهەمان کاتیشدا لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیاندا ڕێ ئەکەون و هیچ بەزەییەکیان بە چارەنووسی ئەم گەلە هەژارە خاوەن هەزارەها قوربانیەدا نایەتەوەو لەسەر خوێنی ئەوان مامەڵەی ڕێکەوتنی بەرژەوەندی و لابردنی ناکۆکیەکانی چەند ساڵەیان ئەکەن و تەمێی بەشە کوردەکەی خۆشیانی پێ ئەکەن و بێ ئومێدیان ئەکەن نموونە شۆڕشی (١٥) پانزە ساڵەی ئەیلوول کە ئەنجامەکەی بەدەسکەوتنی مەلەوانی ڕژێمی شای ئێران لەنیوەی شەتول عەرەبداو ئامادەیی سەرۆکی ڕژێمی عێراق بە شای ئێران کە چەندەها ساڵ بوو ململانێ و دوژمنایەتیان لەنێواندا بوو لەم کاتەدا لەسەر خوێن و لاشەی کوردی هەژارو شۆڕشە چەند ساڵیەکەی ڕێکەوتن لەو ڕێکەوتننامە بەناو شومەی جەزائیردا وەکو پیشەی هەمیشەیی لەکۆبوونەوەو کۆنگرە دەوڵەتی و بەناو ئیسلامیەکانیاندا کە دەربڕینی کۆتایی بەرنامەی کۆبوونەوەکانیان بەیەکپارچەیی خاکی عێراق دەرئەبڕی و ئەڕازاندەوە وەکو تەنیا ئەم دەوڵەتانە دڵسۆزی تەواوی گەلی عێراق بن و تەنیا ئەم دەربڕینانەیش بە مەبەستی وەلانانی مافی گەلی کوردی هاونیشتیمانی و هاوئاینی و هاومێژوییان بوو بێت.

پیادەکردنی ڕێکەوتننامەکە هەر لەو سەردەمەدا لەنێوان وەزیرانی دەرەوەی عێراق (سعدون حمادی) و وەزیری دەرەوەی ئێران (عباس خەلعەت) و وەزیری دەرەوەی جەزائیر (عبدالعزیز بوتفلیقە) بەتەواوی ئەنجامدراو خستیانە بەردەم بەرنامەی کارپێکردن لەدوای چەند هەفتەیەکی دوای ئەم ڕێکەوتننامەیەو لەڕۆژی (١٩٧٥/٣/١٥ )ەوە دەستیان پێکرد.

# ڕژێمی بەعس و
# سیاسەتە سیٚ کوچکەییەکەی بەرامبەر بە گەلی کورد

سیاسەتە سێ کوچکەییەکەی ڕژێمی بەعس: بریتی بوون لە پیادەکردنی بەرنامەی: بە عەرەب کردن، بە بەعس کردن، ڕاگواستن ئەمانە لەدوای هەرەسەوە زۆر بەزەقیی بە ئاشکرا ڕژێمی بەعس و دام و دەزگای پێویستی بۆ سەرپەرشتی کردن و هەنگاونانی بەکردار بەئەوپەڕی توانای مادی و هێزی داپڵۆسێنەرەوە بۆ پێك هێنان و مەشقی تایبەتی لەجۆری داڕشتنی نەخشەو پیلانەکانیان بۆ ساز ئەدان پێش هاتنیان یان ناردنیان بۆ پارێزگاو شوێنەکانی کوردستان کە پارێزگا بنکەی سەرەکی و سەرپەرشتیاری لێپرسراوانی دەزگاکانیان بوو لەدەزگای: ئەمن، استخبارات، منظومەی شمالی، منظمەی قیادەی شعبەو فەرعەکان لە قەزاو ناحیەکان و شوێنە حەساس و سنووریەکان، داڕشتنی بەناو جۆرە مەکاتب و بۆچوونە ناو چین و توێژەکانی جەماوەری کورد کە ئەمانە هەر هەمووی لە ئەنجامی (هەرەس)دا هاتە کایەوەو زەمینەیەکی یەکجار لەبارو گونجاوی بۆ ڕەخساندن بۆ ئەنجامدانیان و هیچ جۆرە بەرگریەك لەبەردەمیاندا نەماو بێ ترس دەستیان پێکرد کە ئەوانیش بەم جۆرە بوون و شاری کەرکوك بەتایبەتی بنکەی عەمەلیات و نەخشەکانیان بوو.

١) **سیاسەتی بە عەرەب کردن (تەعریب):**

ئەم سیاسەتە وەکو نەخشەو بەرنامەیەکی ڕەگەز پەرستی عەرەبی و دەسەلاتدارانی لە عێراق کە بەرامبەر بەگەلی کوردی ژێردەستە کە ئەنجامیان ئەدا دیاردەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەسەلاتی عەبدولسەلام عارف کە لەئەنجامی کودەتایەك لە ١٩٦٣/٢/٨ دژی عەبدولکەریم قاسم کردی و هاتە سەر حوکم و ئەم سیاسەتەی لەحوزەیرانی هەمان ساڵدا دەستی پێکرد بەمەبەستی دەرکردن و ڕاونان و دەربەڕاندن و گواستنەوەی وەزیفەی کوردەکان لە هەندێ پارێزگاو شوێنە سەرچاوە نەوتیەکان و تێکەڵاوەکان لەگەڵ عەرەب و دەست بەسەرا گرتنی ماڵ و سامانەکانیان لەپێش هەموو شوێنەکانی تەعریب کراو شاری کەرکوك و دەورو پشتەکەی بەتایبەتی دێکانی نزیك بابە گوڕگوڕ لەنێوان دبس و کەرکوك بەرەو دەشتایی حەویجەو لەملایشەوە بەرەو دووزو هەر لەدێکانی شۆڕاوی ناو بابەگوڕگوڕ هەتا تۆپزاواو (علی الغیر) هەروەها لە سنووری شاری موسڵ و سنجارو شێخان و لەناو شاری خانەقین و دیالەو مەخموور کەندێنا هەولێر لەمانەوە دیاردەی

بەردەوام بوو بەیناوبەین هەتا هەرەس لەبەرئەوەی بەرگری هەبوو بەهۆی هێزی پێشمەرگەوە لەو کاتەدا بەرپەرچی ئەدرایەوە ڕژێمیش زۆر بەتوانا نەبوو نەیئەتوانی ئەوکاتە بەتەواوی ئەنجامی بدات هەندێ جارو لە هەندێ ناوچەدا شکستی بەتەواوی ئەخواردو وەکو ئەوەی لە سنووری دێکانی نێوان شاری خانەقین و ئەوبەری سیروان ڕوویدا کە هێزەکانی ڕژێمیان شکاندەوە لەحەفتاکاندا، بەلام لە شارەکاندا بەهۆی دەرکردن و گواستنەوەی فەرمانبەری بێ دەسەلاتەوە بەبیانووی جۆراو جۆر بەردەوام ئەم سیاسەتە ئەنجام ئەدراو زۆریش بۆ پارێزگاکانی ناوەڕاست و خوارویش دوور ئەخرانەوە لەناو شاری بەغداو مەندەلیش بە هەزارەها ماڵی کوردی فەیلیان بەناوی ئێرانی و بیانووی جۆراو جۆر دەرکرد، بەلام دوای هەرەس و بەتەواوی لەمانگی ١٩٧٥/٦ ئەم دیاردەیە زۆر بەئاشکراو بێ سڵکردنەوە دەستی پێکرد وەکو بەرنامەو نەخشەیەکی پێویستی داڕێژراو لە هەمان کاتدا وەکو ڕق و تۆڵەیەك لە کوردو لەم کاتی هەرەسەشدا هەلێکی باشیان بۆ ڕەخسا بوو لە هەمان کاتدا ڕێکەوتننامەی جەزائیریان کردبووە بەرنامەیەك و بەلێشاو ماڵە کوردو دێهاتی کورد دەرئەکراو ماڵە عەرەب و عەشایەری عەرەب بە هاوکاری مادیەوە ئەهێنرایە شوێنەکانیان لەماڵ و زەوی و زارەکانیان و ڕاستەوخۆیش نفوس و بەڵگەنامەکانیشیان ئەگواستەوە بۆ بنەبڕکردنی ناوی کورد لەو سنوورانەدا ئەوەی هەر زوو دەستی پێکرد لەناو شاری خانەقین و هەموو دێهاتەکانی سەر بەم قەزا دێرینەی کورد هەتا دێکانی سەرتەك و بەمۆو تا دەگاتە سەر ئاوی سیروانی ڕۆژهەلاتی شاری دەربەندیخان و زۆربەی ماڵەکانیان بە زۆری سەربازی بارکردو هێنرانە سنووری شارەزوور لەسەرەتادا بەسەر دێکاندا دابەش ئەکران و لەدواییدا دیاردەی دروستکردنی کۆمەلگا (مجمع) هاتە ناوو بۆ ئەمانە کۆمەلگایەك لەنێوان عەربەتی خواروو دێی باریکە دروست کرا کە چەند هەزار ماڵێك ئەبوو زۆربەی پیاوەکانیشیان لە دائیرەکانی کشتوکاڵ و غابات و کرێکاری ئیدارە مەدەنیەکان دائەمەزراندو لەهەمانکاتدا دێکانی گوندەو پشتەو ناوچەکانی تاوگۆزیان داگرت و کۆمەلگای زەڕایەنیان بۆ دروست کردن لە نزیك دێکانی میلی زەڕایەن، لە نزیك شاری کەرکوکێ قەرەهەنجیریش ناحیەیەکیان بۆ دروست کردن بەناوی (ناحیەی الربیع) بۆ ماڵە عەرەبی فەرمانبەرەکان و دەرکردنی ماڵە کوردەکان بۆ ناو چەمچەماڵ و سلێمانی و هەولێرو سڕینەوەی شوێنەواری کوردەکان لەو سنورانەی دەووروپشتی و لەسەر ڕەسمیاتی شاری کەرکوکن و لە هەمانکاتدا لاواز کردنی ئاماری کورد لەسەر نفوسی پارێزگاو شاری کەرکوکی کوردنشینی خاوەن چەندەها بیرە نەوت لەسنووری پارێزگای هەولێریش بەمەبەستی بە عەرەب کردنی قەزای مەخموور کەندێنا

واقه‌راج و ناحیه‌كانی گوێڕو دیبه‌گه‌و سه‌رگه‌ڕان‌و باقرت به سه‌دەها دێ ته‌عریب كران له‌نێوان كه‌ركوك و دبس و پردێ و شرگات و تكریت و موصلێ چه‌ند كۆمه‌ڵگایه‌كیان دروست كرد له قوشته‌په‌ی خوار هه‌ولێر به‌ناوی قودس‌و قادسیه، حه‌یفاو، یافاو، ١٧ تموز، العروبه، الكرامه، الاندلس، الیرموك، الحطین،... هتد لێ نران‌و شێخ عواص ناوێكیان بۆ هه‌ندێ شوێن هێنا له‌پارێزگای ده‌ۆكیش ده‌ركردن‌و چۆڵكردنی هه‌موو ماڵه كورده‌كانی ئه‌تروش‌و هێنانی ماڵه عه‌ره‌ب بۆ شوێن‌و سه‌رزه‌وی‌و كشتوكاڵه‌كانیان‌و بردنی كورده‌كانیش بۆ گونده‌كانی به‌نینان‌و دوو گوندان و زه‌نگه‌نان له سنووری عه‌شایه‌ری سبعه‌ی ئاكرێ مه‌به‌ست له‌م سیاسه‌ته له‌سنووری بادیناندا كۆنترۆڵكردنی جاده‌ی گشتی: موسڵ. سوریا ـ ئیبراهیم خه‌لیل‌و جاده‌ی گشتی موسڵ. شه‌نگار (سنجار) سوریا بوو، دوورخستنه‌وه‌ی كورد له‌سه‌ر نه‌وتی عین زاله هه‌روه‌ها به‌ناونوسین كردنی كورده یه‌زیدیه‌كان به عه‌ره‌ب كه دانیشتووی سنجارو شێخان‌و به عه‌ره‌ب كردنی: سنجار، زه‌مار، سمێل، فایده ده‌شتی سلێمانی‌و نیشته‌جێ كردنی عه‌شایه‌ره عه‌ره‌بیه‌كانی: جبوری، شمر، ئه‌ل بوجحێش، زوبع فتاغه، شرابین، خواتنه، جواله، الخزه له‌ئوردوگاكانی باستكێ، باتیلێ، پێشا بیرێ، مه‌رینا گرشینێ، مسێرك شاریا له‌ده‌شتی سلێمانی‌و ده‌ووروبه‌ری سمێل‌و فایده به‌م سیاسه‌ته توانیان رێژه‌ی كورد له‌و سنوورانه‌دا كه‌م بكه‌نه‌وه به‌پێی سه‌رژمێری ساڵانی ١٩٦٥ و ١٩٧٧ جگه له چه‌نده‌ها بیانوو فشار خستنه‌سه‌ر ئه‌و كوردانه‌ی كه له موسڵ نیشته‌جێ بوون به‌وه‌ی كه ئه‌بێ به عه‌ره‌ب ناونووسی خۆیان بكه‌ن ئه‌گینا هیچ معامه‌له‌و شتێكیان به‌ناوه‌وه تۆمار ناكرێت. به‌گشتی له‌م ده‌فه‌ره ژماره‌ی (٢٦٠) دێ ته‌عریب كراوه‌و (٧٢٦) دێ ئه‌نفال و ڕاگوێزراوه كه به‌گشتی (١٠٨٦) گونده‌و به‌ته‌واوی ڕێژه‌ی دانیشتوانی كوردیان له‌و سنوورانه‌ی مه‌به‌ستیان بووه به‌هۆی ئه‌م سیاسه‌تی به عه‌ره‌بكردنه گۆڕی‌و ڕێژه‌ی عه‌ره‌بیان به‌ئاره‌زووی خۆیان به‌رزكردوه‌ته‌وه بۆ نموونه له سه‌رژمێری ساڵی ١٩٦٥ ڕێژه‌ی كورد له‌شه‌نگار (سنجار) ٦٧ ٪ بوه‌و عه‌ره‌ب ٢٦٪ تورك ٦٪ به‌ڵام له سه‌رژمێری ساڵی١٩٧٧ ئه‌م ڕێژه‌یه بۆ كورد بووه ١٠ ٪ وه عه‌ره‌ب ٩٠ ٪ و - قه‌زای شێخان ڕێژه‌ی كورد له سه‌رژمێری ساڵی ١٩٦٥ له ٦٩ ٪ بووه عه‌ره‌ب ١٧ ٪ به‌ڵام له سه‌رژمێری ساڵی ١٩٧٧ ئه‌م ڕێژه‌یه بۆ كورد بووه (٨٪ و ) عه‌ره‌ب (٩٢٪).

**٢) سیاسه‌تی به به‌عس كردن (تبعیث):**

ئه‌م سیاسه‌ته به‌مه‌به‌ستی نه‌هێشتن یان لاوازكردنی بیرو بۆچوونی هه‌ستی نه‌ته‌وه‌یی كوردی بوو له‌ناو كورده‌كاندا هه‌ر له‌كه‌س‌و خێزان‌و بنه‌ماڵه‌و عه‌شایه‌رو ڕه‌گه‌زی شێخانی‌و

سیداتەکان ڕژێم کاری جۆراو جۆرو لە هەندێ شوێندا بەتایبەت لەناو شارەکان بەزۆر ئەیسەپاند بەسەریانداو امتیازاتی وەزیفەو بایع و شتی کەی وەکو هاندەرێك ئەبەخشی بە کەسانی دیاریو هەل پەرستەکانیان مەکتەباتی ڕێکخستنی یان لەجۆرە پیشە جیاوازەکان دروست کردبوو بۆ سەرپەرشتی کردنیانو پێکهێنانی بەرنامەی سەندیکاو نەقابەکان جیای ئەکردنەوە بەناوی پیشەیی جوتیاریو کرێکاری و مامۆستایی و... هتد.

ئەم دیاردەیە لەهاتنە سەر دەسەلاتی ڕژێمی بەعسەوە لەدوای (١٩٦٨)ەوە دەرکەوتو هەتا کاتی هەرەس زۆر لاواز بوو ئەو کەسانەی ملکەچیان ئەبوون بەکەسانی خۆفرۆشو سیخوڕ ناوئەبران لای جەماوەر نەفرەتی لێ ئەکرا تەنانەت کچیان لەسێدارەدا لە ١٩٧٤/٥/٤ خوێندکار لەیلا قاسم لەگەڵ جواد هەمەوەندی نەریمان مەستیو ئازادو حسێنو بورهانەو محمد و هیوا، بەڵام لە دوای هەرەس ئەم سیاسەتە زۆر بە فراوانیو بەتوندی بەرنامەکەی پیادەکراو فشارێکی زۆر خرایە سەر فەرمانبەری ئیدارەکانو کرێکارو مامۆستا بەتایبەتی بەئاشکراو بەزۆر مامۆستایان ناچار ئەکرد کە ببێتە بەعسو فۆرمیان پێ پڕئەکردەوەو ئەیانووت مامۆستا گەورەترین ئەوەی پاشەڕۆژ پەروەردە ئەکات چۆن ئەبێت بەعسی نەبێت، هەروەها پەیمانگای وەرگرتنی مامۆستایانو خانەی مامۆستایان ئەوەی بەعسی نەبوایە لەدوای هەرەس بەتایبەتی وەرنەئەگیران لەهەمان کاتدا بۆ معاملەو وەرگرتنی وەکالەتەکانو بائعیەکان بەم بیانووە چەندەها کرێکارو فەرمانبەرو مامۆستا کەوتنە بەردەم سزادانو گرتنو دەرکران دوورخرانەوە بۆ پارێزگاکانی ناوەڕاستو خوارووی عێراق هەرچەندە لەو کاتەدا هەندێ هەوڵ درابوو بۆ بەرگری کردنی ڕژێم لەو سیاسەتانەی بەرامبەر بە گەلی کورد کە ئەویش هەوڵی دیبلۆماسیو مرۆیی بوو لەوانە لە ١٩٧٥/٨/١٨ وەفدێك بەسەرۆکایەتی عصمت شریف وانلی گەیشتە بەغداو چەند شوێنێکی بینی، بەڵام نەیتوانی بگاتە ئەنجام چونکە ڕژێمی عێراق بە ئەوپەڕی لێبڕانەوە هەنگاوی بۆ بەرنامەو پیلانەکان ئەنا بەرامبەر بە پاکتاوکردنی ڕەگەزە سیاسەتە سێ کوچکەیەکەی بە دەرپەڕاندنو ڕاگواستنی کورد لەشوێنی خۆیا.

**٣) ڕاگواستن (ترحیل):**

ئەم سیاسەتە سەختترو ناخۆشترین بەرنامەی ڕژێمی بەعس بوو دەرهەق بە گەلی کورد کە تیایدا هەموو دانیشتوانی گوندەکان بێبەری ئەکران لە خاكو ئاوو سامانو چەندەها ساڵەی باوو باپیری ئەمیش بە تێکدانو تەخت کردنی ماڵو دێکان بە بەرچاوی خۆیانەوە یان تەقاندنەوەی خانوو مزگەوتو خوێندنگاو بینا کۆنکریتو چیمەنتۆکانو هێنانی خێزانەکانیان بۆ شوێنێکی چەندەها کیلۆمەتر دوور لە زەویو زارەکانیانەوە بەم

سیاسەتە هەموو دانیشتوانی گوندنشینەکانی بێئیش و کار ئەکردن و زەویەکانیان و باخ و ڕەزەکانیان ئەسوتاندو لێیان زەوت ئەکردن و ناویان ئەنا ناوچەی حەرام کراو (محرمە) لێیان و ئەیانخستنە کۆمەڵگای (مجمع) کە لەچەند ژوورێك دروست کرابوو لە هەر شوێنێك خۆیان مەبەستیان بوایە تەنانەت ووشك و بێئاو لێرەشدا چەندەها دۆنمی زەوی کشتوکاڵی دێهاتەکانی کەشیان پێ ئەگرت و بەسەربازگەو ڕەبایەو جۆرەها دەزگای مەشق پێکراو چوار دەورو ناوەوەی ئۆردوگاکانیان ئەتەنی و ڕۆژانە بەچەندەها بیانوو تەشقەڵەیان بەخەڵکەکەی ئەکردو کاتێك بەتەواوی ئەیانخستنە مجمعەکانەوە.

ئەم سیاسەتە لەدوای هەرەسەوە ڕاستەوخۆ دەستی پێکردو لە ڕێکەوتننامەکەی جەزائیری (٦/٣/١٩٧٥) دا بەرنامەکەی داڕێژراو بوو هەروەها نامیلکەکەی صەدام حسێن بەناوی سەنگەرێك یان دوو سەنگەر (خندق واحد أم خندقان) بەئاشکرا ڕاگەیەنرا، بەڵام بەپێی کتێبەکەو ڕێکەوتننامەکە ماوەی (١٥ بۆ ٢٥) کم بووە لەدێهاتە سنووریەکانەوە دەست پێبکات و ئەو سنوورە چۆڵ کراوانە بەهێزی هەردوولا بتەنرێت. بەسەربازی داگیرکەری ڕژێمی عێراق و شای ئێران لەساڵی ١٩٧٧ بەتەواوی بەرنامەی ئەم سیاسەتە داڕێژرا سەرەتا بەپێکهێنانی لیژنەکانی تەخمین کردن لە قەزاکاندا بەتایبەت سنووریەکان لە لێپرسراوی ئیداری و نوێنەرەکانی کشتوکاڵی و منەزەمەکانی بەعس بەمەبەستی تەخمین کردنی زەوی و ڕەزو باخ و ماڵاتی ئەو دێهاتانەی لەسنوورەکاندا بەو مەسافەیەی دیاریان کردووە تەقدیرکردنی بە پارە بەناوی ووشەی (تەعوین) هاتە ناو خەڵکەکانیان هان ئەدا بە پارە لەباتی سەروەت و سامانەکانیان لەگەڵ ئەمانەشدا هەڵمەتی ڕاگەیاندن لە لیژنەکانی تایبەتی لێپرسراوانی حزبی ڕژێمی بەعس کە لەو کاتەدا (حسن العامری) زیاتر کاری پێ سپێررا بوو لەگەڵ چەندەها لیژنەی ڕاگەیاندنی ئەمینداریتی گشتی کشتوکاڵی و بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵی پارێزگاکان و زۆر لە کاربەدەستەکانی ناو دەزگا کارتۆنیەکانی ئەنجومەنی تەشریعی و تەنفیزی کاری زۆر بەجدیان بۆ ئەکرد لەلایەك بەسەردانی دێکان و کۆبوونەوەی فراوان پێ کردنیان هەرچەندە وەڵامی زۆر نارەزایی ئەدرانەوە لەدێهاتەکاندا بۆ نموونە لەدێی هاواری کاکەییەکان لەسنووری هەڵەبجەی شەهید پێیان وتبوون ئێمە نرخی یەك بەردی دێکەمان بەهەزارەها ملیۆن نافرۆشین ئەگەر بەدەست و بەڕای خۆمان بێت خۆ ئەگەریش بەزۆر هەرچیمان لێ ئەکەن بیکەن و لە دێیەکی سنووری هەولێر ووتبوویان ئێمە حەز ئەکەین لە دێکەی خۆماندا تێزاب بکەن بەسەرماندا، بەڵام وازمان لێ بێنن با لەجێی باوو باپیرانمان بمرین. لەزۆر دێهاتە سنووریەکاندا ناوچە شاخاوی و کوێستانەکاندا وەڵامی زۆر ڕەقیان دابوونەوە بەو

لیژنانەو پیاوو دەزگاکانی ڕژێمدا، بەڵام هیچ کاری نەکردە سەریان چونکە ئەمە نەخشەو بەرنامەی داڕێـژراویان بـوو لەسـەر کـورد لەگـەڵ پێکهێنـانو ئیـشکردنی ئـەم لیژنانـەی تەخمینو تەعویزو ڕاگەیاندنانەدا دروستکردنی خانوو لەکۆمەڵگا (مجمع)دا دەست پێکرا بێگوێدانـە ئـەو هـەموو نـاڕەزایی و بێـزاری دەربڕینـە کـە هـەتا لیژنـەی هەنـدێ ناوچـەکان گەیـشتنە لای دەزگاکـانی بـاڵای ڕژێمـی بـەعس هـیچ سـوودی نـەبوو، لیژنـەکانیش وەکـو چاوبەستن بوو.

بـەرگری زۆریـش لەدروسـتکردنی (مجمـع) کـراو بـەناوی کۆمـەڵگای زۆرەملـێو گـۆڕی بـاوو بـاپیرو سـڕینەوەی ئاسـەوارو شـوێنی باپیرانمـان ناوئـەبرا لەگـەڵ هەنـدێ بـەرگری پێـشمەرگایەتی (ی. ن.ك)دا کـە ئـەو کاتـە وەکـو شۆڕشـێکی نوێخـواز لـە ١٩٧٦/٦ کـە خاوەنی چەند سەد پێشمەرگەیەك بوو بەجۆری پارتیزانی و بەرەو گەشەکردن ئەڕۆیـشت بـەهۆی ئـەم دیـاردە نارەوایانـەی ڕژێـم دەسـتی پـێکردو بەتایبـەت سیاسـەتی ڕاگواسـتنی دێکـان، بـەڵام لـە بەدبـەختی گـەلی کـوردا پێـشمەرگەکانی ئـەم شۆڕشـە تووشـی کارەساتی هەکاری بوون کە بووە هۆی لەدەست دانی نزیکەی هەزار پێشمەرگەو چەند سەرکردەیەکی بەتواناو لێهاتوو لەوانـە شـەهیدان عـەلی عەسـکەریی و د. خالـد و شـێخ حسـێن بابـە شـێخ ئێزیدی و ڕەئوف بەگ قلیجەیی و حەمە ئەمین خەلیفە قادر کۆزەرەقـەیی و دەیـەها کـادری سیاسـی و عەسـکەری ئـەو کاتـە، ئـەم زیانـە گـەورەیـەی هێـزی پێـشمەرگە کـە پـشتوپەنای گوندنـشینەکان بـوو بـوو بـەهۆکارێکی لـە بـارتر لەبـەردەم ڕژێمـدا کـە بەئاسـانی بەرنامـەی ڕاگواستنەکەی و دروست کردنی خانووی مجمعەکان ئەنجام بدات.

لە ناوەڕاستی مانگەکانی ساڵی ١٩٧٨ بە دواوە بەتەواوی ڕژێمی بەعس کردارەکـانی ڕاگواسـتنی دەسـت پـێ کـردو بەرنامـە پێویـستیەکانی خـستە کـارو ئەنجامـدانی بـەکردار بەهەموو توانایەکیانەوەو زۆر بەپێویست و دڕندانە.

## چۆنێتی ئه‌نجامدانی به‌رنامه‌ی ڕاگواستن

ئه‌ویش به‌ناردنی سوپایه‌كی عه‌سكه‌ری زۆری پیاده‌و چه‌كداری تر به‌هه‌موو جۆره چه‌كێك‌و تانك‌و زری پۆش بۆ كۆنترۆڵكردنی ته‌واوی ئه‌و گوندانه‌ی كه مجه‌مه‌عی بۆ ئاماده كرابوو ئه‌م سوپایه له‌هه‌موو چوارده‌ورو شوێن‌و جاده‌و ڕێگای ئه‌و سنورانه‌وه به‌چه‌نده‌ها یه‌كه‌ی لیوای عه‌سكه‌ری و فه‌وجه‌كان زۆر به‌چڕو پڕی له‌سه‌ریشه‌وه به فڕۆكه‌ی كۆپته‌ر هه‌موو به‌رزایه‌كانیان به‌ره‌بایه دائه‌به‌زاندو له‌گه‌ڵ یه‌كه عه‌سكه‌ریه‌كانیشدا چه‌نده‌ها لیژنه‌ی هه‌نده‌سی‌و ته‌قێنه‌ره‌وه‌ی ماده پێویستیه‌كانی تێكدان و ڕوخێنه‌ری خانوو بۆ ماڵ له (شۆفڵ و مته‌فه‌جراتی ترو ماده‌ی سوتێنه‌ری ڕه‌زو باخیان ئاماده كردبوو، زۆربه‌ی ڕاگواستن بۆ دێهاته سنووریه‌كان وه‌كو نه‌خشه به تێنتی(T.N.T) به‌رنامه‌یه‌كی داڕێژراو و دیاری له‌یه‌ك كات له‌مانگی ١٩٧٨/٨ و له‌چه‌ند ڕۆژێكدا به هه‌ڵمه‌تێكی زۆر خێراو بێ به‌زه‌ییانه ده‌ستیان پێكرد كه له‌چه‌ند ڕۆژێكی زۆر كه‌مدا له‌ماوه‌ی سێ ڕۆژ پێشتر هه‌موو ئه‌و دێهاتانه‌یان ئه‌گرت‌و ئه‌و ڕۆژه‌ی ده‌ستیان به‌هێنانی خه‌ڵكه‌كه بكردایه له‌دوای نیوه شه‌وی ئه‌و ڕۆژه‌وه هه‌ر وه‌حده‌و ئامرو لیژنه‌ی ته‌قێنه‌ره‌وه‌كان چوارده‌وری دێكانیان ئه‌گرت‌و له‌مزگه‌وت یان قوتابخانه‌ی دێ كه له‌به‌یانی زوودا ماوه‌ی چه‌ند سه‌عاتێكیان بۆ خه‌ڵكه‌كه‌و هه‌ر خێزانی ماڵێك دیاری ئه‌كرد كه له‌و ماوه‌یه‌دا هه‌رچیان هه‌یه بیگه‌یه‌ننه ئه‌و جێگه‌یه به‌زۆری له‌خوارووی دێكانیانه‌وه شوێنه‌كانیان دیاری ئه‌كرد خه‌ڵكی هه‌ژاریش له‌ماوه‌ی ئه‌و چه‌ند سه‌عاته‌دا ناتوانن هه‌موو ئه‌و سه‌روه‌ت‌و سامان‌و كه‌ل‌و په‌له‌ی كه چه‌نده‌ها ساڵه‌ی باوو باپیرانیان خستویانه‌ته سه‌ریه‌ك به‌و په‌له په‌له‌و شپرزه‌ییه‌و ترسه بیبه‌ن و هه‌ربۆیشیان نه‌ئه‌بران بۆیه به‌ناچاری و به ئه‌وپه‌ڕی ناڕه‌زایی‌و له‌ناو كاره‌ساتی بێچاره‌نووس و نادیاری ژیاندا هه‌ندێ له‌و كه‌ل‌و په‌لانه‌ی كه زیاتر لایان مه‌به‌ست بوو له‌و ماوه‌یه‌داو به ئه‌وپه‌ڕی شپرزه‌یی‌و ترس‌و له‌رزی خۆ به‌ده‌ست دانی دوژمنی چه‌ند ساڵه‌وه به‌خۆیان و ئه‌و كه‌ل و په‌له كه‌مه‌وه ئاماده ئه‌كرد له دوای ئه‌وه‌ی هه‌ر ماڵه به‌كوڕێكی یان كه‌سێكی دا هه‌رچی ئاژه‌ڵیان هه‌بووه له مه‌ڕو بزن و ڕه‌شه ولاخ به‌ڕێ كه‌دا ئه‌یان دانه به‌ر له‌گه‌ڵ هه‌ڵگرتنی هه‌ندێ نان و چاو به‌پێ به‌ره‌و ئه‌و مجه‌مه‌عه‌ی بۆیان دیاری كراوه كه چه‌ند ڕۆژ له‌ناو ئه‌و هه‌موو وه‌زعه ناله‌باره‌داو به‌و گه‌رمایه هه‌تا ئه‌گه‌یشتنه جێ له هه‌ندێ شوێندا ئه‌یان ئه‌هێشت ئه‌و باڵنده‌و ئاژه‌ڵ و ولاخانه‌یان ببه‌ن و زۆریان له‌و ناوه‌دا به‌ره‌ڵلا ئه‌كران و بێ خاوه‌ن‌و بێ‌ناز ئه‌كه‌وتن له‌وانه به‌زۆری گوێ درێژ، ماین، ئه‌سپ‌و به‌گشتی

سەگ و پشیلەو کەروێشك و باڵندە لە قەل و مریشك و قازو مراوی و هەنگەکان لە بەرچاوی خاوەنەکانیان لەناو ماڵەکاندا ئەسوتان یان پەرتەوازەی ناو دوکەڵەکە ئەبوون.

## نموونەی ڕاگواستنی ناوچەی شلێری پێنجوێن

هەندێ لەجوتیارەکان لە کاتی کۆکردنەوەیاندا بۆ بارکردن و ڕاگواستنیان هەوڵیان ئەدا کە بچن هەندێ میوە لە ڕەزو باخەکەیان بکەنەوە یەکسەر ئەکەوتنە لێدانیان و پێیان ئەوتن (ئەوە حەرامە ماڵی ئێوە نیە ماڵی دەوڵەتە) جوتیارەکان زۆریان خاوەنی هەنگ بوون و هەنگی چاکی چەند ساڵە بەتایبەت ئەم دێهاتە سنووریانە هەموو کوێستان و دارستان و نزارو خاوەنی چەندەها جۆری گژوگیاو گوڵی هەمەجۆری ڕەنگاو ڕەنگی بۆن خۆش و کانیاوی ساردی سازگار بوون، کاتێك هەنگدانەکانیان تێك ئەدا سەربازەکان ئەچوون شانە هەنگوینەکانیان ئەدایە بەر ئاوی کانیاو و جۆگەکان هەتا هەنگەکە بڕوات یان ئاوبیبات و هەنگوینەکە بخۆن یان ببەن، بۆ نموونە: دێکانی سنووری ناوچەی شلێری پێنجوێن هەر لە شاێن و میشیاو و لارەدەرو وێنەو دارۆخان و نەرمەلاسی و سپیکانی و شێرەو سریسان.

لەڕۆژی ۱۹۷۸/۸/۲۰ بەو کردارە نامرۆڤانەو دڕاندانەی سەرەوە باریان کردن کە ۲۷ ی ڕەمەزانی ئەو ساڵە بوو ئامر لیواکە عقید قیس ناوێك بوو لە بەرەبەیانی ڕۆژی ۱۹۷۸/۸/۱۹ ئەچووە دێکان و ناوی خەڵکی هەردێیەکی بە لیستی خۆی پێبوو ئەیخوێندەوەو ئاگاداری ئەکردن کە ڕۆژی دوایی لەماوەی چەند سەعاتێکدا بەخۆیان و کەلوپەلەکانیان لەبەردەم قوتابخانەکەیان ئامادەبن کە لەبەردەم دێکانیاندا بوون زۆربەی دێکان پشتیان بە شاخەوە بوو، هەر کە خەڵکی دێکە کۆئەبوونەوە لە شوێنی دیاریکراو هەر ئازا دەستە تایبەتیەکانی عەسکەری ماڵەکانیان ئەنفامرێژ ئەکردو بە یەکجارو لەیەك کاتدا لەبەرچاوی خێزان و خەڵکی دێکە بە یەك دەنگ ئەتەقاندەوە، ئەم سنوورە نزیکەی زیاتر لەسەد(۱۰۰) سەد دێی نیشتەجێبووی مێژوویی دێرینی تیابوو ئەو کۆمەڵگا (مجمع)ە زۆرە ملێیەی بۆیان ئامادەکردبوون مجمعی شانەدەری بوو کە نزیکەی چوار هەزار ماڵێکی دوو ژووری لەنێوان شارۆچکەی سەیدسادق و دێی شانەدەری لە شوێنێکی ووشك و بێ ئاوی بەناوبانگی گەرمیدا کە ناوئەبرا بە (ڕەقەی سورەجۆ) ئەم ماڵە کوێستانی و ژیانی چەندەها ساڵەی ناو سنووری سازگاری ئاوی ساردەیان گەیاندە ئەم شوێنە گەرمەو لە هاویندا جگە لەوەی کە لەڕێگا ماوەی یەك هەفتە زیاتر ئەم هەموو ژن و منالێ و پیرە لەناو ئیڤاو زیلی عەسکەری دا لە کۆتایی چەند ڕۆژەی مانگی ڕەمەزان و

جەژنەکاندا لەناو ئەو هەموو دوکەڵ و تەم و مژەو تۆزو خۆڵ و ڕێگای هەڵدێردا بێ پشوودان بەرەو مجمعی شانەدەری شارەزوور بردن و بۆ ژیانێکی پێچەوانەی خۆیان و بێ هیچ هۆیەکی ژیان لەئاوو کارەباو نەخۆشخانە، هەربۆیە لە ساڵی یەکەمدا چەندەها منداڵی ساواو پیر تووشی نەخۆشی سك چوون بوون و ئەمردن جگە لەوەی تووشی چەندەها کارەساتی ناخۆش بوون لەڕێگاداو لەناو ئیڤاو زیلەکاندا لە دیاردەی منداڵبوونی ژن و بێ پشوودانی و ماندووبونێکی یەکجار سەخت و هەتا لە دێی (دەرەورگان) جوتیارێکی (٥٠) پەنجا ساڵی بەناوی حەمە ڕەحیم کوژرا هەر لەو ساڵەداو لە ١٩٧٨/٩/٢٩ دێکانی بناری سورێن بەڕوی شارەزووریان داگرت کە دێکانی: چنارە، کانێسکان، نەوێ، وەڵەسمت، بەردەبەل، وشقوبە، توتاقاچ، خڕنوك و سیمامیوە و هەموو ئەو دێیانەی کەوتبوونە ناو شاخی سورێن و هێنرانە ناو مجمعی شانەدەریەوە جگە لەم مجمعەی شانەدەری چەند مجمعێکی تر دروست کرا بۆ دێکانی شلێری پێنجوێن وەکو قەزاکە دێکانی بە زۆری نەماو یەکێك بوو لەشارە خاوەن هەستی نەتەوایەتی و شۆڕشگێڕی و نەترسی لەو کاتەدا یەکەم دیاردەی نارەزایی کە پەردەی ترسی دڕی لەبەردەم ڕژێمی بەعسدا لەو کاتەدا کە زۆر گرنگ بوو لە سنووری ئەم شارەدا دەستی پێکرد لە ١٩٨٠/٧/١٨ و خۆ دەرخستنی نارەزایی جەماوەری ڕوویداو تیایدا شوانێکی هەژار بەناوی دەروێش مەجید عبداللە بەدەستی سەربازەکان شەهیدکرا هەر لەتۆڵەی ئەم شەهیدەو بۆ چاو شکاندنی دەزگاو کاربەدەستانی ڕژێم لەو کاتە حەساسەدا دانیشتوانی شاری پێنجوێن بەهاوکاری چەند دەستەیەکی پێشمەرگەی خۆیان و هەموو جەماوەرەکە لە هەموو چین و توێژەکانیەوە ماوەی سێ شەوو ڕۆژ کۆنترۆڵی شارەکەیان کردو بە دەها پیاوی ڕژێمیان بەسزای گەل و شۆڕش گەیاندو تۆڵەی دێهاتە وێرانکراوەکانیان لێ سەندن و خۆدەرخستنەکەیش زۆر بوێرانەو منەزەم سەرپەرشتی ئەکراو زۆر بەخۆڕاگری و یەکگرتووی هەتا ملیان بە ڕژێم شۆڕکردو ئەو کەسانەی گرتبوویان پێیان ئازاد کردن کە ڕژێم بەهێزێکی زۆرەوە بەرەو ڕوویان بوونەوە تەنانەت ١٦ کۆپتەر لەو ٣ ڕۆژەدا هێزی سەربازی بە دەوروپشتی شاری پێنجوێندا دابەزاند لەگەڵ ئەمانەشدا خۆدەرخستن و چالاکیەکانی جەماوەرو هێزی پێشمەرگە زۆر سەرکەوتوانە بوو پێشمەرگەکانیش لەباوەشی جەماوەرەکەو بەهاوکاریان توانیان دەرباز بن هەرچەند شاری پێنجوێن و ناوچەکەی بەجەماوەرێکی شۆڕشگێڕ دەرکەوتبوون هەر لە یەکەم ڕۆژی دەرکەوتنی پیاوەکانی بەعسەوە لەڕۆژانی ١٩٧٥/٤/٧ و مناسەبەکانیاندا هەر زوو ئەم جەماوەرەی پێنجوێن بەڕوویاندا ئەتەقینەوە بێ سڵ کردنەوە.

* لەمانگی ١٩٨٢/١٠ دێکانی بەرکێوی شارباژێڕدا گیران لەناو شەڕی عێراق ـ ئێراندا کە بریتی بوون لەدێکانی: ڕەزڵە، پاڕەزان، زڵزڵە، گوێزە ڕەش، دۆڵپەموو، حاجی مامەند، قەڵاتێ، سەرخوار، سەردەرەو عارەبە، دەرەمیانە.

## ڕاگواستنی ناوچەی هەورامان:

ڕژێمی عێراقی زۆر بەچاوی تۆڵەوە سەیری ئەم ناوچەیەی ئەکرد لەبەرئەوە هەمیشە لە هەوڵەکاندا مەفرەزەی عەسکەری ئەناردە سەر سنورەکان بۆ نموونە لە مێژووی ١٩٧٩/٦/٢٦ هێرشێکی ڕژێم بەرەو دێی کۆلێتان کرا لەو هێرشەدا چەند گەنجێکی هەڵاتوو پێشمەرگەبوون گیران لەوانە: محمودی مام حسێن سەید سادقی، بەکر عبدالقادر وسێن سەید سادقی و ئەکرەم حەمە نەجمی بەردە بەلێ و عارف مارف شاوەیس نەوێیی ئەمانە هەموویان گەنجی ڕۆشنبیرو خاوەن شەهادە بوون لەگەڵ ئەوەشدا لەبەرئەوەی لەم شوێنە بەناو محەڕەمەدا گیران گەیاندیانە ژووری لەسێدارەدان لە (موسڵ) و سەریان تاشراو ئامادەکران بۆ خنکاندن دوایی بە لێبوردنێکی گشتی بەهۆی فشاری خۆدەرخستنی گشتی خوێندکارانی کوردستانەوە ئازادکران ڕژێم بەناچاری مەبەست لەم هێرشەشدا بۆ دێی کۆلێتان زیاتر لە هەموو دێکان لەخزمەتی پێشمەرگەدا بوون بەتایبەت پیاوی دیارو خاوەن بیری پێشکەوتووخواز کە چەندەها کەسانی چاك بوون کە هەستێکی پاکی کوردایەتی هەبوو لەو کاتەدا، لەهەمان ئەو کاتەدا دێهاتەکانی سنوری هەورامانیان هەر بەهەمان شێوەو بەرنامەو نەخشە وێرانکاریەکەیان داگرت بۆ مجمعی لای دێی عەنەبی هەڵەبجەو ناحیەی سیروان و زەمەقی خوار شاری هەڵەبجە، ناوچەی هەورامان بەگشتی ناوچەیەکی شاخاوی سەختە بەڕاستی دانیشتوانی کە بە لەهجەیەکی هەورامی ڕەسەنی کوردی قسە ئەکەن و بەتەواوی لەسەر شان و ئەستۆی خۆیان ئەژین و زۆربەی پێداویستیەکانیان لەکەل و پەل و پۆشاك خۆیان دروستی ئەکەن هەر لەپیشەی باوو باپیرانیەوە شاڵی ڕەسەنی ڕانك و چۆغەو پشتێن و کولەباڵ و کلاشی پەڕۆ دروست کردن و چنینی بە دەزوو لەهەموو ماڵەکاندا خەریکن جگە لەوەی لە ڕەزو باغێکی زۆری میوە لە هەنارو توو دارگوێزی زۆرو هەمەجۆر میوەیان هەیە خەڵکی هەورامان لەگەڵ ئەوەدا حەزیان لەبواری ڕۆشنبیری زۆرەو بەرنامەیەکی کۆمەڵایەتی پێشکەوتوویان هەیەو پەیوەندی خێزانیان لەگەڵ یەکتر زۆر پتەوەو لە بوارە کۆمەڵایەتی و پێشکەوتوخوازەکانیان ئەوەیە کە ژن بە ژن و گەورە بە بچوك ناکەن و شیربایی وەرناگرن لە

---

چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز ( مەجید حاجی شەریف) لارەدەری خەڵکی سنورەکە.

کچ بە شودانداو دێکانیان نزیکەی (٣٠) دێیەك ئەبوون هەر هەموویان ماڵوێران و ڕەنج بێوەر کردو ڕەزەکانیان بەخەسار کردن لەشوێنی باپیرە گەورەی چەند سەد ساڵەی پێش زاین بە ئەوپەڕی دڵ شکاویەوە هێنانیانە خوارەوە بۆ مجەمەعەکانی سنوری شارەزوور لە مجەمەعی عەنەبو سیروانو ناو هەڵەبجەی شەهیدو پەرتەوازەی شارەکان بەگشتی لەدێو شارۆچکە دیاریەکانیان: تەوێڵەو بیارەو بەڵخەو گوڵپ و سەرگەت و سۆسەکان.. هەتا زەردەهاڵ دوایی.

## ڕاگواستنی ناوچەی شەمێران:

هەروەها دێکانی سنووری شەمێرانو سازانو هاوارو دەڵەمەڕی پشت هەڵەبجە هەتا دێی عەبابەیلێی سەروی شاری هەڵەبجەو دێی عەنەبی چەند کیلۆمەترێ لای چەپی هەڵەبجەو لەولاشەوە هەردوو شارۆچکەی خورماڵو سیروان هەریەکەیان بەتەنیشتیانەوە مجەمەعێکی چەند هەزار ماڵی دروست کرا تەنانەت مجەمەعی سیروان خەڵکانی سنووری شاربازێڕو نامپارێزیان بۆ هێنا لەوانە دێی (ئاروزەر)، جگە لەم شوێنانە لەسنورەکانی نێوان سلێمانیو چەمچەماڵ مجەمەعەکانی ئەڵلایی و تەینال و بازیان و تەکیەی دەربەند دروست بوو بۆ دێکانی سنووری بازیان و هەندێ لە دێکانی پشدەرو قەڵادزەو شاربازێڕی لای ماوەتو شینکایەتی هەروەها دروستکردنی مجەمەعەکانی قەلاچوڵانو سورە قەڵاتو کارێزەو کەناروێ بۆ دێهاتەکانی کەی شاربازێڕو ئەو سنورانەی خۆیان، بەهەمان بەرنامە لەسنووری هەموو پارێزگاکانی کوردستان لەپارێزگای هەولێرو دهۆك و لەهەندێ شوێن و ناوچەی تردا و لەسەرەتا بۆ ڕاگواستنی دێهاتە سنووریەکانی هەموو کوردستان بەسنورەکانی خانەقین و هەڵەبجەو هەورامانو پێنجوێن شلێرو شاربازێڕو چۆمانو گەلاڵەو هەتا سنورەکانی دێهاتەکانی دهۆك بەتایبەتیش دێهاتەکانی سنوری عێراق ئێران لەسەر ڕێکەوتننامەی شومی جەزائیر لە ١٩٧٥/٣/٦ دا.

هەرچەندە ڕژێمی بەعسی صدام هەر لەدوای هەرەسو زۆر بە پەلە لەهەوڵی بەئەنجام گەیاندنی ئەم سیاسەتە نەگریسە سێ کوچکەیەدا بوو بەرامبەر بە گەلی کورد بەهەموو توانایەکی سامانی عەسکەرییو هەموو جۆرە دەزگا داپڵۆسێنەرەکانیو ئیمکانیەتە مادیەکانی، بەڵام وەکو مێژوویەکی ویژدانانە هەر زوو لە بەرامبەر هەڵسانەوەی هەرەسو بەهانا هاتنەوەی جەماوەری گەلی کوردماندا سەرکردە بەتواناو دڵسۆزەکانی کورد جاڕی

---

چاوپێکەوتن لەگەڵ کادرەکانی سنوری هەورامان، ئەیوب کوێخا رۆستەم، جەبار علی شاوەیس ئەوێیی بناری سورێن.

ڕێکخستنێکی نوێیان دا بەگوێی هەموو جەماوەری گەلی کورددا لە ١٩٧٥/٦/١ کە لەمێژوودا بە دەستەی دامەزرێنەرانی (ی. ن. ك) ناویان دەرچوو کە ئەوانیش ئەم بەڕێزانە بوون: (مام جەلال تاڵەبانی، د. فوئاد مەعسوم، کاك نەوشیروان مستەفا، د. کەمال فوئاد، عمر شێخ موس، عبدالرزاق فەیلی، عادل مراد).

وە لە ١٩٧٥/٩/١١ بەیاننامەی دەستەی دامەزراندنیان دەرکرد، و لە ١٩٧٦/٦/١ بەتەواوی جاڕی شۆڕشی نوێ خوازیاندا زۆر بەئاشکرا وەکو مژدەیەك بە گوێی هەموو گەلی کورداو وەکو ترس و تۆقاندنێکیش بەرامبەر بەهەموو دەسەڵاتە داگیرکەرەکانی ڕژێمی صەدامو کەسە جاسوس وخۆفرۆش‌و ئەڵقە لەگوێکانیان کە وایان دانابوو جارێکی تر شۆڕشی کورد نابێتەوە. بەخەیاڵی خۆیان‌و ئەقڵی ئاغاکانیان.*

**تێبینی:**

**تەنیا لەسنوری پارێزگای سلێمانیدا (١٦٨٨)دێ و (٢٣) ناحیەو (١٠) قەزا هەتا ساڵی (١٩٧٥)بووە کە هەموو دێکان و زۆربەی ناحیەکان و قەزاکان کاول و وێران کران بەدەستی ڕژێمی بەعسی صەدام.**

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕزگار شەمێرانی و چەند کەسێکی خەڵکی ناوچەی شەمێران.

## جاڕدانی شۆڕشی (ی. ن. ك) وه‌كو شۆڕشی نوێخواز

ساڵی ١٩٧٦ وه‌رچه‌رخانێكی مێژوویی زۆر گه‌وره‌و سه‌خت بوو له‌ ژیانس باری بزووتنه‌وه‌ی ڕزگاریخوازی گه‌لی كوردماندا، به‌تایبه‌ت له‌ماوه‌یه‌كی كه‌می یه‌ك ساڵ به‌سه‌ر ئه‌و كۆسته‌ زله‌ی هه‌ره‌سی شۆڕشی ئه‌یلوول هه‌رزوو بوو به‌هۆی سازدانه‌وه‌و دروستكردنه‌وه‌ی به‌رنامه‌ی شۆڕش و كوردایه‌تی و له‌بنهێنانی و داڕوخانی دێوه‌زمه‌ی وره‌ی هه‌ره‌س و هێنانه‌وه‌ی به‌ ئاقارێكی پڕ له‌ هیمه‌ت و ئاماده‌یی بۆ خۆڕاگری و پته‌وبونه‌وه‌ی وره‌ی پۆڵایین و توانای بێسنوور به‌رامبه‌ر به‌ پوچه‌ڵ كردنه‌وه‌ی پیلانه‌كانی ڕژێمی داگیركه‌ر كه‌ له‌و كاته‌دا زۆر به‌ په‌له‌و به‌ هه‌موو توانایه‌ك هه‌وڵی به‌ئه‌نجام گه‌یاندنی ئه‌دا به‌تایبه‌ت به‌عه‌ره‌ب كردن و ڕاگواستنی گه‌لی كوردو پاكتاوكردنی ڕه‌گه‌زی له‌ هه‌موو نیشتمانی كوردستاندا.

ساڵی ١٩٧٦ له‌ساته‌وه‌ختێكدا بوو به‌ گۆڕه‌پانی خه‌بات و تێكۆشان له‌ناو هه‌موو چین و توێژه‌كانی گه‌لی كوردا، ململانێ و گیانی خۆبه‌خشین له‌ڕیزه‌كانی ده‌سته‌ بچووكه‌كانی پێشمه‌رگایه‌تیه‌ سه‌ره‌تاییه‌كان و له‌ناو خوێندنگا پڕ له‌ئه‌زموونه‌كانی ڕێكخستن كه‌ به‌زوویی و زۆر دانایانه‌و به‌نهێنی زۆربه‌ی شارو شارۆچكه‌و دێهاته‌كانی كوردستانی گرته‌وه‌ به‌ شاری به‌غدادیشه‌وه‌ كه‌ پایته‌ختی ڕژێمی به‌عس بوو، له‌ هه‌مووی سه‌یرتر ئه‌وه‌بوو كه‌ سه‌ركردایه‌تی به‌ناو ئه‌نجومه‌نی ڕژێمی عێراق له‌مێژووی ١٩٧٥/٤/٧ له‌یادی چه‌ند ساڵه‌ی دروست بوونی حزبی به‌عسدا به‌ئاشكراو به‌هه‌موو بۆچوونێكیه‌وه‌ له‌هه‌موو كه‌ناڵه‌كانی ڕاگه‌یاندنه‌وه‌ بڵاوی كرده‌وه‌ كه‌ جارێكی تر كورد به‌ هیچ جۆرێك ناتوانن ده‌ست بده‌نه‌وه‌ چه‌ك به‌م بۆچوونه‌ی ئه‌و ڕژێمه‌ ده‌ستی له‌ هیچ كوردێك نه‌ئه‌پاراست به‌ جۆره‌ها كوشتن و بڕین و ئه‌شكه‌نجه‌و تۆقاندن و له‌ سێداره‌دان، ته‌نانه‌ت له‌ ١٩٧٤/٥/١٢ كچێكی خوێندكاری زانكۆی به‌غداد به‌ناوی له‌یلا قاسم و جواد ئازادو حه‌سه‌ن و نه‌ریمان فوئاد مه‌ستی له‌ ئه‌بو غرێب و له‌ڕۆژی ١٩٧٤/٤/٢٩ ده‌سگیركران و زۆر هه‌ڵوێستی مه‌ردانه‌یان بوو. سه‌ره‌تای ده‌ست پێكردنه‌وه‌ی شۆڕشی نوێخواز له‌ساڵی ١٩٧٦/٦وه‌ له‌ قۆناغی شۆڕشی چه‌كداری پێشمه‌رگایه‌تیدا به‌ده‌سته‌و مه‌فره‌زه‌ سه‌ره‌تاییه‌كان به‌ قۆناغی پارتیزانی ئه‌ژمێردرێت و سه‌خترین قۆناغی خه‌باتی شۆڕشی چه‌كداری بووه‌ له‌ مێژووی بزووتنه‌وه‌ی ڕزگاریخوازی گه‌لی كوردا كه‌ به‌و چه‌ند ده‌سته‌ پێشمه‌رگه‌یه‌و بێ توانایی ده‌رامه‌تی و بێ شوێن و بێ پشت و په‌نا له‌ ئاسمان و زه‌ویداو بێ چه‌ك و ته‌قه‌مه‌نی به‌ دروشمی شۆڕشی درێژ خایه‌ن و خۆڕاگری له‌ئه‌ستۆی خۆ له‌به‌رامبه‌ریشدا ڕژێمی به‌عسی صه‌دام به‌و هه‌موو توانایه‌ مرۆیی و عه‌سكه‌ری و چه‌ك و ته‌قه‌مه‌نی و داراییه‌وه‌،

تەنانەت هەموو جۆرەکانی فڕۆکەو زۆرترین عەسکەری بە بنکەو بارەگاکانی و بەجۆری ڕەبایە لەهەموو شوێنەکانی کوردستاندا بوو، لەدەسەلاتی هەر فەرماندەیەکی عەسکەری لەهەر ناوچەیەکدا چەندەها فڕۆکەی جۆراوجۆر بەتایبەت کۆپتەری جەنگی گواستنەوەی سەربازی بەکاربێنێت، لە ساڵەکانی (١٩٧٩،١٩٧٨،١٩٧٧،١٩٧٦) ڕژێم هەمیشە کرداری کێوماڵی (عملية تمشيط) ی ئەنجام ئەدا کە بریتی بوو لە بەکارهێنانی زۆرترین هێز بە فڕۆکەیشەوە لە یەک ساتەوەختدا بەدەوروبەری سنورێکیان ئەگرت بەچەند دێو ناوچەیەکەوە هەموو شوێنەکانیان بە ئەوپەڕی نایاسایی و ترساندن ئەپشکنی و گەنج و پیاوەکانیان لە دەرەوەی ماڵەکاندا ڕیز ئەکردن و کرداری نامرۆڤانەوە ڕەفتاری ناشیرینیان بەکارئەهێنا بەرامبەر بەخەڵکەکەو بەجۆرەها ناوو بیانوەوە گەنج و کەسانی ڕۆشنبیرو دیاریان ئەگرت یان ئەکوشتن بە بەرچاوی کەس و کاریانەوە.

## دەرچوونی یەکەم دەستەی پێشمەرگە :

دوای ئەم هەموو کردارە ناشیرینانەی ڕژێمی بەعس پرسیارو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ ئەکردن و لەولاشەوە دەستە دەستە عەسکەری بەر ئەبووە ناو ماڵ و ژن و منداڵ تەنانەت هەندێ جار کارەساتی ناخۆش کوشتن و بریندداری لێ ئەکەوتەوە لەگیانی هاوولاتیاندا بە تێکدەر (مخرب) ئەیاننووسی، تەنانەت لەخەستەخانەکانیشدا بەنهێنی چارەسەر ئەکراو ئەگەر کوژراویش بوایە ئەبوایە بەترسەوە پرسەی بۆ دانرایە سەیر لەوەشدا بوو، پارەی گوللەکان (فیشەکە)کانیشیان کە ٣٠ سی دینار بوو لە خاوەنەکەی ئەسەند بۆیە لەدەست پێکردنەوەی شۆڕش و چوونە دەرەوەی ڕێکخستن و کەسایەتیە دیاریەکان یەکەم دەستەی پێشمەرگە لە سنورەکانی هەڵەبجەی شەهیدی شارەزوورو هەورامانەوە دەستی پێکرد، کە بریتی بوون لەم کەسانەو بەم جۆرە لە شەوی ٢٦-١٩٧٦/٦/٢٧ کاتژمێر ١٢ی شەو بەناونیشانێك کە نهێنی تایبەتی خۆیان بوو، لەو کاتەدا لەسنووری هەڵەبجەو شارەزور ناوەکانیش بریتی بوون:-

١- کاك شێخ عەلی (محمود عبدالرحمن) خولە کەشکۆڵ بەرپرسیاری سیاسی.

٢- عەلی احمد ناسراو بە عەلی شیعە لە شەڕی پشتیوانی شەهیدبوو لەکوردستانی ڕۆژهەلات.

---

* ئەم زانیاریەم کاتی خۆی لەشەهیدی سەرکردە مامۆستا جەمال تایەر وەرگرتوە.

٣- شـەوکەتی حـاجی موشـیر محمـد کـە لـەناو مەیـدانی شۆڕشـدا بـوو بـەکادرو فەرماندەیـەکی بـەتواناو زۆر بەداخـەوە لەشـەوی ٢٠٠٢/٢/٨ بەدەسـتی تیرۆرسـتانی دوژمنانی کورد شەهیدکرا.

٤- حامدی حاجی خالید محمد.

٥- محمـد حـاجی محمـود گوڵەخانـە کـە ئێسـتا سـکرتێری حزبـی سۆشیالـستی دیموکراتی کوردستانە.

٦- حەمە سەعید حەمە ئەمین ناسراو بە د. ڕەمزا لە ١٩٧٨/٩/١٦ لە شەڕی براکوژیدا شەهید کرا.

٧- تۆفیق ڕەحیم عبدالله بە تۆفیقی ڕەعنا ناسرا بوو.

دوای چـەند ڕۆژێـك کاکـە حەمـەی حـاجی صـابر قاینەجـەیی پەیوەنـدی پێـوەکردن‌و دوای ئەمانیش شەهید محمود گەرمیانی‌و شەهید ڕەوفی خەلیفە سەعید قەدەفەری ئەمانە کە زۆربەیان لەوکاتەدا خاوەنی سامان‌و زەوی‌و زاری زۆریش بوون، لـە ڕۆژی ١٩٧٦/٨/٨ شەهیدان عەلی عەسکەریی‌و د. خالدو سعدی گچکەو عەلی والی پەیوەندیان کـردو هـەروەها لە شەوی ٢-١٩٧٦/٩/٣ شەهید شەماڵی باخ و شەهید سیروان تاڵەبانی‌و شەهید ئەنوەری مەجیـد سـوڵتان‌و کاکـە حەمـە سـەعید قەڵـەو چـوونە دەرەوە، لـە سـنووری بادینـانیش بـە پەیوەنـدی کـردن‌و دەسـت بـە کـاربوونی مەردانـەی شۆڕشـەوە دەسـتەیەك بەسەرپەرشـتی ئیـبراهیم عـزو چـوونە ناوچـەکەو ڕۆڵێکـی پـڕ لـە ئومێـدیان بینـی بەرامبـەر بـە ترسـاندن‌و پوچەڵ کردنەوەی بەرنامەو پیلانەکانی ڕژێم، بەڵام زۆر بەداخەوە لە ١٩٧٦/١٠/١٩ بەناوی هاوکـاری پێـشمەرگایەتیەوە دەسـگیرکران و لـەناوبران دوای ئـەمانیش دەسـتەیەك بەسەرپەرشتی عزت سنجاری بەهەمان شێوەو ملازم حەسەن خۆشناو کە هاوکاری مادی‌و چەکیشیان پـێ‌بوو لـە دۆشـکەو چـەکی تـر کـە زۆر بەداخـەوە ڕێیـان پـێ‌گیراو شـەهیدیان کـردن، لەبەرژەوەندی دوژمنـانی گەلەکەمانداو لەوکاتـە ناسکەداو پڕ لـە مەترسـیەی گـەلی کوردا کـە لەبەردەم کەڵبـەی تیـژو لـەباری گونجـاوی بەرنامـەی ڕاگواسـتنی حزبـی بەعـسدا بوون.

بەهـەمان شـێوە لـە زۆربـەی شـوێنەکانی کوردسـتانەوە زۆر لـە کـادرە کـۆن‌و تـازە پێگەیـشتوو لەکەسـانی بـەتوانا دەسـتیان کـرد بەچـوونە دەرەوەو پەیوەنـدی کـردن بـە شۆڕشەوە. پێکهێنـانی دەسـتەی بچووکی چەکدارو زۆرترینیـان لـەناو شـاری سلێمانیەوە بـەڕێ ئـەکران، بـەزۆری شـاری سـلێمانی بـوو بـووە سەرچـاوەیەکی پەیوەنـدی کردنـەوەو گرتنـەوەی کـادرە سیاسـی‌و عەسـکەریەکان تەنانـەت ئەوانـەی لـەملاو لاو شارۆچـکەکانی

کەبوون هاتبوونە ناو شاری سلێمانی، لەوانە کاک مەلا بەختیار کە لەو کاتەدا ڕۆڵی چاك و بەرچاوی بینی لە دەرەوەو ناوەوەی ڕێکخستنەکان.

لەو کادرە عەسکەری‌و سیاسیانەی لەوکاتەو لە سەرەتادا ڕاستەوخۆ چوونە دەرەوە تەنانەت هەندێکیان دوورخرابوونەوە بۆ شارەکانی خوارووی عێراق لەوانە: بەڕێز کاك مولازم عومەرو کاك سالار عەزیزو کاك شۆڕش اسماعیل، هەروەها لەو کادرانە کاك شێروان شێروەندی لە سنووری خانەقین‌و کاك حەمە هاواری‌و مام هادی‌و مام هەڵمەت لەناوچەی هەورامان، چەندەها کەسانی تر لەوانە شەهید أحمد گریانەیی، چەند کادرێك لە سنووری ناوارەی ئێرانەوە خۆیان گەیاندە دەستەکانی پێشمەرگە تەنانەت بۆ سوریاو لوبنان بەشداری مەشقیان کرد. لەوانە کاك عادل شکورو دلێر جاف گەرمیانی‌و کاك سامان گەرمیانی کاك قادر خەبات لەبناری قەندیل دوای جاڕدانی شۆڕشی نوێخوازی لە (١٩٧٦/١١/٢٥) پەڕینەوەی وەجبەی دووەمی پێشمەرگە لەسوریاوە بۆ کوردستان بەسەرپەرشتی هەڤاڵی بەڕێز کاك نەوشیروان مستەفا.

## دەستگیر کردنی دەستەیەك سەرکردە:

لەکارەساتێکی تری سەرەتای ساڵی ١٩٧٦ و لە ڕۆژی ١٩٧٦/١/١ ڕژێمی شای ئێران خاڵە شەهاب شێخ نووری‌و هاوڕێکانی کە لەشاری سەقز گیرابوون لەڕێگای پێنجوێنەوە زۆر نامەردانە تەسلیمی ڕژێمی عێراقی کردەوە کە بریتی بوون، لەکۆمەڵێك کادری لێهاتوو بەتوانای (کۆمەڵەی مارکس و لینینی کوردستان) لەو کاتەدا ئەوانیش ئەم کادرانە بوون:

١- شەهید شەهاب شێخ نووری. ٢- جەعفەر عبدالواحید

٣- عومەر سەید عەلی ٤- فەرەیدون عبدالقادر

٥- ئەرسەلان بایز ٦- ئاوات عبدالغفور

٧- عەلی بچکۆل (عەلی محمد قادر)

هەر لەو ساڵانەدا ڕژێم بە پەلە کەوتە گرتنی چەند کەسانێکی تر لەشارەکانی کوردستان و لەبەغدا کە ئەمانە بوون:

١- ئاسۆ شێخ نوری ٢- عەلی حەمە مراد

٣- عەباس میرزا سەعید ٤- جەبار فەرمان

٥- ئیبراهیم حسێن ( حاکم ئیبراهیم ) ٦- ئەنوەر حسێن

---

ئەم زانیاریانەم لە هەڤاڵان شەهیدی سەرکردە کاك شەوکەتی حاجی موشیر، شێخ علی کەشکۆڵ وەرگرتوە.

| | |
|---|---|
| ٧- سەعدون فەیلی | ٨- خدر عبدالرحمن |
| ٩- عبدالله عەلی رەشید | ١٠- شێخ دارۆ شێخ نوری |
| ١١- عوسمانی نانەوا | ١٢- کەمال علی |
| ١٣- فاروق ئەحمەد | ١٤- ئەنوەر زۆراب کەرکوکی |
| ١٥- حسێن رەزا رەزا | ١٦- سەلام حەسەن برزۆ. |

لە ١٩٧٦/٧/١١ دەستکرا بە دادگاییان و لە ١٩٧٦/١١/٢١ رژێم سێ کەسیان بەحوکمی سێدارەدا وەکو ئەندامێکی قیادیان کە لەم کاتەدا کارەساتێکی زۆر ناخۆش بوو، زۆر لایەن پشتگیری لێ کردن رژێم هەر ئیعدامی کردن ئەوانیش ئەمانە بوون: (خاڵە شەهاب شێخ نووری) (جەعفەر عبدالواحید کۆیی) (ئەنوەر زۆراب کەرکوکی) تەرمەکانیان هێنانەوەو زۆر بەرێزەوە پێشوازی کران و نێژران، ئەوانی کەیش زیندانی کران هەریەکە بە شەش ساڵ هەتا لێبوردنی گشتی لە مانگی ١٩٧٩/٩ ئازادکران و زۆربەیان پەیوەندیان کرد بەهێزی پێشمەرگەوە، لەگەڵ ئەو هەموو بەکارهێنانە توندوتیژیە بێ وێنەیەی رژێم کە بەرامبەر بەگەلی کورد بەگشتی کەسانی هۆشیارو شۆڕشگێڕ بەتایبەتی نەیکردبێ دریغی لەهەموو جۆرەکانی تەمەن و پیشەو ناوو ناوبانگ، بەلام خۆشبەختانەو زۆر بەشانازیەوە ئەو وتەو تیۆرە بەنرخەی بەکردار سەلماند کە ئەڵێ هەتا توندو تیژی زۆربێت لەسەر گەلانی ژێردەستە ئەوە گیانی شۆڕشگێڕی و بەرگری و خۆڕاگری زیاترو پتەوتر ئەبێت بەڕاستی کردەوە نامرۆڤایەتیەکانی رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان بەگشتی و بەتایبەت رژێمی بەعسی صدام بوو بەهەڵگیرساندن و جۆشدانی تەواوی خوێندنگایەکی شۆڕشگێڕی سەرتاسەری لەکوردستاندا و لەماوەیەکی چەند ساڵەدا سەدەهاو هەزارەها لەناو رێکخستنە نهێنی و ئەڵقە رۆشنبیریەکانی ناو شارو شارۆچکەکانەوە خوێندکاری بەرچاو رۆشن و هەست بە لێپرسینەوە بەرەو گۆڕەپانی جۆرەکانی قۆناغی خەبات و بۆ ریزەکانی پێشمەرگە پەیوەندیان ئەکرد، بەنووسراوی تەزکیەو پشتگیری رێکخستن ئەناسران دروشمی گیانی لەخۆبوردن و دڵسۆزی و پشوودرێژی لەیەکەم رۆژەوە لەئامێزی پەیمانی ماندوونەناسیان ئەداو خۆڕاگرتن بەرامبەر بەو هەموو ژیانە پڕ لەمەترسی و مەینەتیەی بێ نان و ئاوو جێگاو پێخەف و بێ پشودانە لەملاشەوە ملکەچ کردنی خێزان لەباوک و دایک و براو خوشکی عەرەب و مندالی ساواو ئەوانەی ژنیان بوایە بەگشتی بۆ بەردەسەلاتی دەزگاکانی رژێم و ئیهانەی رۆژانەیان، هەرچەند لەسەرەتای شۆڕشدا رژێم فەرمانی گرتن و حجز کردنی دان بە دوورخستنەوەیان بۆ ناوەڕاست و خوارووی عیراق و تێکدانی سامان و ماڵەکانیان ئینجا ئەم کردەوە نامرۆڤانەی رژێم زیاتر هانی گیانی

شۆڕشگێڕی و خەڵکی کوردو هێزی پێشمەرگەی ئەدان، بەمەرجێکی تەواوی پێشمەرگەی لەخۆبوردنیان ئەزانی و گیانی تۆڵەیان بەجۆشتر ئەبوو کاتێك ئەیان بیست کەسوکاریان گیراوە ئینجا دڵگەرمتر ئەبوون. بۆیە هەر لەماوەی ئەو چەند ساڵەی کۆتایی هەفتەکاندا لە پێکهاتەی دەستەی پارتیزانی پێشمەرگەوە بەچالاکی پێویست و گەشەکردنەوە لەسنورەکەدا گەشەی چۆنایەتیان سەندو پەرەیان بەخۆیانداو لەگەڵ ڕەگی قوڵ و لەناو ئامێزی جەماوەردا، ڕۆژ بەڕۆژ زیاترو گەورەتر ئەبوو بەجۆرێك دەنگ و چالاکیەکانیان لەهەموو شوێنەکانی کوردستان و مژدەی هەڵسانەوەی شۆڕشی نوێخواز بە سەرپەرشتی (ی. ن. ك) بەهەموو جۆرەکانی ڕێکخستنەوە دوایی بە تەمێکردنی خەڵکە ئەڵقە لەگوێ و پیاوەکانی ڕژێم بەجۆرێ ئامۆژگاری هەتا سێ جارو ترساندنیان هەتا پاشگەزبوونیان لەهاوکاری کردنی ڕژێم بەتایبەت هەندێ لەموختارەکانی دێکان کە ساویلکەبوون.

## دەست پێکردنی چالاکیە سەرەتاییەکان:

هەندێ کەسانی ناو شارو شارۆچکەکان کە هەندێ لەجۆرەکانی دەزگاکانی ڕژێم بەکاریان ئەهێنان بۆ کاری سیخوڕی و خراپەکاری لەسەر لاشەی گەلەکەمان، بەلام ئەمە خۆشبەختانە زۆری نەخایاند هەرچەند قوربانی درا لەناو ڕیزەکانی پێشمەرگە لەسنورەکانی کوردستان لە دێکان و ناو شارەکاندا.

پێشکەوتنی هێزی پێشمەرگەو پێکهاتەی وەکو پێویست گەیشتە هەرێم بەپێی دابەشی سنووری جوغرافیای ئەو کاتە لەشوێنەکانی کوردستان وەکو دەست نیشان کراوە ناوو سنوری چالاکیەکانیان.

چالاکی و دەست وەشاندنی هێزی پێشمەرگە لەناو ئەو بارودۆخە ناهەموارەشدا دریغیان نەکردو زۆر چاونەترسانە دریان بەسام و هەیبەتی هێزی زۆرو زەبەنەی دوژمن ئەداو زۆر مەردانەو چاونەترسانە لەهەموو شوێنەکانی کوردستان لەیەکەم ساتدا لەشەوی ١٩٧٦/٦/٢٦، تەقەیان سازدا بەمەبەستی جاڕدانی شۆڕشی نوێخوازی (ی. ن. ك) ئینجا چالاکی و دەست وەشاندن لەو ساڵانەداو بەخشینی یەکەم قوربانی لە شەوی ٦-١٩٧٦/١٠/٧، لە دێی قاینەجەی شارەزوور کە ئەویش شەهید (فاتیح شێخ حەیدەر عارف) هەڵبجەیی بوو، لەهەمان کاتدا چەند پێشمەرگەیەك کە تازە پەیوەندیان کردبوو کەوتنە دەستی ڕژێم و دوایی لەسێدارەدران ئەوانیش بریتی بوون لە شەهیدان: ناصر تەپی سەفایی و حەمەی حەمە فەرەج تەپی سەفایی و وەهاب زەڵمی و حەمەڕەشید حاجی سەعید قاینەجەیی کە خاوەن

---

چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێزان ئاسۆی شێخ نوری، حاکم برایم حسین.

ماڵەکە بوو، لەم چالاکیەدا هەردوو پێشمەرگەی دێرینو سەرەتایی کاک شەوکەت حاجی مشیرو کاک حامدی حاجی خالید بەشەڕی دەستەو یەخە دەرچووبوون دوای ئەوەی ئەفسەرێكو چەند سەربازێکی ڕژێمیان کوشتبوو لەکاتێکدا بەدەوری ئەو ماڵەدا بوو کە ئەمانی تیا بووە کە ئەمە لەشێوەی سیحرو فلیم ئاسایەکدا توانیان دەربازبن لەو کاتەدا.

لەسەرەتاو ناوەڕاستی ئەم ساڵانەدا دەستە دەستە لەسەرکردەکانی دەرەوەی وڵات بەرەو ناوەوە لەڕێگای شامو ناو سنورەکانی تورکیاوە ئەگەیشتنەوە کوردستان بۆ سەرپەرشتیو سازدانەوەی هێزی پێشمەرگەو کردنەوەی خولی ڕۆشنبیریو مەشق زانینی نەخشەی کارو بەرنامەی پێشمەرگایەتی بەپێی ڕۆشناییو زانیاریەکانی شۆڕشەکانی گەلانی ڕزگاریخوازی دنیاو بەکارهێنانو ڕاهێنانی ئەزمونەکانیانو لە ١٩٧٧/٩/١٥ بەیاننامەی کۆبوونەوەیەکی فراوانی سەرکردایەتی (ی. ن. ك) بوو بۆ ڕژێمیش زیاتر کەوتە پەلەقاژە لەلایەك مەبەستی هەر زوو بەربەست کردنی بڵێسەی شۆڕشەکەو لەولاشەوە ئەنجامدانی بەرنامەکەی لەڕاگواستنی دانیشتوانی کوردستان لەشوێنەکانیان بۆیە بەسازدانی هێزە عەسکەریەکان.

## دروستبوونی هەرێمی پێشمەرگایەتی و دەست وەشاندنی تەواو لەڕژێمی عێراق

ڕژێمی عێراق بەمەبەستی هەرزوو بەربەست کردنی گەشەکردنی شۆڕشی کورد بە بەرنامەی عەسکەریە فراوانەکەی خۆی کەوتە پەلاماری زۆر لەشوێنە شاخاویە سەختە دوورەکانی کوردستان بۆ نموونە لە ڕۆژی ١٩٧٨/٩/١٦، شالاوێکی ڕژێم کرا بۆ سەر ناوچەی باڵەبان تەنانەت لەماڵە ڕەوەندەکانی داو زیانێکی زۆری لێدان.

هەر لەو کاتەدا لە ١٩٧٨/٩/١٣ چالاکیەکی هەرێمی (٣) کرا بەرامبەر بەهێزەکانی ڕژێم و لە ١٩٧٨/٣/١٢ لەبەرەنگاریەکی بێ وێنە شەهیدی سەرکردە (سەعدی گچکە) شەهید کرا، چوارده پێشمەرگە بەداخێکی زۆرەوە لەم چەند ساڵەی سەرەتایی پێشمەرگەدا بەهۆی پیلانەکانی ڕژێم و جیاوازی لایەنەکان ڕژێم توانی سوود لەو هەوڵانەی خۆی وەربگرێت زیاتر لە پێشمەرگە بگەیەنێت لەوانەیش شەهید کردنی پێشمەرگەی دیاری و بەواتوانا کاکە حەمە غەفور ئاغجەلەری لە دێی کانی بی بەخۆی و شەش پێشمەرگە بەدەستی چەند کەسێکی ڕژێم و دوایی گەیشتنەوە لای ڕژێم لە چەمچەماڵ ئەمە لە ١٩٧٧/٧/٢٣دا ڕوویداو پێشمەرگەکانیش ئەنوەرو ئەحمەد و عبداللە، لەسنوری شارباژێریشدا خۆفرۆشێ هەر لەو ساڵەدا احمد فتح اللە و چەند پێشمەرگەیەك شەهید کران. لەگەڵ ئەم بارە سەختەی بەرنامەی پێشمەرگایەتیدا هەتا ئەهات پێشمەرگە گەشەی ئەکردو زیاد ئەبوو، بەڵام زیاتر لەڕووی چۆنایەتیەوە هەتا ساڵەکانی ١٩٨٠ و کەمێك بەرەو سەروتریش. لەساڵی ١٩٧٨ کاتێك هێزەکانی پێشمەرگە لەهەزار پێشمەرگەیەك زیاتر ئەبوو بەرنامەیەك داڕێژرا بەمەبەستی هێنانی چەك و هەرچی زووتر بۆ بەرگری کردنی دێهاتەکانی کوردستان لەڕاگواستن بۆ ئەم مەبەستە لە ١٩٧٨/٤/١٩ دەستەیەکی (٢٢٠) پێشمەرگەی بەڕێکەوت بۆ ناوچە سێ گۆشەیەکەی کوردستانی دابەش کراو بەتایبەت بۆ ناوچەی برادۆست کە ئەم هۆزو تیرانەی ئەم سنورە زۆر دۆستی پێشمەرگەو هەستی کوردایەتی بوون دواتریش بەم ڕەتڵەوە بە سێ ڕەتڵ نزیکەی (چەند سەد) پێشمەرگە بەرەودوا بەڕێکەوتن بەسەرپەرشتی شەهید عەلی عەسکەری کە لەو کاتەدا بەرپرسی یەکەمی هێزی پێشمەرگە بوو لەگەڵ شەهیدان د. خالد و حسێن بابە شێخ و ملازم عومەرو عەلی والی بەگ و کاکە حەمەی حاجی مەحمو و کاك حامدی حاجی خالیدو شەهید ڕەوف بەگ و چەند کادرێکی عەسکەری و سیاسی لەوکاتەدا کە سامانێکی گەورەی شۆڕشی (ی. ن. ك) بوون لەسازدان و پێکهێنانیان و هەڵسانەوەی شۆڕشی نوێخوازی کورد. *

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێزان: مامە جەمال، ڕەابەر سەید برایم.

## كاره‌ساتی هه‌كاری

ئه‌م سێ هێزه به‌ناو سنوره‌كانی عێراق‌و ئێران‌و توركیا ڕۆیشتن بۆ ماوه‌ی زیاتر له‌مانگێك به‌ڕێوه‌بوون به‌ ژیانێكی زۆر سه‌خت له‌لایه‌ك ساردو سه‌رما و له‌لایه‌ك لێدانی هه‌ر سێ ڕژێمه‌كه‌ به‌جۆره‌ها چه‌ك هه‌تا به‌ فڕۆكه‌و له‌ده‌ستدانی چه‌نده‌ها پێشمه‌رگه‌ شه‌هید بوون له‌سه‌رما ڕه‌ق بوونه‌وه‌و به‌جێمان له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا له‌ ١٩٧٨/٥/١٣ گه‌یشتنه‌ هه‌كاری توركیا به‌و كاره‌ساته‌ پڕ له‌مه‌ترسیه‌و ئازاره‌دا ئه‌و هه‌موو هێزی پێشمه‌رگه‌یه‌و هه‌موو كادره‌ به‌تواناو چالاكه‌ سیاسی‌و عه‌سكه‌ریه‌وه‌ كه‌وتنه‌ ناو پیلانێكی زۆر جه‌رگ بڕانه‌ی تیره‌كانی ئه‌و سنوره‌و ده‌ستی ناوخۆ كه‌ زۆر به‌داخێكی هه‌ره‌ گه‌وره‌وه‌ به‌سه‌رپه‌رشتی‌و به‌رچاوی میتی توركه‌وه‌ هێزی چه‌كداری كوردو پێشمه‌رگه‌ كه‌وتنه‌ ویزه‌یان هه‌تا نزیكه‌ی ١٩٧٨/٦/١٨ شه‌ڕو پێكدادان ڕووی داو له‌ئه‌نجامدا ئه‌م هێزه‌ی پێشمه‌رگه‌ی (ی. ن. ك) كه‌ له‌وكاته‌دا تاقه‌ ئاواتی گه‌لی كورد بوو هه‌مووی ته‌فرو تونا كراو چه‌نده‌هایان لێ شه‌هیدو بێسه‌رو شوێن كراو زۆریشی لێ به‌دیل گیرا كه‌ تیایاندا سه‌ركرده‌كانی هێزه‌كه‌ شه‌هیدان عه‌لی عه‌سكه‌ری‌و د. خالد و حسێن بابه‌ شێخ كه‌ ئه‌م سه‌ركردانه‌ له‌ ١٩٧٨/٧/٧ به‌ دیلی شه‌هیدیان كردن‌و به‌م جۆره‌ ته‌نیا ڕژێمه‌ سه‌ركوتكه‌ره‌كانی كورد به‌ ئاوات گه‌یشتن له‌و كاته‌داو له‌هه‌مان كاتدا كۆمه‌ڵێك پێشمه‌رگه‌ به‌ ئه‌ولای سنوره‌كانی ڕژێمی عێراق گه‌ڕانه‌وه‌و خۆیان دایه‌ده‌ست سه‌ربازه‌كانه‌وه‌ زۆربه‌یان به‌ گه‌یشتنه‌وه‌یان له‌ شوێنی خۆیان په‌یوه‌ندیان كرده‌وه‌ به‌هێزی پێشمه‌رگه‌و له‌وانه‌یش ته‌نیا چه‌ند پێشمه‌رگه‌یه‌ك كه‌ له‌گه‌ڵ شه‌هید جه‌مال عه‌لی باپیر به‌هه‌ندێ تاكتیك‌و توانای خۆیان ده‌ربازبوون‌و گه‌شتنه‌وه‌ ناو هێزی پێشمه‌رگه‌ له‌م كاره‌ساته‌دا كه‌ به‌كاره‌ساتی هه‌كاری ناسراوه‌ مێژوویه‌كی یه‌كجار ناخۆش و ڕه‌ش بوو له‌ كاره‌سات‌و زیانی كورد به‌ كورد كوشتن كه‌ هه‌میشه‌ ئه‌مه‌ میكرۆبی به‌ئه‌نجام نه‌گه‌یشتنی كێشه‌ی گه‌لی كوردمان بووه‌ له‌دێر زه‌مانه‌وه‌، ئه‌و حه‌وت پێشمه‌رگه‌یه‌ به‌ شه‌هید جه‌مال عه‌لی باپیره‌وه‌ كه‌ ده‌رچوون ئه‌مانه‌ن:-

١) كاكه‌ حه‌مه‌ی حاجی مه‌حمود
٢) مه‌حمود زه‌رده‌ۆیی
٣) شه‌هید تاهیر حاجی عه‌زیز
٤ ) ڕه‌فیق پارمزانی
٥) به‌كره‌ سور ئاوه‌كورتێیی
٦) شه‌هید حه‌مه‌ڕه‌ش گرێزه‌یی

لەم كاتەی ئەو كارەساتە گەورەیە لە هێزی پێشمەرگە كەوت بەپەلە ڕژێمی عێراق كەوتنە سازدانی بەرنامەی ڕاگواستنی دێهاتە سنوورییەكان و بەهەڵ زانی بەتایبەت لەمانگەكانی هاوینی ساڵی ١٩٧٨ دا بۆ كۆمەڵگا زۆرە ملێكان.*

---

* چاوپێكەوتن لەگەڵ بەرێزان مامە عبدالخالق هەورامی، ڕەفیق پارەزانی پێشمەرگەی سۆشیالیست، حمە شارەزووری.

## دەست پێکردنی خۆپیشاندانی نارەزایی جەماوەریی لەناوچەکانی کوردستاندا و گۆرینی ناوی کۆمەڵە

لەگەڵ ئەم کۆستە گەورەیەی لە هێزی پێشمەرگە کەوت لەوکاتە پێویستەدا بۆ گەلی کوردو بزووتنەوە رزگاریخوازەکەی کە چەند پێشمەرگەیەك زۆربوو لەمەیداندا بێت بەڵام خۆشبەختانە سەرکردایەتی (ی. ن. ك) لەناو (زەنگ و نۆکان) توانیان هێزی پێشمەرگە سازبدەنەوەو پێشمەرگە پەرتەوازەکان بگرنەوەو لەناو رێکخستنەکانیشەوە هاوکاری باش کرا بەناردنی کەسانی بەتوانا بۆ ناو ریزی هێزی پێشمەرگەو هەر لەماوەی چەند مانگیدا چالاکی پێشمەرگایەتیو جەماوەری دەستی پێکرد بەسەرپەرشتی رێکخستنەکانو لەناو شارو شارۆچکەکان بۆ نموونە لەرۆژێکی زۆر گرنگی رژێمی بەعسدا کە رۆژی ٧/٤/ ی یادی دروست بوونی حزبی بەعسی رژێمی عێراق کە لەو رۆژەدا ئەبوایە لە هەموو شوێنەکانی عێراق بەگشتیو لە کوردستان بەتایبەتی ئەگەر بەزۆرو فشارو چاودێری پیاوەکانی رژێمیش بوایە ئەبێ بکرایە بەبۆنەو یادی تەواو بکردایەتەوەو دائرەکان و خەڵکیان بەزۆر ئەبرد، بەڵام لەهەمان ئەو رۆژەو لە ١٩٧٩/٤/٧ گەورەترین خۆپیشاندان لە شاری پێنجوێن کرا بۆ ماوەی سێ رۆژ، دەسەڵاتی رژێمیان لەشارەکەدا نەهێشت تەنانەت رژێم بەهێزی عەسکەریو لێدانی چەند کۆپتەر ئینجا خۆپیشاندانەکە سەرکەوتوو بوو لەلایەن جەماوەرەوە کە لەوکاتەدا چاوشکاندنێکی گەورەی هەیبەتو دەسەڵاتی رژێم بوو، لەهەمان کاتیشدا بەرزبوونەوەی گیانو هەستی شۆرشگێری جەماوەری بوو تەنانەت شوانێك بەناوی دەروێش مەجید شەهید بوو تیایدا وە لەساڵی دواییو لە ١٩٧٩/٦/٩ خۆپیشاندانی شارۆچکەی قەسریێ کرا دژی راگواستن زۆر بوێرانەو لە ١٩٧٨/١١/٣ کۆبوونەوەی کۆمەڵە ناوی کۆمەڵە لە کۆمەڵەی مارکس لینینی کوردستان گۆرا بۆ کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بۆ ئەو ساتو کاتەی ناوبانگی لەناو جەماوەری گەلی کوردا رۆڵی کاریگەرو وەرچەرخانێکی باش بوو. وە لەرووی ناوەوەو دەرەوەی کوردستاندا، لە شێنیو گۆرینی ناوی کۆمەڵە. وە بۆ سازدانەوەی هێزەکانی پێشمەرگەو بەرزبوونەوەی وەرەی جەماوەر لەبەردەم رژێمدا هەر لەو ساڵەدا سەرکردایەتی (ی.ن.ك) لە ١٩٧٩/٧/٧ دوای کۆبوونەوەو دراسەیەکی مەیدانی پەیرەوی ناوخۆی مەکتەبی عەسکەری بڵاوکردەوە کە بەم جۆرە هێزی پێشمەرگە لەیەك سەنگەردا بەناوی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) خەباتی پێشمەرگایەتی بکاتو پلەی لێپرسراوێتی بەپێی تواناو لێهاتوویی وەربگیرێت لە

مەیدانی شەڕو چالاکیدا درا بێجیاوازی لە بۆچوون و ڕێکخستنەکانی ناو (ی.ن.ك) کە لێی پێکهاتووە کە بەڕاستی هەر لەناو ئەم دەسەڵات و سەرکردایەتییەدا بوو توانرا چەند بۆچوونێك لەناو یەك نیمچە بەرەدا جێبکاتەوە لەیەك سەنگەرداو بەیەك ناوی سەرتاسەری (ی.ن.ك) بەدرێژترین ماوەی خەبات لەشۆڕشێکی سەختی وا درێژ خایەندا بێ هەست کردن هەتا مانگی ٢ی ساڵی ١٩٩٢ کۆنگرەی یەکەمی (ی.ن.ك) دا بڕیاری یەکگرتنەوەی تەواو درا.

---

چاوپێکەوتن لەگەڵ خوالێخۆش بوو کەمال تایەر، سەلیم سەرسپی.

## دروست بوونی كۆمه‌ڵگای ( مجمع ) زۆره‌ملێ له كوردستانداو قۆناغه‌كانی به عه‌ره‌ب كردن و ڕاگواستن

**قۆناغی سێیه‌م:**

ڕژێمی به‌عس بۆ ئه‌نجام گه‌یاندنی سیاسه‌ته‌كانی دژی گه‌لی كورد به‌گشتی و به‌تایبه‌ت له‌ناو سیاسه‌تی به‌عه‌ره‌ب كردن و ڕاگواستنی گه‌لی كورد تێكدانی دێكانیان و دوورخستنه‌وه‌یان له ماڵ و زه‌وی و سامان و گۆڕو شوێنی باو باپیرانیان به‌ده‌ها كیلۆمه‌تر و چۆڵ كردن و وێران كردنی شوێن و هه‌تا كانیاوه‌كانیان و له هه‌ندێ شوێندا هێنانی عه‌ره‌ب بۆ شوێن و سه‌ر زه‌ویه‌كانیان، به‌تایبه‌ت سنوره‌كانی خانه‌قین و كه‌ركوك و جه‌له‌ولاو كفری (گه‌رمیانی خواروو) دوزو قادر كه‌ره‌م و له‌یلان و قه‌ره‌هه‌نجیرو سنوره‌كانی هه‌ولێر (بحركه‌و گوێرو دیبه‌گه‌و مه‌خمورو سنوری موصل و سنجارو شێخان)، هه‌ر له‌مانگی ١٩٧٥/٦ه‌وه به‌چه‌ند قۆناغێك ده‌ستی پێكرد به‌تایبه‌ت له‌سه‌ره‌تادا سیاسه‌تی به‌عه‌ره‌ب كردن بوو واته ده‌ركردنی كورده‌كان له‌سنوره‌كانی خانه‌قین و كه‌ركوك و موسڵ، دوایی له‌ساڵی ١٩٧٨ه‌وه دێهاته سنوریه‌كان بۆ ناوه‌وه خستنیان له كۆمه‌ڵگای (مجمعی) زۆره ملێی چه‌ند هه‌زار ماڵی له‌سه‌ر زه‌وی و زاری دێهاتی ترو بێ گوێدانه هیچ جۆره سه‌رچاوه‌یه‌كی ژیان ته‌نانه‌ت ئاوی خواردنه‌وه‌و كاره‌با له‌سه‌ره‌تادا نه‌بوون و بوو به‌هۆی مردنی چه‌نده‌ها منداڵی ساواو كه‌سانی تر له هاوینداو له‌به‌ر گه‌رما به‌تایبه‌ت خه‌ڵكانی دێهاته سنووریه‌كان كه هه‌موو سنوری كوێستان بوون و فێری ئاوو هه‌وای فێنك و خۆش بوون، وه به‌گشتی هه‌ر له‌مانگی ١٩٧٥/٦ هه‌تا مانگی ١٩٩١/٣ ی ڕاپه‌ڕین نزیكه‌ی زیاتر له‌نیو ملیۆن كورد له‌كۆمه‌ڵگایا (مجمعی) زۆره ملێدا ژیان و ئاماده كرابوون به شاره‌كانیشه‌وه بۆ ڕاگواستنی قۆناغی دوایی ئه‌ویش بردنیان بۆ خوارووی عێراق و شێوه‌ی (١٨٢) هه‌زار ئه‌نفال كراوه‌كان. ئه‌گه‌ر ڕاپه‌ڕین نه‌بوایه. گرنگترین مجمعه‌كانیش ئه‌مانه‌بوون كه به‌و جۆره دروست كرابوون له‌كوردستاندا:-

١- كۆمه‌ڵگای زۆره ملێی (نصر) نزیكه‌ی ١٨ هه‌زار ماڵ ئه‌بوو له‌نێوان ناحیه‌ی عربه‌ت و زه‌ڕایه‌نی شاره‌زوورو بۆ سنوره‌كانی ناوچه‌ی پێنجوێن و شلێری سنوری ئێران كه به ده‌ها كیلۆمه‌تر دووره له‌م شوێنه‌وه.

٢- كۆمه‌ڵگای برایه‌تی له هه‌مان سنووردا بوو ئاوی تانجه‌رۆ له‌نێوانیاندا بوو پێشیان ئه‌وت باریكه به‌هۆی دێی باریكه‌وه بۆ دێكانی سنووری سه‌یدسادق و شاره‌زوورو

بێبەری کردنیان لەزەوی‌و زاری کشتوکاڵی هەمە جۆریان کە چەند کیلۆمەترێك لییانەوە دووربوو.

٣- کۆمەڵگای زەڕایەن لەساڵی ١٩٧٦ /١٩٧٧ ەوە دروست کرابوو بۆ خەڵکانی دێکانی ئەوبەری سیروان‌و سنوری خانەقین‌و هەڵەبجە کە لەقۆناغی یەکەمدا دەستی پێکرد.

٤- شارۆچکەی هەڵەبجە کە بەهەڵەبجەی تازە ناو ئەبراو لەڕەسمیاتدا بوو بەقەزای شارەزوورو لەساڵی ١٩٨٨ بۆ خەڵکانی هەڵەبجەی شەهیدو هەورامان‌و سیروان‌و خورماڵ کرا دوای کیمیاویەکەو بەچەندەها دۆنم زەوی کشتوکاڵی ئەو سنورەی لەناو برد.

٥- کۆمەڵگای شانەدەری لەدەشتی ڕەقەی سورەجۆی نێوان سەید سادق‌و شانەدەری ڕێگای سەیدسادق پێنجوێن ئەمە لەساڵی ١٩٧٨ەوە دروست کرا بۆ دێکانی سنوری شلێری پێنجوێن‌و بناری سورێن‌و لەساڵەکانی ١٩٨٤ بۆ سەرەتای ١٩٨٨ چۆڵکرا بەهۆی شەڕی ئێران‌و عێراق‌و تۆپ بارانی ئێران‌و دوایی کیمیاوی لێدانی شاری هەڵەبجەی شەهیدو خەڵکەکەی برانە مجمعی نەصرو باریکە هەتا ڕاپەڕین‌و دوایی.

٦- کۆمەڵگای کانی مانگاو ڕاوگانی نزیك پێنجوێن.

٧- کۆمەڵگای نامپارێزی سنوری پێنجوێن شارباژێڕ.

٨- کۆمەڵگای حەسەن ئاوا لە نزیك پێنجوێنەوە.

٩- کۆمەڵگای قوڕەڕەشەی پێنجوێن

١٠- کۆمەڵگای عەربەت کە لەنێوان هەردوو دێکانی عەربەتی خواروو باریکەدا بوو لەساڵی ١٩٧٦ دروست کرا بۆ خەڵکانی سنوری خانەقین‌و ئەوبەری سیروان.

١١- کۆمەڵگای سیروان لە نزیك هەڵەبجەی شەهید بەتەنیشت ناحیەی سیروان.

١٢- کۆمەڵگای زەمەقی لەنزیك هەڵەبجەی شەهید.

١٣- کۆمەڵگەی عەنەب لەنێوان هەڵەبجەی شەهید و دێ ی عەنەب بۆ دێکانی هەورامان و شارەزوور بۆ سنورەکانی خۆیان و پشدەر.

١٤- کۆمەڵگای بازیان کە چەند بەشێك بوون‌و زەوی کشتوکاڵی ئەو سنورەی گرتبوەوە.

١٥- کۆمەڵگای ئەڵلایی ئەمە لەسەرەتادا باش دروست کرا بۆ دێهاتەکانی ئەو سنورەی خۆیان‌و دوایی گۆڕا بۆ هەمان مەبەستی ڕژێم.

١٦- کۆمەڵگەی باینجان هەر لەسنوری بازیان.

١٧- کۆمەڵگای (مجمع) ی زۆره ملێی تەکیەی دەربەندی بازیان بۆ سنورەکانی ئاغجەلەرو ئەوناوە.

١٨- کۆمەڵگای صمودی گەرمیان لەسەرووی شارۆچکەی کەلار بۆ ڕێگای کفری ئەمە بۆ هەموو پاشماوەکانی ئەنفالی دێکانی گەرمیان.

١٩- کۆمەڵگای شۆڕشی چەمچەماڵ لەبەردەم بان مەقان دا ئەمەیش بۆ سنورەکانی گەرمیانی هەژارو ناوشوان و دەرکراوانی کەرکوك.

٢٠- کۆمەڵگای قەلاچۆلانی شارباژێر.

٢١- کۆمەڵگای سورە قەڵاتی شارباژێر.

٢٢- کۆمەڵگای کەناروێی شارباژێر.

٢٣- کۆمەڵگای کارێزەیی شارباژێر.

٢٤- کۆمەڵگای حاجیاوای نێوان چوارقوڕنەو سەروچاوە.

٢٥- کۆمەڵگای چوارقوڕنە.

٢٦- کۆمەڵگای تاسلوجەی ڕۆژئاوای سلێمانی ئەمانە هەتا خانەقینیشی تیابوو.

٢٧- کۆمەڵگای پیرەمەگرون لەنێوان تاسلوجەو دوکان.

٢٨- کۆمەڵگای بەحرکەی سنوری پارێزگای هەولێر.

٢٩- کۆمەڵگای حەریر، سنوری پارێزگای هەولێر.

٣٠- کۆمەڵگای مەلا هۆمەر، سنوری پارێزگای هەولێر.

٣١- کۆمەڵگای شاویس، سنوری پارێزگای هەولێر.

٣٢- کۆمەڵگای بنەسلاوە، سنوری پارێزگای هەولێر.

٣٣- کۆمەڵگای قوشتەپە کە لەساڵانی ١٩٧٦ ـەوە دروست بوو لەخوارووی هەولێرو لێرەدا بەرزانیەکان ئەنفال کران لە ١٩٨٣/٨/٣١ ی بەیانیدا.

کۆمەڵگا زۆرە ملێکانی سنووری پارێزگای دهۆکیش ئەمانە بوون:

(شیلادزێ، دێرە لوك، کانێ، بیکۆڤە، قەدشێ، باتوفێ، بێرسڤێ، هیزاوا، مەرونە، تلکەبر، باگیرات، کۆری گاڤان، گاڤا، شاریا، باکرمان، دەرگای عەجەم، مرێبا نزیك ئەتروشێ، ئەتروش کە لە (١٩٧٦)ەوە دروست کراو دوایی بوو بە قەزای شێخان*

---

چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێزان مەلا مستەفای بادینی، عبدالقادر باجلوری، خوالێخۆش بوو عبدالرحمن گۆمەشینی، کۆمەڵێك لە خەڵکانی سنوری ناوچە جیاجیاکان.

## کردنەوەی ڕادیۆی شۆڕش لەناو کۆمەڵێك کارەسات دا

وە لە ١٩٧٩/٩/٦ و زۆر بە داخەوە کاکە ئاسۆی دەلاك دەستگیرکرا کە بەڕاستی پێشمەرگەیەکی زۆر چاونەترس و ئازاو دەست وەشێن بوو لەپیاوەکانی ڕژێم لەناوجەرگەی شارەکاندا. لەگەڵ ئەم هەموو ماڵ وێرانیی و ڕۆژگارە سەختەی بەردەم هێزەکانی پێشمەرگە بەدەستی ڕژێم و پیلانەکانی بەردەوام و ڕاگواستنی دێهاتەکانی کوردستان و شەڕی ناوخۆ بەڵام سەرکردایەتی و هێزەکانی پێشمەرگە هەر لە داهێنان و سازدانەوەی هێزەکانیان و بەرنامەکانیان بوون بەتایبەت لە ١٩٧٧/٣/٢١، یەکەم ڕۆژی کردنەوەی دەنگی شۆڕشی عێراق ئەمە لەوکاتە وەکو ڕاگەیاندنێکی زۆر فراوان و کاریگەر دەنگی ئەدایەوە لە کوردستان و عێراقدا بۆیە سەرچاوەی هەواڵ خۆش و بەباوەڕ بەتایبەت بەناوی شۆڕش هەموو گەلی عێراق بوو کە بووە هۆی ترس و لەرزێکی گەورە بۆ ڕژێمی عێراق و لە هەمان کاتدا هاندەرێکی چاك بوو بۆ بەرزکردنەوەی ورەی جەماوەر و چالاکیەکانی هێزی پێشمەرگەو ناو ڕێکخستنەکانی شارو شارۆچکەکان لە هەموو شوێنەکانی کوردستانی عێراقدا کە هەر لەو ساڵانەدا دەستەی هەڵۆی سور لەبەغدا دامەزرا بە سەرپەرشتی ئەفسەری شۆڕشگێڕ ملازم جوامێر، بەنومێدێکی زۆر گەورەوە لەناوجەرگەی شاری بەغدا کاریان کردو دەستی وەشاند کە بەداخەوە ڕژێم دەستگیری کردن و لە ١٩٧٨/٤/١٠ لە سێدارەی دان، وە لە ١٩٧٩/٧/٢٢ کادری ڕۆشنبیرو شاعیر مەلا عەلی لە سێدارەدرا وە لەناو جم وجۆڵ و چالاکیەکانی هێزی پێشمەرگەو شاڵاو و پەلاماری بێ وچان هێزی عەسکەری ڕژێم لەو ساڵانەداو لە ١٩٧٨/٣/١٢ شەهیدی سەرکردە سەعدی گچکەو ژمارەیەك پێشمەرگە شەهید بوون لەڕێی ڕۆیشتنیان بۆ کۆبوونەوەی سەرکردایەتی لەسنوری پشدەر دوای تۆمار کردنی داستانێکی زۆر قارەمانانە بەکوشتنی چەندەها ئەفسەرو سەرباز کە لەو کاتەدا دەنگێکی زۆر گەوە بوو بۆ هێزی پێشمەرگە وە هەروەها دەستێکی نامەردانەی خۆفرۆشانە کاکە شاسوار جەلال (ئارام) کە ئەمەیش بەنمونەیەك لەشیعرەکانی شەهید مەلاعەلی پێشمەرگەو شاعیر:

مەڵێن دەمرێ و لەترسی مەرگ پەشێوە
پێشمەرگەبم هەر دەکەومە پێش ئێوە
بەمەرگی پێشمەرگی پێوە ئاسودەم
رووشم زەردەی پێکەنینی هەر پێوە

**گهڕانهوهی هێرۆخان:**

وه لهمانگی (١٩٧٩/٣) هێرۆخان گهڕایهوه بۆ ناو هێزی پێشمهرگهی کوردستان و یهکهم پێشمهرگهی ژن بوو که ڕاگهیاندنی ڕۆژنامهنووسی و کامێرای ڤیدیۆی بهکارهێناو وێنهی شهڕو داستانهکانی پێشمهرگهی لهناو جهرگهی شهڕو بهرگریهکانداو یادگارهکانیانی تۆمار کردووهو کتێبخانهی شۆڕشی سهرپهرشتی کردووه بهڵام یهکهم پێشمهرگهی ژن حهلیمه خان بووه که به ملازم حلیمه ناسراوه.

**شههید بوونی هاوڕێ ئارام:**

به هاوڕێ ئارام ناسرابوو له دێی تهنگی سهری قهرهداخ شههیدکرا کاکه ئارام سهرکردهیهکی زۆر بلیمهتو سیاسی بوو تێکڕای هێزی پێشمهرگهو ڕێکخستنهکان نومێدێکی گهورهیان پێی بوو که ئهویش له ١٩٧٨/١/٣١ شههیدکرا بهدهستی مهفرهزهیهکی خۆفرۆشی ڕژێمی بهعس، لهدهستدانی ئهم سهرکردهیه لهو کاتهدا زیانێکی زۆر گهوره بوو له کوردو شۆڕشهکهی درا، ههرچهند لهسهرهتادا ڕژێم نهیزانی که ئهوه شههید ئارامه تا ماوهیهك.

## فراوانبوونی چالاکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و گەیشتنەوەی بەڕێز مام جەلال بۆ ناو شۆڕشی کوردستان

لەو ساڵانەی کۆتایی حەفتاکاندا بەساڵەکانی هەڵسان و چالاکی هێزی پێشمەرگەو ڕێکخستنەکان و گرتن و لێدان و لەسێدارەدانی خەڵکە شۆڕشگێڕیەکە چوە سەرو ئەم بارودۆخە تێکڕای کوردستانی گرتبووەوە ڕژێم لە ١٩٧٧/١٢/١٥ فەرمانی لە سێدارەدانی چەند کەسێکی ئەنجامدا، وە لەناو شاری سلێمانی دوای زیندانی کردنی چەند کەسێك لەناویاندا (اسماعیل قاسم و محمد قاسم کە دوو برابوون یاسینە ڕەش لەسێدارە دران، وە لە ١٩٧٧/٢/٣٠ هێزێکی ڕژێم پەلاماری ناوچەی پشدەریان داو هێزەکانی پێشمەرگە زۆر نەبەردانە تێکیان شکاندن، وە لە ١٩٧٧/٣/٢٧ هێزی پێشمەرگە داستانێکیان لەچیای ساوین تۆمار کرد بەرامبەر بەهێزەکانی ڕژێم، وە لە ١٩٧٧/٩/١ نەبەردێکی هێزی پێشمەرگە لەگوندی قازانقایە ئەنجامدرا، وە لە ٩/٢، ١٩٧٨/٩/١٣ دوو چالاکی گەورە لەلایەن هەردوو هەرێمی ٧، ٣ ئەنجامدرا لە چۆمان و دۆڵی جافەتی، وە لە ١٩٧٩/٨/٨ هێرشی ڕژێم بۆ سەر ناوچەی سورداش، وە لە ١٩٧٩/٣/٢٧ خۆپیشاندانێکی ناڕەزایی دەربڕین کرا لەناو شاری سلێمانی دژی سیاسەتی بەعەرەب کردنی خوێندن کە ئەمە ڕەتدانەوەیەکی زۆر گەورەی جەماوەری کورد بۆ دژی سیاسەتی ڕژێم لەو کاتەدا، وە هەر لەم ساڵانەدا پیاوێك بەناوی (عبداللەی مەلا) خەڵکی دێی وەراز بەیەك دەمانچەوە بۆ ماوەی زیاتر لە چەند سەعاتێك بەرەنگاری هەموو هێزەکانی ئەمنی سلێمانی بوو لەماڵێکدا لە گەڕەکی مەجید بەگ نەیهێشت بچنە سەری هەتا دوا فیشەك خۆی پێکوشت و ئامادە نەبوو خۆی بدات بەدەستەوەو چەندەهای لێ بریندارکردن و کوشتن. لە پشتگیری و چالاکیەکانی (ی.ن.ك) لەدەرەوەی وڵات لە ١٩٧٩/٥/١٢ وەفدی (ی.ن.ك) بەشداری کۆنگرەی حزبی شیوعی فەرەنسای کرد. وە لە ١٩٧٩/١٠/١ لە کۆنگرەی بنغازی لە لیبیا سەرۆك قەزافی هەڵوێستی زۆر مەردانەو ویژدانانەی دا بەرامبەر بەکێشەی کوردو مافە نەتەوایەتیەکان، ئەمانە لەو کاتەدا پشت و دەنگێکی گەورەی هەبوو بۆ کێشەی کوردو شۆڕشەکەی، ئەمانە بەگشتی ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو بۆ هەڵسانەوەو سازدانەوەی شۆڕش دوای هەرەس و دوای کارەساتی هەکاری لەناوخۆی کوردستان بەرزکردنەوەیەکی ورەو پشت و پەنای جەماوەری گەلی کورد بوو لە کوردستانی عێراق لەو کاتە ناهەموارەدا، وە بەتایبەتیش گەیشتنەوەی بەڕێز مام جەلال لە ١٩٧٧/٧/٢٠و کردنەوەی ڕادیۆی

ڕهنگی گهلی عێراق و دهرکردنی پهیڕهوی ناوخۆی مهکتهبی عهسکهری ههمووی له بەرژەوەندی پێشکەوتنی بەرنامەکانی شۆڕشی نوێخواز بوو لەوکاتەدا کە هەموو ژیانی کورد لەبەردەم مەترسییەکی گەورەی لە ناوبردنی ژێردەستەڵات و بەرنامە ڕەگەزپەرستییەکانی ڕژێمی صەدام حسێن بوو کە بەئاشکرا هەنگاوی بەکردارو پڕ لەتوانای بۆ نابوو زۆر لێ براوانه، هەرچەند ئەم هەڕەشانەی ڕژێم لەم کاتەدا هۆکارێکی گەورە بوو کەچەوساندنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد بووبووە پەیامێك (رسالەیەك) بۆ ڕۆڵەکانی کورد کە وەکو پێویستی سەرشانیان ئەبێ خەبات بکەن و بەرگری لەخۆیان و لەمافەکانی گەلەکەیان بکەن بۆیە هەتا ئەهات ڕیزەکانی پێشمەرگە زیاترو ڕۆژانە پەیوەندی پێوە ئەکرا لەلایەن ڕۆڵە جگەر سۆزو بەهۆشەکانی ناو شارو دێهاتەکانی کوردستان و هێزی پێشمەرگە گەشەی ئەکرد هەتا کۆتایی ساڵەکانی حەفتاو سەرەتای ساڵەکانی هەشتا لەمێژووی شۆڕش و بزووتنەوەی کوردایەتیدا بەتایبەت لەبەردەم شۆڕشی نوێخوازی (ی.ن.ك) کەوتە ڕۆڵ و هەنگاوی بەرچاوی ناو گۆڕەپانی خەباتی ئاشکرا لەکوردستانداو ئینجا هێزی پێشمەرگە کەوتە قۆناغێکی تازەی خەبات بۆ ئاست و شێوەی پەلامارو هێرش بۆ سەر بنکەو بارەگاو سەربازگەو دام و دەزگاکانی، بەڕاستی گەیشتنەوەی هەڤاڵ مام جەلال ئومێدو گوڕو تینێکی تەواوی دا بەهێزی پێشمەرگەو جەماوەری خەڵکی کوردستان لەشار و دێکاندا.*

## هەڵبژاردنی ئەنجومەنی دێکان و یەك پرۆسەی ئازاد:

گوڕزێکی کاریگەر بوو بۆ لێدانی دەزگا داپلۆسێنەرەکانی ڕژێم لە هەر شوێنێکی کوردستان، وە بە بەرنامەی پێشکەوتوو هێزی پێشمەرگە بوو بەخاوەنی بنکەو بارەگای خۆی و شوێنی ڕزگارکراو لەناوچەو سنورێك دێهاتی جوانی کوردستان و دانیشتوانی ئەم سنورە ئازادانە لەژیانێکی زۆر خۆشحاڵداو خۆیان بە خاوەن ئەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو کاتێك ژیانیان لەمەترسی و هەڕەشەی لێدان و بەردەم تۆپی دوور هاوێژو شاڵاوی کتوپڕی سەربازی و لێدانی فڕۆکەدا بوون بەخۆیان و خێزانیانەوە چەندەها قوربانیان ئەدا بەڵام شانازیان بەو ژیانەی بەردەم دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەوە ئەکرد نەك ژیان لەناو کۆمەڵگا زۆرەملێکان کە ڕژێم بەزۆر خستبوونیە ناوی دوای تێکدانی دێهات و ڕەزو باخەکانیان و لەناو دەسەڵات و فەرمانی نابەجێی پیاوو سیخوڕەکانی خۆیاندا بەکاریان ئەهێنان، لەیەکەم پرۆسەی هەڵبژاردنی دێکان لەسنورە ئازادکراوەکاندا لەبەرامبەردا

---

*بۆ ئەمە سوود لە ئەدەبیاتی کۆمەڵەی وەرگیراوە.

دانیشتوانی ناو دێهاتە ڕزگارکراوەکانی بەردەم هێزی پێشمەرگە خاوەنی مافی خۆیان بوون هەتا لەم کاتەدا یەکەم پرۆسەی هەڵبژاردن بۆ نوێنەری خۆیان لە هەر دێیەکدا لەسەر دەستی شۆڕشی (ی.ن.ك) هاتە کایەوە بەهەڵبژاردنی (ئەنجومەن) بۆ کاروباری داواو پێویستی دێکانیان بەئەوپەڕی سەربەزی بۆچوونی جیاوازو حزبایەتیەوە بەڵام لەم کاتانەشدا لەساڵەکانی ١٩٨٠ هەتا کۆتایی ١٩٨٣ دەردە کوشندەکەی گەلی کوردو میکرۆبە نەگریسەکەی ناو بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکانی هەر بەردەوام بوو کە ئەویش (شەڕی ناوخۆو براکوژی)و ململانێی خوێناوی لەناو جەستەی پێشمەرگەو هەناسەی گەلی کوردا بەردەوام بوو دەماو دەم لوولەی چەکیان ئەکردە یەکتریو چەندەهایان لەڕیزەکانی خەباتی هاوەبەستیان لە دەست گەلەکەیان ئەداو سەنگەری بەرگریان لەهێرشی دوژمنی داگیرکەر بەخوێنی خۆیان سوور ئەکرد لەناو ئەو پێشمەرگەو کادرە سیاسیو عەسکەریانەی ئەو سەردەمانەدا لەهەموو لایەنەکان کە بەدەستی یەکتری لەناوچوون وەکو ئەم پێشمەرگانە ملەیادە: غفور دەرەشیش پێشمەرگەی (ی.ن.ك) و (جەمال مەلا عەلی وەلەسمت) پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستان کەپێش چەند ساڵێك پێشمەرگەی (ی.ن.ك) بوو، جمال عەلی باپیر فەرماندەی هەرێم، شێرکۆ شێخ عەلی، شەهید شەماڵ (شێخ محمد)ی باخ و جەبار مەلا غەنیو ٧ پێشمەرگە لە ١٩٧٦/٨/٢٠ و حەمە غەفور ئاغجەلەریو ئەنوەر کەریم و ئەحمەد محەمەدو عبدالله تۆفیقو حەمید عەزیزو ڕەمەزان سەعیدو ڕەزا عومەر لە ١٩٧٧/٧/٢٣ ملازم حسن خۆشناو و باهر ئەحمەدو کمال محمد حسێنو نەجات نورالدینو عەلی کوێخا هۆمەرو خدر ئەحمەدو عبدالملك بەرزنجیو سەرهەنگ عەزیز چەرکەییو خالدو حسێن کە کوردی خۆرئاوایی بوون، لە ١٩٧٧/١٠/١٢ شەهید کران.

تێبینی:- خۆزگە هەموو لە دەستچووەکانی هەموو لایەنە کوردەکانم ئەزانی لەو پێشمەرگەو ڕۆڵە جگەر سۆزانەی لەشەڕی ناوخۆدا ڕۆیشتوون کە زیانی گەورە تەنها بۆ گەلی کوردو شۆڕشەکەی بوو جگە لەچەندەها شەهیدانی سەکردەو فەرمانەدەی دیاری.*

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز دکتۆر موشیر.

## یەکگرتنەوەی هێلەکانی ناو (ی.ن.ك)

دوای ئەوەی جاڕی شۆڕشی نوێخواز درا بەگوێی جەماوەری گەلی کوردا لەمێژووی (١٩٧٦/٦/١) لەدوای یەك سالی دامەزراندنی ڕێکخستنەکانی بەناوی (ی.ن.ك) لەو سێ بالە سەرەکیە کە بریتی بوون لە :-

١- کۆمەلەی مارکسی لینینی کوردستان کەدوایی گۆڕا بە کۆمەلەی ڕەنجدەرانی کوردستان.

٢- بزووتنەوەی سۆشیالستی کوردستان کەدوایی بەیەکێتی شۆڕشگێرانی کوردستان.

٣- هێلی گشتی لە کەسانی دیارو کورد پەروەردەو شۆڕشگێڕ پێك هاتبوون.

لەمێژووی (١٩٨٢) و لەکۆنگرەیەکدا هەردوو هێلی بزووتنەوەو هێلی گشتی بە یەکگرتنیان (ی.ش.ك) یان پێکهێنا بەم جۆرە ئەم دوو ڕێکخستنە بەدروشمی کوردستانیو لەیەك سەنگەردا درێژەیان بەخەباتی پێشمەرگایەتیو یەك سەنگەریدا هەتا سالێك دوای ڕاپەڕینو بەناوی کۆنگرەی یەکەم لەبەرواری ١/٢٧ بۆ ١٩٩٢/٢/١٤ هەردوو ڕێکخستنەکە بڕیاری حەل بوونیان لەناو خۆیان داو بەگشتیو ئەو یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانیان بڕیاردا وەکو یەك ڕێکخستنو یەك ستراتیج و یەك مەبەستو یەك دروشم و خاوەن یەك بەرنامەو پەیڕەوی ناوخۆ کە لەماوەی خەباتیشدا هەر بەناوی (ی.ن.ك)ەوە هێزەکانی پێشمەرگەو شۆڕشەکە لەناوەوەو لەدەرەوە ناسرا بوو، هەرچەندە یەکێتی شۆڕشگێڕانی کوردستان بەدەستپێشخەری خۆی پێشنیاری یەکبوونی خستە بەردەم سەرکردایەتی ئەویش لەکۆبوونەوەی فراوانی دا لە ١٩٨٩/٦/١ لەناو زەنگ نزیك قاسمە ڕەشدا، وە ئەو کەسانەیش کە لەسەرەتای سالی ١٩٧٦ ەوە ئەچوونە دەرەوە بۆ سازدانی شۆڕشو پێکهاتەی یەکەی هێزەکانی پێشمەرگەیان لەسنورە جیاجیاو دوورەکاندا پێك ئەهێنا بەشێوەو جۆری دەستەی زۆر بچوك بچوك بوون و بەزۆریش لەکەسانی دیاری و باوەڕ پێکراو بوون یان بە تەزکیەو پشتگیری ڕێکخستنەکانی نهێنی ناو شارو شارۆچکەکان بوو کە زیاتر لەناو شاری سلێمانیەوەو بەسەرپەرشتی مامۆستا جەمال تایەر بوو بۆ ماوەیەکی زۆرو سەختی خەباتی ئەو کاتە.*

---

* چاوپێکەوتن لەگەل بەرێزان رابەر سەد برایم، دکتۆر موشیر.

**دیاری کردنی سنوری هەرێمەکان :**

هەرچەند پێشمەرگە پێکەوە بەدەستەی پێشمەرگە سەرەتاییەکان ناسرابوو، ئەبوایە شارەزایی لەئەزموونی شۆڕش و شەڕی پارتیزانی بەدەست بهێنایە بەخوێندنەوەو بە کرداری ڕۆژانەو لە سەرەتاشدا خۆناسینی شۆڕشبوو بە جەماوەرو سەرقاڵ کردنی دوژمن بوو بە هەموو دامو دەزگا داپلۆسێنەرەکانی ڕژێمی داگیرکەر کە لەو کاتەدا بەهەموو هێزی مرۆیی و عەسکەری و دەستەی تایبەت و ئەمنی و هێزی تایبەت و أستخبارات و سیخوڕو بلاوکردنەوەی یەکەی سەربازی بۆ هەموو سنوورو لوتکەی شاخەکان و شوێنە دوورەکانی کوردستان هەتا مەرزەکانی ئێران و عێراق، ئەو پەیمانە پشتێنە ئەمنیەش کە لەنێوان هەردوو ڕژێمی صدام و شای ئێراندا بوو بەپشتیوانی و هاوکاری و بەکارهێنانی ڕۆژانە دەها کۆپتەر بەجۆرەکانیەوە جگە لەهەموو جۆرە فڕۆکە جەنگیەکان و جۆرەها دەبابەو مصفحەو تۆپ و هاوەن و ترساندن و تۆقاندنی جەماوەری دێهات نشینەکان کە بەهیچ جۆرێك هاوکاری و بەدەمەوە چوونی ئەم دەستە پێشمەرگانە نەکەن، هەرکاتێك ئەگەر نانێکیان لە دێیەکدا بخواردایە لەشەودا بەپەلەو هەر لەماوەیەکی کەمدا ئەبوایە چەندەها دێ و چەندەها کیلۆمەتر دوور بکەوتنایەوە بەڕێ ونکردن و چەواشەکردنی خەڵکەکە، هەتا ئەگەر هێزی ڕژێمیش زانیاری وەرگرتایە بەئاسانی نەیدۆزینایەتەوە کە لەو سەرەتایەدا ئەبوایە مختاری دێکان وەکو ئەمر ڕۆژانە هەواڵی بگەیەنایە نزیکترین ئیدارەی ڕژێم لە ئەمن و استخباراتی و عەسکەری لەو سنورەدا، لەگەڵ ئەم هەموو ئەزموونە پڕ تاڵەو ناهەموارەیشدا دەستەکانی پێشمەرگە هەتا ئەهات بەرەو زیادی ئەڕۆیشت و ئەندامەکانی پێشمەرگەیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر قاڵبووی ئەم ئەزموونەو جۆری خەباتە شۆڕشگێڕیە پڕ لەمەینەتیە ئەبوون و سەرکردەی بەتواناو چاوکراوەو بەئەزموونیان تیا هەڵئەکەوت کە تواناو گیانی خۆڕاگری و هەستی شۆڕشگێڕی و پەیمانی درێژەدان بەخەبات و ورەیان زۆر زیاترو سەرکەوتوتر ئەبوو بەسەر ئەو هەموو هێزو سامانە زۆرە عەسکەری و مادیەی دوژمندا، هەر بۆیە لەماوەی چەند ساڵێکی کەم وەکو قۆناغێکی پێویست بۆ سەرپەرشتی ئەم دەستە پێشمەرگانە ئینجا بڕیاری پێکهێنانی یەکەیەکی پێشمەرگایەتیەکاندا کە ئەویش ناوی (هەرێم) بوو لە سنورو ناوچە پێویستیەکانی کوردستان و بەگشتی ئەم هەرێمانەیان پێکهێنا هەریەکە بەناوی سنورێکەوە:-

١- هەرێمی یەك بۆ سنوری شارەزوور.
٢- هەرێمی دوو بۆ سنوری شلێرو پێنجوێن.
٣- هەرێمی سێ بۆ سنوری ماوەت.

٤- هەرێمی چوار بۆ سنووری دۆڵی جافایەتی.
٥- هەرێمی پێنج بۆ سنورەکانی قەرەداغ و گەرمیان.
٦- هەرێمی شەش.
٧- هەرێمی حەوت بۆ سنووری باڵەك.
٨- هەرێمی هەشت بۆ سنووری دەشتی هەولێر.
٩- هەرێمی نۆ دۆڵە ڕەقە.
١٠- هەرێمی دە بۆ پارێزگای سەرکردایەتی لە ناو زەنگ.
١١- هەرێمی یانزە بۆ سنووری ڕەزگەو مارە دوو.
١٢- هەرێمی دوانزە بۆ ناوچەی سۆران.
١٣ هەرێمی سیانزە بۆ مەلەکان و گەرەوان.
١٤- هەرێمی چواردەی ئاکۆ بۆ سنووری پشدەرو هەتا نزیك هەیبەت سوڵتان.

پێکهێنانی ئەم هەرێمانە هەتا ١٩٨٠/٣/١٥ بە تەواوی جێگیر بوونو ڕۆڵی سەرەکیو ناوی دیارو سەرکەوتوویان پەیداکرد وەکو یەکەیەکی هێزی پێشمەرگەو دەنگدانەوەی شۆڕشی نویٚ خواز بەسەرپەرشتی دەستەکان، پێشمەرگەو گۆڕینی قۆناغی پارتیزانی بۆ قۆناغی هێرش و دەست وەشاندن لەهێزو دەزگای ڕژێم و ئەنجامدانی چالاکی لەوکاتەدا ڕۆڵێکی کاریگەری بینی لە بەرزکردنەوەی ورەو ئاواتی جەماوەری گەلی کوردو دڵخۆشکردنەوەیان بەشۆڕشی نوێخوازدا بەتایبەت بۆ بەرگری کردن لەهێرشەکانی سیاسەتە چەپەڵەکەی ڕژێم لە دەرکردنو ڕاگواستنو کوشتنو بڕینی ڕۆڵەکانی گەلی کورد، لەم ساڵانەدا سەرتاپا خاکی کوردستان بەهەموو شوێنو ناوچەو دێهاتەکانیو شارو شارۆچکەکانیانەوە لەلایەن ڕژێمی بەعسی داگیرکەرو سەرکوتکەری کوردستان بەپێکهێنانی چەندەها دەزگاکانی داپڵۆسێنەرو نامرۆڤانەی جۆراو جۆر کوردستانیان کردبووە گۆڕەپانی ئەنجامدانی ڕۆژانەی چەندەها کارەساتی دڵتەزێن مەگەر هەر لەخۆڕاگری گەلی کوردی هەژاردا بوونێت نموونەیەك لەوانە لەناو هەزارەها لەو کارەساتە دڵتەزێنو دڵ هەژێنانەی ناو مرۆڤایەتی کارەساتی شەهیدبوونی تاقە ڕۆڵەی پورە (ڕابیعە محمد صالح)ی لە دایك بووی ١٩١٧ ی دێی عەسکەر بەناوی شەهید (فەرهاد) لەماوەی دوو هێرش ڕژێم بەهەموو هێزو چەكو تەقەمەنیەکانیو بەکارهێنانی چەندەها فڕۆکە لەڕۆژانی (١٩٨٠/٧/١٩) لە کاتژمێر ٤٥ر٦ ی ئێوارە کە لەم بەرگریەدا کاکە فەرهادی تاقانە بریندار بووەو لەهێرشێکی هەمان شێوە لەڕۆژی (١٩٨٠/١٢/٢٢) لە کاتژمێر ١٥ر١٠ ی بەیانی بە هاوکاری ٣ کۆپتەر کە زۆر بەداخەوە لەم بەرگریەدا کاکە فەرهادی تاقانەی

پورە ڕابیعە دوای جارێکی تر بریندداری سەخت شەهید ئەبێت لەگەڵ دوو هاوڕێدا بەناوی (شەهید وەهاب سەعیدو شەهید عوسمان دووشیوانی) کاتێك پورە ڕابیعەی پشت کۆماوە بە کۆڵێك نانەوە دێت بۆ هەواڵی کورەکەی، پێشمەرگەکان نازانن چۆن هەواڵی شەهیدبوونی پێبڵێن هەتا خۆی لە بن دارێکدا تەرمەکەی ئەبینێو بەلاواندنەوە سەری ئەخاتە سەر ڕانیو تێر فرمێسك ئەڕێژێ بەسەریداو ئینجا ماڵئاوایی لێ ئەکاتو لاشەکەی ئەنێژن لەنزیك دێی عەسکەری نیشتمانی باوو باپیرانیانەوەو کاتێکیش سەر لەئێوارە پێشمەرگەکان بەرەو دێکە بەرزایەکەدا ئەچنە خوارەوە بۆ دێی عەسکەر کاکە (شاهێنی) کوڕی شەهید فەرهاد لەناو هاوڕێکانیدا هەروەکو جاران چاوەڕێی بینینی باوکی ئەبێت بەڵام ئەمجارەیان دیار نابێت بەچاوی پڕ فرمێسكو قوڕگی پڕ لە هەنیسکەوە ئەڵێ ئەبێ ئیتر باوکم نەبینم، بەمجۆرە بە هەزارەها کاکە شەهێنی منداڵ بێ ناز بوو لەخۆشەویستیو سەرپەرشتی باوك و چەندەها دایك و باوك و ژنی هەژار لەتەمەنێکدا نازیان لە ژیان دڵشکاو بوون لەم کوردستانەدا.*

### دروست بوونی مەڵبەند و تیپ:

ئەو تیپانەی کە لەئاستی پێکهاتەی یەکەی پێشمەرگایەتیدا دوای هەرێمەکانو بۆ چوار مەڵبەندەکەی سنووری دیاریکراوی خۆیان دروستبوون لەساڵی ١٩٨٢ هەتا ڕاپەڕین بەزۆری ئەمانە بوون مەڵبەندەکانیش بەناوی ژمارە (١-٢-٣-٤) بەسەر ناوچەکاندا دیاریکراو یەکەکانیش بەگشتی ئەم تیپانە بوون:-

١- تیپی (١١)ی هەورامان لەسنوری چالاکی هەورامانو هەڵەبجەی شەهید بوو بە فەرماندەیی تیپ شەهید قادر کۆکۆیی.

٢- تیپی١٢ی سۆران.
٣- تیپی ١٥ی شارەزوور.
٤- تیپی ١٧ی زمناکۆ.
٥- تیپی ١٩ کۆرەك.
٦- تیپی٢١ی کەرکوك.
٧- تیپی ٢٣سورداش.
٨- تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان.
٩- ٢٧ی تۆکمە.
١٠- تیپی ٢٩ی کەلکە سماق.
١١- تیپی ٣١ی سلێمانی.
١٢- تیپی ٣٣ی پێنجوێنو دوایی لە ساڵی ١٩٨٧ تیپی ٣٣ی سورێن دروست بوو.
١٣- تیپی ٣٧ ی شارباژێڕ.

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێزان رابەر سەید برایم، دکتۆر موشیر.

١٤- تیپی ٣٩ خنجەرە بەناوی شاخی خنجەرەی قەرەداخ و بەرپووی شارەزوور ئەم تیپە لەساڵی ١٩٨٧ پێکهات بۆ لالە سەرحەدو شەهید کەریم موریاسی جێگری بوو بنکەی لەدێی سۆڵەی قەرەداغ بوو.

١٥- تیپی ٤٣ ی ئاسۆس. ١٦-تیپی ٤٤ ی چەکوچ.

١٧- تیپی ٤٧ی پیرەمەگرون. ١٨- تیپی ٥١ ی گەرمیان.

١٩- تیپی ٥٣ ی شێروانە.

٢٠- تیپی ٥٥ قەرەداخ بنکەکەی لە دێی دوکانی قەرەداخ بوو دواکات شەهیدان حەمە سەعید سێ تەلانی و مەلا ئەحمەد گەرمیانی سەرتیپی بوون وەکاك ئاسۆ شێخ نوری و مامۆستا عوسمان کانی پانکەیی بەرپرسی هەردوو رێکخستن بوون هەتا ئەنفالە بەدناوەکانی رژێم.

٢١- تیپی ٥٧ ی سەگرمە. ٢٢- تیپی ٥٩ ی حەمرین.

٢٣- تیپی ٦١ی کۆرش. ٢٤- تیپی ٦٣ ی جوتیاران.

٢٥- تیپی ٦٥ ی بلفەت. ٢٦- تیپی ٦٨ی مامەندە.

٢٧- تیپی ٧٤ ی باڵەك. ٢٨- تیپی ٧٨ی کاروخ.

٢٩- تیپی ٨٣ ی هەورێ. ٣٠- تیپی ٨٥ ی بەرانەتی.

٣١- تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر. ٣٢- تیپی ٨٧ ی قەرەچوغ.

٣٣- تیپی پارێزگاری. ٣٤- تیپی ٩١ ی سەفین.

٣٥- تیپی ٩٢ ی کۆیە کەلە سەرەتادا ٩٣ ی کۆسرەت بوو.

٣٦- تیپی ٩٩ ی بێتوێن. ٣٧- تیپی ٤٩ی سارا.

٣٨- تیپی ٥٦ی گەلاڵە.

٣٩- تیپی ٢٥ی کورە کاژاو لە ساڵی ١٩٨٧ پێکهات لە قەرەداخ بۆ کاکە حەمە مۆریاسی دوایی چووە سنوری ناوچەی شلێری پێنجوێن دێی بایەلان.

هەروەها هەر مەڵبەندە تیپێکی هەبوو بەناوی تیپی تایبەتی مەڵبەند لەوانە:

١- تیپی تایبەتی مەڵبەندی یەك لە قەرەداخ بەرپرسی چەکە قورسەکان بوو هەتا راجیمەی بچووك بارەگای لە دێی ئەستێڵی قەرەداخ بوو نزیك قۆپیەکەو کاك عەدنانی حەمەی مینە فەرماندەی بوو هەتا ئەنفالەکان.

٢- تیپی تایبەتی مەڵبەندی دوو: تیپی تایبەتی مەڵبەندی سێ.

٣- وە مەڵبەنـدی چـواری بادینـان جۆرێـك یەكـەی پێـشمەرگایەتی و كۆمیتـەی ڕێکخستنی پێك هێنابوو لە ساڵانی ٩٨٦ بەدواوە لە سەرپەرشتی شەهید ئازاد هەورامی و کاك حاکم عومەر ژاژڵەیی.

## پێکهێنانی کۆمیتەی ئاگر لەناو شاری کەرکوکدا:

شاری کەرکوك لەگەڵ ئەو هەموو بارودۆخە نالەبارو ناهەموارەی کە هەمیشە ڕژێمی داگیرکەرو دەزگا تایبەتیە داپلۆسێنەرەکانی لەناو شاری کەرکوك دا ئەنجامی ئەدا لەسەر جەماوەری گەلی کوردی نیشتەجێی ناو ئەم شارە لەهەموو شوێنەکانی تری کوردستان سـەختترو دڕندانـەتر، بـەڵام ڕۆڵـە بەجـەرگ و خۆڕاگرانەکـەی کـورد لەئاسـتی چەوساندنەوەکانیاندا بەتواناترو قاڵبوتر ئەبوون بۆ خەبات و گیانی بەرگری و هەستی کوردایەتیان بەپلەی پیاوەتی و مەردایەتی ئەزانی و هەر لەسەرەتای تەمەنی دانیشتوانی کورد لەم شارەدا خاوەنی بەرنامەی خۆسازدانی ڕێکخستن و وانەکانی خەباتی کوردایەتی بوون لەم پێناوەدا، لەساڵەکانی پێش هەرەسی شۆڕشی ئەیلول پێکهاتەی ڕێکخستنەکانی نـاو شـار لەلایـەن (لیژنـەی شـار)ەوە ئەچـوو بـەڕێوەو هـەڤاڵ کـاك فەرەیـدون عبـدالقادر سەرپەرشـتی ئـەکردن، دوای هـەرەس و گەڕاندنـەوەی کـادرو ڕێخـستنەکانی شـاخ و تێکەڵاوبوونـەوەیان لەئاسـتی بـاوەڕ بەیـەکتربوون و ڕێکخـستنەوەی خۆیـان لـەنێوان ڕێکخستنەکان و کادرەکانی ناو شارو شاخ کۆمیتەیـەکیان پێك هێنا بەناوی (کۆمیتەی ئاگر) هاوشانی بـەتین و بڵێسەی خۆڕاگری و بەردەوامی ئاگرەکەی بابەگوڕگوڕو ئاستی چەوساندنەوە سەختەکەی کورد لەم شارەدا، دوای چەند مانگێك و دوای هەرەس لەلایەن شـەهید (سیروان تاڵـەبانی)یـەوە سەرپەرشتی کراو بە هاوکاری دوو کارگێڕی کۆمیتەکە ئـەوانیش هـەڤاڵان: شـەهید ئـازاد هـەورامی و کـاك ئەحمـەد کرێکـار بـوون و لـە دەست پێکردنـەوەی شۆڕشـی نوێخـوازیش بەسەرپەرشـتی (ی.ن.ك) شـەهید سیروان تاڵـەبانی پەیوەنـدی کـرد بەشۆڕشـەوەو شـەهید ئـازاد هـەورامی بـوو بـە بەرپرسـی کۆمیتەکـەو لـە پەیوەنـدی کردنـی شـەهید ئـازاد هـەورامی بە شۆڕشـەوە ئینجا کاك ئەحمـەد کرێکار بوو بەرپرسـی کۆمیتەکـە، لەسـاڵی (١٩٧٧) بەمەبەسـتی زیـاتر جوڵانـدن و ئـەنجامی چالاکی و تـەمێ کردنـی هەنـدێ ئەڵقـە لـەگوێی ڕژێـم لـەناو شـارداو لـەم کاتـەدا (٣) سـێ مـەفرەزەی چـەکداریان پێـك هێنـا لـەناو ڕیزەکـانی ڕێکخـستنە بەتواناکانـدا لـەم بـوارەدا کـردوو ئـەو

---

[*] چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێزان شێخ جەعفەر قەرەداخی، مەحمود سەنگاوی، حامد حاجی خالید، رابەر سەید برایم،

مەفرەزانە لەلایەن شەهید (مەلا محی الدین حسێن) سورەوە سەرپەرشتی ئەکراو دوو فەرماندە مەفرەزەی جیایان هەبوو بەناوی: مامۆستا ڕەشاد حەمە ئەمین و ئەوی کەیان حەسەن حەمە عەلی کە بە حەسەنە خڕە ئەناسراو مەفرەزەکەی تریش لەلایەن سەید قادر بەکرەوە فەرماندەی بوو، وە بەگشتی لەڕێگای بەرپرسەکانیانەوە کاك احمد کرێکار ڕێنمایی پێویست و سەرپەرشتی ئەکران، هەتا هەندێ باری نائاسایی لەناو ڕێکخستنەکاندا دروست بوو ناچار لەبەر پاراستنی گیانی ڕێکخستنەکان کۆمیتەیەکی نهێنیان پێك هێنا بەسەرپەرشتی مامۆستا کاکەڕەش کە ناوە تەواوەکەی مامۆستا بەکر صدیق افندی بوو، دواییش لەئەنجامی هەندێ هەوڵدانی زیاتر بۆ چالاکی کردن و گۆڕانکاری لەمەفرەزەکاندا دەرکەوتن و هەست پێکردنیان لەلایەن دەزگای ئەمنی ڕژێمەوە و لەڕۆژانی (١٤-١٥-١٦-١٧/١٠/١٩٨١) زۆربەی ئەندامانی ئەم مەفرەزانە دەستگیرو زیندانی کران و لەناویاندا کۆمەڵێکیان دوای حوکمی لە سێدارەدانیان لەڕۆژی ١٧/١٠/١٩٨٤) ڕەوانەی زیندانی ئەبوغرێب یان کردن و هەتا ئێستا چارەنووسیان نادیارو بێسەرو شوێنن کە ئەوانیش ئەم ڕێکخستنە ئازاو چاونەترسانە بوون:-

١- اسعد عزیز (ڕیشە) خوێندکاری زانکۆو ئەندامی کارگێڕی کۆمیتەکە بوو موالید ١٩٦٠، امام قاسم/ کرکوك.

٢- مەلا محی الدین حەسەن سوور بەرنوێژو ووتارخوێنی مزگەوتی ئیمام قاسمی کرکوك.

٣- فاروق قەمبوور (فاروق عمر وەلی) لەساڵی (١٩٥٧) لەگەڕەکی ئیمام قاسمی کرکوك لەدایك بووە.

٤- فهمی ئەمین ڕەشید لە دایك بووی (١٩٥٥) ی ئیمام قاسمی کەرکوکە.

٥- قادر سەید بەکر لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٣)ی پیریادی کەرکوکەو برایەکی لە سێدارەدراوە.

٦- مەلا ڕەشاد حەمەئەمین لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٦) ئیسکانی کەرکوکەو دەرچووی خانەی مامۆستایانە.

٧- جەنگی نجم الدین نوری لەدایکبووی ساڵی (١٩٦٥)ی زێوێی ئیمام قاسمی کەرکوکە.

٨- حەسەن حەمە عەلی (حەسەنە خڕ) لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٤)ی ئیسکانی کەرکوکە.

٩- جبار صالح فرج لەدایکبووی ساڵی (١٩٥٧)ی گەڕەکی ئیمامی قاسمی کەرکوکە.

١٠- فەرهاد محمد سەعید لە دایکبووی ساڵی (١٩٦٥) گەڕەکی پیریادی شاری کەرکوکە.

وە لەگەڵ ئەمانەداو هەر لەو سەردەمەدا چەند کەسێکی تری ڕێکخستنەکان گیران بەڵام دوای چەند مانگێك ئازاد کران کە ئەوانیش ئەمانە بوون :-

١) مام حەمید/ مام حەمید زەنگەنە، مام حەمیدی گومرگ ناسرابوو لەناو شۆڕشدا.

٢) حاجی حەبیب ٣) کرمانج محمد ٤) سعدالله ٥) ڕەشید مەجید حەسەن

٦) محسن مام عومەر (ڕەنجە مام عومەر)و هەتا نزیکەی (٥٠) کەسی ئەندامی ڕێکخستن گیران لەوانە (١٠) حوکمی لەسێدارەدانو (١٥) پانزە کەسیش بێسەرو شوێن کران.

دوای ئەمانیش مامۆستا (کاکە ڕەش) بەگیانێکی پڕ لە هەستی شۆڕشگێڕیەوە لەئاستی بەرپرسێتی کۆمیتەی ڕێکخستنە نهێنیەکەیەوە چالاکانە کەوتە کارو ئیش کردن لەگەڵ هاوکاری هەردوو کارگێڕی کۆمیتەکە بەناوی: (سعد عزیز، عمر محمد) بەڵام فەرمانی گرتنی مامۆستا کاکەڕەش دەرچوو لەلایەن پیاوەکانی ڕژێمەوە لەبەرئەوەی مامۆستا کاکە ڕەش لەدەرەوەی شاری کەرکوك بوو لەوکاتەدا توانرا هەواڵی بدەنێو دەربازی بکەن لەچنگی ڕژێم و گەیاندیانە ناو هێزی پێشمەرگە لەسنوری گەرمیان، پیاوە دڵ پڕ لەڕقەکانی ڕژێمیش لەتۆڵەی دەربازبوونی مامۆستا کاکە ڕەش دا لەدەستیان یەکسەر هەردوو برای خاوەن خێزان لەناو خۆشی تەمەنیاندا دەستگیرو زیندانیو بێ سەروشوێن کران کە ئەوانیش کاکە حەمە زەکی برا گەورەو وەستا فەهمی ئاسنگەر برای دووەم و دوای ئەمانیش دەستیان گرت بەسەر هەموو ماڵو خانوو سامانو دووکانەکانیانداو بەسەڵتی دایكو باوکیان خستە ناو سەیارەیەکی ئیڤاوە لەدواوەو لەشار دەریان کردن لەساڵی ١٩٨٤ بۆ سنووری پێشمەرگە، لەو تەمەنیاندا زۆر مەردانەو خۆڕاگرانە بەئەوپەڕی قەناعەتو شانازیەوە بەنهێنی لەسلێمانیدا ژیان هەتا ڕاپەڕین بەڕاستی هەر لەتوانای ئەو دایكو باوکەدا بوو.*

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێزان ئەحمەد کرێکار، مامۆستا کاکە ڕەش.

# بارودۆخی جهماوهری گهلی كوردو شۆڕشه نوێخوازهكهی لهنێوان ساڵهكانی ۱۹۸۰ بۆ كۆتایی ۱۹۸۲

## هاتنه پێشهوهی راپهڕینی خوێندكاریی

لهڕووی هێزی پێشمهرگهو پێكهاتهوه ههر لهئاستی ههرێمو دهستهو كهرتی پێشمهرگایهتیو دروستكردنی ناوچه بۆ سهرپهرشتی كارهكانیانو ئیش و كاری جهماوهر پێكهێنرا بوو بهپێی سنورهكان، له كادره لێهاتووهكانی ناو ڕیزهكانی ڕێكخستنهكانی ناو یهكێتی بهپێی ئاستی پلهو توانایان.

وه لهناو جهماوهری شارو شارۆچكهو دێهاتهكاندا پهیوهندی بهڕیزهكانی ڕێكخستنو جۆشدانی جهماوهر زۆر لهبرهودا بوو، تهنانهت وره‌ی جهماوهر وهكو هێزی پێشمهرگه كهوته خۆدهرخستنو پهلامارو راپهڕینو خۆدهرخستن لهناو جهرگهی شارهكانداو ڕقی خۆیان تهقاندهوه بهڕووی پیاوهكانی ڕژێم بێترس، لهبهردهم ئهو دهزگا داپڵۆسێنهرانهی كوردستاندا بهگشتی ههموو چینهكانی جهماوهرو بهتایبهتیش خوێندكاران ڕۆڵێكی زۆر گهورهو بهرچاویان بینی لهناو ئهو چالاكیه خۆدهرخستنانهدا ڕاپهڕینی شاری پێنجوێن بوو كه زۆر مهردانه بههاوكاریو ڕێنمایی ڕێكخستنهكانو هێزی پێشمهرگهی ئهو سنوره لهڕۆژی ۱۹۸۰/۷/۱۸ بۆ ماوهی سێ ڕۆژ بهردهوام شاری پێنجوێنو دهورو بهرهكهی گرتهوه چۆكیان بهدهسهڵاتی ڕژێم دادا ههتا ڕژێمی عێراق بههێزێكی سهربازی زۆرو زرێ پۆشو ههموو چهك و تهقهمهنیو تهنانهت چهند فڕۆكهیهكی بهكارهێنا بۆ لێدانی جهماوهری ڕاپهڕیووی شاری پێنجوێنو سنورهكانی دهوروبهریو لهم كاتهدا دهنگو سهنگێكی شۆڕشگێڕانهی بهنرخی ههبوو وه لهساڵی ههشتاكاندا بهتهواوی دێهاته سنوریهكان وێرانو داگیرابوون بۆ مجهمهعهكانو خهڵكهكهی بهزۆری خهریكی كاری قاچاخچێتی بوون بهتایبهت ئهوانهی سنورهكانی پێنجوێنو شلێرو بناری سورێن كه لهمجهمهعی شاندهری نزیك سهید سادقی شارهزوور بوون، لهئێرانهوه شتیان ئههێناو بازاڕێكیان دروست كردبوو لهگهڵ خهڵكی ناوچهكه بهڵام له ۱۹۸۰/۸/۱۷ ئهمانهیان لێ گیرا به كۆپتهر هێزیان بۆ دابهزاندو گوللهبارانیان كردن لهنزیك دێی (جۆمهرهسی) وێرانكراوی ناوشاخی سورێنی سنوری ئێران كه ههموویان خهڵكی هاوڵاتی كاسب بوون بهم ناوانه:-

۱- حهمهئهمین مارف شێخ سمایلی خهڵكی دێی شانهدهری گهوره.

۲- عهلی حهمهئهمین كه به عهلی عهرهب ناسراو بوو - - -.

٣- دارا حاجی ڕەشید حەمە ئەمین قازی.

٤- تۆفیق محمد عارف.

٥- ئەحمەد صالح خەڵکی دێی سەراوی سبحان ئاغا.

٦- بەکر عەلی خەڵکی دێی تووتاقاچ.

وە لەبیستنی ئەم هەواڵە ناخۆشە بەدانیشتوانی دێکان ڕاستەوخۆ ژنێك بەناوی (فەیمە احمد عارف) گیانی لەدەستداو هەر هەموو پێکەوە دوای ڕۆیشتنی کۆیتەرو سەربازەکان لاشەکانیان بەشەو هێنانەوەو لە ڕۆژی ١٩٨٠/٨/١٨ بە بەشداری جەماوەرێکی زۆری ئەو سنوورە لە گۆڕستانی شانەدەری سەروو نێژران، هەر ئەو ڕۆژە لە (١٩٨٠/٨/١٨) لەکاتژمێر (٠٤ ر١٢) لوغمێك لەژێر پێی سەربازێك لەڕەبیەکەی سەرگردەکەی کانی پانکە تەقیەوە بووە بارێکی ئاڵۆزو ناخۆش و گرتن و ئازاردانی هەموو خەڵکی ئەو دێهاتانەی لەلایەن ئەفسەری استخباراتی فەوجەکەوە بەناوی (کامل چاوشین) کە زۆر ڕق لە دڵ بوو بەرامبەر بە کورد، بۆ ماوەی چەند سەعاتێك هەموو گیراوەکانی لەبەر خۆرەکە بەستەوەو بەوپەڕی ناشرینی ئیهانەو قسەی بە کورد کردو لێرەدا ووتی کەس نەڵێت من پیاوی حکومەتم ئەوەتان کە پیاوی حکومەتە زۆر لەوەتان (ناپیاو ترە) لەوانی ترو کەسیشتان نەڵێن مامۆستاو فەرمانبەرین و شتی تر، کورد فەرقی نیە مهندس بێ یان جوتیار، هەمووتان (پیاوەکانتان) ئەکوژین و خانوەکانتان شۆفڵ لێ ئەدەین، کابرایەکی هەژاریش لە بەسراوەکان بەناوی حەمە جاف ووتی: ئەی ژنەکان بۆ نایەنن بیکوژن، ووتی با پیاوەکانتان بکوژین دوایی ژنەکانتان ئیشمان پێیانە، ئەمە بۆ مێژوو ئەنووسم خۆم بەرپرسم لێی کە یەکێك بووم لەگیراوەکان لەناو دڕکدا بەقاچی ڕووتی پێڵاوەکەم لەڕاونانەکانماندا پچڕاو بەجێما لێم لەبەر لێدانمان ڕامان ئەکرد ئەمە نمونەیەکی زۆر بچوکی ئاساییە بەراورد بەو هەمووە.

## دامەزراندنی دادگای باڵای شۆڕش:-

لە ڕۆژی (١٩٨٠/٨/١٧) لەناو زەنگ و تووژەڵە بۆ یەکەم جار بەشێوەیەکی ڕەسمی وەکو دادگایەکی باڵای شۆڕش دامەزرا لەم دادوەرە بەڕێزانە بۆ ئەنجامدانی کارو بەرنامەی یاسایی لەکوردستاندا:

١- حاکم پێشڕەو سەید ئیبراهیم

٢- حاکم ئیبراهیم حسێن کە هەتا ئێستا بەردەوامە لە خەباتداو ناسراوە بە (حاکم ئیبراهیم) وە لەلایەن خوا لێخۆش بوو کاك عومەر دەبابە (عمر مستەفا) ئەندامی (م.س) یەوە سەرپەرشتی ئەکراو لە سەرەتای ساڵی ١٩٨١ حاکم سوارە ڕەشید باجەلان کە

ناسراو بوو بە( حاکم عمر) لە بەغدادەوە گەیشتە ئەو سنوورەو پەیوەندی کرد بەدادگاوە، لەهەمان کاتدا (حاکم سەردار) عبدالکریم لە هەولێرەوە گەیشتوەو پەیوەندی کردووە بەهەمان دادگاوە، بەم جۆرەو بەم ئەندامە دادوەرانە دادگاکە بەردەوام بوو هەتا مانگی ۱۹۸۱/۲ وە لە مانگی ۱۹۸۱/۳ پێکهاتەی دادگا گۆڕا بەم شێوەیەی خوارەوە:

یەکەم: جەمال حەکیم ئاغا لە لایەن (م.س) یەوە دانرا بوو بەبرپرسی یەکەم و ئەندامەکانیش ئەم دادوەرانە بوون:

۱- حاکم ئیبراهیم حسێن

۲- حاکم فەرهاد مەلا ڕەسول وە (حاکم سەردار عبدالکریم) دادوەری دادگا بوون وە معاونی ئەفسەری پۆلیس (سمکۆ دزەیی) لێکۆڵەرەوەی (محقق) دادگابوو وە لە هەمان کاتدا کۆمیتەیەکی ئیداری‌و سەرپەرشتیاری بۆ سنورەکانی هەولێر دامەزراو لەسنوری ئەو کۆمیتەدا دادگایەك دامەزرا کە پێك هاتبوو لە:-

۱- حاکم شۆڕش

۲- حاکم ئیحسان وەلاش

۳- حاکم یوسف

ئەم دادگایە لەڕووی ئیداری‌و یاساییەوە بەسرابوەوە بەدادگای باڵای شۆڕشەوە، وە لەناوەڕاستی ساڵی ۱۹۸۲ەوە ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی ( ی.ن.ك) بە ئەندازەیەك زیادی کرد چیتر ئاسان نەبوو لەلایەن سەرکردایەتی (ی.ن.ك)ەوە بەئاسانی سەرپەرشتی بکرێت، بۆیە سەرکردایەتی (ی.ن.ك) بڕیاری دا کەچوار مەڵبەند دروست بکات بەم شێوەیە بە پێی سەرپەرشتی سنورەکانی:-

۱- مەڵبەندی یەك لە دێی حاجی مامەندی شارباژێڕ.

۲- مەڵبەندی دوو لە دێی سەرگەڵو.

۳- مەڵبەندی سێ.

٤- مەڵبەنی چوار لە سنوری هەولێر*.

---

* چاوپێکەوتن لە گەڵ بەرێز حاکم برایم.

## دەست پێكردنی چالاكی هێرش بردنە سەر دەزگاكانی رژێم و دەركردنی كوردە فەیلیەكان

چالاكیەكانی هێزی پێشمەرگە بەهێرش بردنەسەر دەزگاو سەربازگەكانی رژێم لە كوردستانی داگیركراودا بەجۆرێك و بەهەستێك پەرەی سەند كە لە چالاكیەكانی بۆ ناو شاری سلێمانی لە ١٩٨٠/٧/٢ سێ برا پێكەوە شەهید بوون كە ئەوانیش بریتی بوون لە (رەئوف و بەختیار و هۆشیار) عبدالله حەمە ئەمین دوای بەرگریەك و دەست وەشاندنێكی مەردانە لە ملازم محسین، هەرچەند دەزگاكانی رژێمیش هەمیشە لەپیلان و نەخشەدانانی خۆیان بەرامبەر بەگەلی كورد درێخیان نەئەكرد بەپارەو بە كرێ گیراوی، لەوانەیش شەهیدكردنی پێشمەرگەی دڵسۆزو ئازا كاك تایەری حاجی عەزیز فەرماندەی هەرێمی ٣ بوو لەسنووری شلێری پێنجوێن لە (١٩٨٠/١٠/١٢) دا لەم كاتەدا زیانێكی گەورەبوو لە كادرو هێزی پێشمەرگە، وە لەهەمان كردەوەی رژێم دژ بەگەلی كوردو پاكتاوكردنی رەگەزی لەناوجەرگەی شاری بەغداو دەووروبەری رژێم هەزارەها خێزانی كوردی فەیلی دەركرد بەسەلتی خێزانیو دەست گرتن بەسەر ماڵو سامانیاندا كە زۆربەیان بازرگانو كەسانی خاوەن سامانی ناوشاری بەغدا بوون ئەمە لە (١٩٨٠/٤/٦)دا ماڵ وێرانیەكی زۆر خراپ بوو بۆ گەلی كورد، لەم كاتە ناسكەی شۆرشداو هەمویان بەسەڵتە خێزانی رەوانەی ئێران كران لەسنورەوە زۆر نامرۆڤانە وە بەهەمان بەرنامەو پیلان لە ١٩٨١/٦/٢٥ دا. كادرو تێكۆشەری دێرینی كورد (سەیدا صالح یوسفی) لە بەغدا تیرۆر كراوە.

## پێکهێنانی بەرەی نیشتمانی دیموکراتی عێراقیو دروستبوونی شەڕی عێراقو ئێران

هەر لەم ساڵەداو لە (١٢/١١/١٩٨٠) بەرەی نیشتیمانی دیموکراتی عێراقی (جودق) دامەزرا کە چەند ڕێکخراوو لایەنێکی سیاسی عەرەبی عێراقیو نیشتیمانی کوردی تیا کۆبوویـوەوە لەبەرەیەکـدا بەرامبـەر بـەڕژێمی عێـراق کاریگەریـەکی خـۆی بینـی بـۆ یەکپارچەیی عێراقو کۆکردنـەوەی لایەنـە ئۆپۆزسیۆنەکانی بەرامبـەر بـەڕژێمی عێـراقو گەیانـدنی دەنگـی نـاڕەزایی گـەلی عێـراق بـە کـوردو عەرەبەوە بەدەرەوەی دنیا، هەرچەند ڕژێمـی عێـراق لـەم کاتـەدا کەوتـە شـەڕێکی قورسـەوە لەگـەڵ ئێرانـداو لـە ڕۆژانـی ٢٢،٢٣ /٩/١٩٨٠ لە سێ قۆڵەوە هێرشی کردە سەر ئێران بەهەموو توانای سەربازیو چەکێکیەوە کە ئێـران لەسـەرەتای دروسـت بـوونی حکومـەتی بـەناو ئیـسلامیدا بـوو بەڕابـەری ئیمـام خومـەینی هێرشـی عێـراقیش بەمەبەسـتی ڕاگرتنـی هـاتنی ئـەو بۆچوونە ئیسلامیەدا بـوو لەوکاتەدا لەئاستی مەترسـی تـەواودا بـوو بـەڵام سـەرکردایەتیو هێزی پێشمەرگە هـەر لـە چالاکیو داهێنانی خۆیدا بوو لەوانەو لە ٢/٨/١٩٨١ چالاکیەکی بەرچاو لـە گونـدی کـانی وەتمان ئەنجامدرا بەسەرپەرشتی شەهید (شەماڵ)ی باخ.

**دامەزراندنی تیپی هونەری شەهید کارزان لەشاخ:**

وە لـە ١/١٠/١٩٨١و بەمەبەسـتی پێشخـستنو دەرکـەوتنی ڕووی شۆڕشـی نوێخـواز لەهـەموو ڕوویەکـەوە بەتایبـەت ڕووی هونـەری بڕیـاردرا بەدامەزرانـدنی تیپـی مۆسـیقای شەهید کارزان لە شاخ، شەهید کارزان خوێندکارێکی لاوو تازە پێگەیشتووی جگەرسۆزی دایـكو بـاوكو گـەلی کـوردو شـاری سـلێمانی بـوو، کـە بەمەبەسـتی پێـشکەش کردنـی بەرنامەیەکی هونەری زۆر پێشکەوتوخواز لەو ڕۆژگارەدا بەرەو شاری هەولێر ئەڕۆیشتن لە کارەساتێکی دڵتەزێنی سەیارەدا بەخۆیو براکەیو چەند هونەرمەندێکی لاو برینداربوون ناونانی ئەم تیپە هونەریە لەشاخ لەگەڵ هەستو بۆچوونی جەماوەردا بوو لەهـەمان کاتـدا ئـەم تیپـە بـوو بەسەرچـاوەی داهێنـانێکی هونـەری شۆڕشـگێڕی زۆر بەرچـاو لەسـنوورە ئازادکراوەکـانی کوردسـتاندا، بـە پێـشکەش کردنـی بەرنامـەی بەسـوود هـەتا دوای

---

چـاوپێکەوتن لەگـەڵ بـەڕێز وەسـتا حمـە ئـەمین ئاسـایش، وەبەسـوود وەرگـرتن لـە ڕاگەیانـدنی ئەوکاتەی (ی.ن.ك).

ئەنفالەکانیش‌و لەکاتی ئاوارەیی ناو ئێراندا ڕۆڵی بەردەوامیان هەبوو، بەتایبەت لەناو شاری سەقز بووبوونە مایەی ڕاکێشانی سەرنجی جەماوەری کوردی ئێرانیش، بەپێشکەش کردنی شانۆگەری‌و کاری هونەری جوان.

## بەردەوامی ڕژێم لەکاری وێرانکاری:

وە لەناو بەرنامەکانی ڕژێم بەرامبەر بەوێرانکردنی نیشتیمانی گەلی کورد لە ١٩٨١/٨/٨ ڕژێم شارۆچکەی گەلاڵەو ئەو سنورانەی وێران کردو خەڵکەکەی گەیاندنە کۆمەڵگای سۆران، وە لە ١٩٨١/١٠/١٩ هێرشی کردە سەر ناوچەی شارەزوورو سنووری دێکانی شارۆچکەی سەیدسادق‌و لەم هێرشەدا پێشمەرگە بەرگری تەواوی لەو دێیانە کرد کە لەئەنجامدا ڕژێم بەزیانەوە گەڕایەوە بەلام پێشمەرگەی هونەرمەندی دوورە وولات لەم کاتەدا کاک کاوە حەمە صالح پێنجوێنی بەسەختی بریندار بوو بەهۆی ئەم کارەساتەوە نێررا بۆ دەرەوەی وولات ئێستا لە سویدە ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لەپێشکەش کردنی بەسۆزی بۆ نیشتیمانی کوردستان بەدەنگی خۆش‌و سیمای لانەوازەیی‌و لەدەستدانی هەردوو قاچی نموونەی ماڵ وێرانی گەلی کوردو ئەم بەرگریە لەدێی قاجری شارەزوور بوو.

## خۆپیشاندانە خوێندکاریو جەماوەریەکانی کوردستان

ساڵی ١٩٨٢ لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردمانو شۆڕشە نوێ خوازەکەمان کە بەڕاستی زۆر دانایانە پەروەردەو جۆش ئەدرا بەساڵێکی ڕاپەڕینو خۆپیشاندانو هەستانی جەماوەر لە مێژوودا تۆمارکراوە کە لەو ساتو وەختەدا هەڵسان بەڕووی دامو دەزگاو پیاوە بێویژدانەکانی ڕژێمی بەعسی صەدامو بە جەماوەرێکی بێ چەک بەلاَم خاوەن باوەڕی پۆلاَیین لەخۆی دا ڕووخاندنی دیواری سامو هەیبەتی ڕژێم بوو کە هەموو چینەکانی جەماوەرو لەهەموو شارو شارۆچکەو زۆر لە گوندەکان پەیوەندیان پێوە ئەکردنو بەشداریان ئەکردنو سەرقافڵەی ئەم خۆپیشاندانانە خوێندکارانی دواناوەندیو زانکۆکان بوو، دوایی ناوەندییەکانیش وە لە ١٩٨٢/١/٧ خۆپیشاندانی خوێندکارانی شاری سلێمانی دەستی پێکرد ئەم خۆپیشاندانانە بەڕێنماییو سەرپەرشتی کردنی ڕێکخستنە نهێنیەکان بوو کە لەم کاتەدا شەهیدی سەرکردە مامۆستا جەمال تایەر بەرپرسی هەموو ڕێکخستنە نهێنیەکانی کوردستان بوو بۆ جاری دووەم زیندانی کرابووەوە لەلایەن دەزگای ئەمنی سلێمانیو ژیانی زۆر لە مەترسیدابوو، بەهۆی ئەوەی کە بەتەواوی گومانی ئەوەیان خستبووە سەر لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمانیەوە کە مامۆستا جەمال بەرپرسی یەکەمی ڕێکخستنە نهێنیەکان، لەبەر ئەوە زۆر نامرۆڤانە ئازارو ئەشکەنجەیان ئەداو ئەم شەهیدە سەرکردەیە بەڕاستی سەرکردە ئاسا لە زیندانیدا بە پاڵەوانی خۆڕاگری ناو مێژوو دەرچوو، وە لەهەمان کاتدا لە ١٩٨٢/٤/٢٣ بۆ ١٩٨٢/٥/١٠ بەردەوام ڕاپەڕینو خۆپیشاندانی جەماوەر لەهەموو شوێنەکان دەستی پێکرد بێ سڵکردنەوە لەدام و دەزگای ڕژێم، لەناو شاری سلێمانی کۆمەڵێك خوێندکار گیرانو لە ناویاندا کچێکی دواناوەندی زۆر بەتوانا بەناوی (شیرین بایز قرەداغی) زۆر مەردانەو خۆڕاگرانە پێشرەوایەتی خۆپیشاندانەکانی ئەکرد، وە لە ١٩٨٢/٤/٢٩، وە لەناو بەرنامەی ڕژێم بۆ بەربەستی خۆپیشاندانەکان هەر لەشاری سلێمانی دەزگاکانی ئەمنی سلێمانی پەلاماری کۆمەڵێك کەسایەتی دیارو شۆڕشگێڕی داو خستنیە زیندان لەوانە: کەمال تایەری برای شەهید جەمال تایەر، کاکە حەمەی فەرەج قالە سوری هەڵەبجەیی، احمد کوردە، مامۆستا ڕەحیم ڕەمەزان، کەمال مەولود، قادر مەنمی، اسماعیل کەریم، جلال قەرەداغی یاریدەدەری پزیشکی، عبدالکریم خوێندکار، وە بۆ مێژوو مامۆستا محمود ڕەشید قەرەداغی بۆ دووەم جارگیرا پاڵەوانی دیاری ناو زیندان بوو کە دوو شەوو ڕۆژ

بەس هەڵواسرابوو، بەڵام خۆپیشاندانەكان هەتا ئەهات زیاترو گەورەترو فراوانتر ئەبوو بەجۆرێك كە دەزگاكانی ڕژێمی بەچۆكدا هێناو زۆر لە شوێنە دوورەكانی گرتەوە لەوانە لە ڕۆژی ١٩٨٢/٥/٣، خۆپیشاندان لە شارۆچكەی سەیدسادق و مجمعی شاندەری بەرپا بوو زۆر ئازایانە چوون بەگژ دام و دەزگاكانی ڕژێمداو پیاوەكانی ڕژێمیش بێ‌دەست پاراستن لێیان ڕووی چەكی تێكردن و لەئەنجامدا ئەمانە شەهید بوون:-

١- عەینا كەریم یارە خێزانی حەمە نوری گەرمیانی كە لەوكاتەدا كادرێكی چالاكی ڕێكخستنەكان بوو لەو سنورەدا زۆر بەهیممەت بوو.

٢- حەسەن مەلا ڕەحیم گرێزەیی خوێندكار.

٣- محمد حاجی صدیق قەدەفەری خوێندكار.

٤- گوڵچین حاجی محمود حاجی عەلی كانی ئاسكانی كە بەبریندارى برایە نەخۆشخانەی سلێمانی بەنهێنی، بەڵام پیاوەكانی ڕژێم پێیان زانی و لەسەر قەرەوێڵەكەی و بەبەرچاوی باوكی و سانیای خوشكیەوە درایە بەر گوللەی دەمانچەو ئەو كچە سیانزەساڵە دڵ پڕ لە هیوایە لەخۆشی ژیان كراو زۆر نامرۆڤانە شەهیدكراو هەڕەشەیان لێ كرا كە پرسەی بۆ دانەنرێ.

٥- محمد حاجی صالح لاوەلا كە كوڕی پیاوێكی دیارو كوردپەروەر بوو.

٦- حەیدەر احمد قەڵبەزەیی.

وە لە ١٩٨٢/٥/١ خۆپیشاندانی شارۆچكەی هەڵەبجە ئەنجامدرا، وە لە ١٩٨٢/٥/٧ بە شكاندنی تەواوی ڕژێم لەناو شاری كەركوكی پڕ لەبایەخی كوردستاندا خۆپیشاندان زۆر بەگەرمی و سەركەوتووپی ئەنجامدرا كە شەش شەهیدو ژمارەیەك بریندارىان بەخشی بەگەل و شۆڕشەكەیان زۆر مەردانە. وە لە ١٩٨٢/٤/٢٤ خۆپیشاندانی شارۆچكەی قەڵادزەو دەوروبەری هاوكات لەیادی هەشت ساڵەی لێدانی ناپاڵمی ڕژێم لە شارەكەیان و لەهەمان كاتدا بۆ هاوكاری و هاوسۆزی خۆپیشاندانەكانی كوردستان ئەم خۆپیشاندانانە شارۆچكەی ڕانیەو قەڵادزەی گرتەوەو بەڕێپوانێكی زۆر نەترسانە بەرەو مەزاری شەهیدان بەڕێكەوتن و ڕژێمیش كەوتە گوللەباران لێیان و لەئەنجامدا مامۆستا سنەوبەرو خاتوو ئامینە سوور شەهید بوون كە مامۆستاو ڕابەری خۆپیشاندانەكە بوون.

وە چەندەها كەسیان لێ گیران و زیندانی و برینداریكی زۆر، وە لە ١٩٨٢/٥/٩ شارۆچكەكانی ماوەت و خەلەكانی گرتەوە، وە لە ١٩٨٢/١١/١٦، خۆپیشاندانی خوێندكارانی زانكۆی صلاح الدین وە لە بەرامبەردا ڕژێم زیاتر لە ٥٠٠ خوێندكارو كەسانی تری گرت و زیندانی كران و بۆ لێدان و سەركوت كردنیشیان ٨ فڕۆكەی جەنگی

بەکارهێنا، بەردەوام لەو ماوەیەدا بەسەر ئاسمانی ئەو شارو شارۆچکانانەدا بوو، جگە لە هێنانی هەموو جۆرە دەستەو چەکداری تایبەتی دام و دەزگاکانی ڕژێم کە بۆ ئەم مەبەستانە مەشقی تایبەت کرابوون، بەهەموو جۆرە چەکێكو زۆر درندانە رەفتاریان ئەکرد بەرامبەریان، بەلاّم زۆر بەشانازیەوە ئەو هەموو هێزو چەك و رەفتارانەی ڕژێم بێئەنجام بوو هیچ کاری نەکردە سەر هێزە جەماوەریە ڕاپەریوەکەو بەپێچەوانەوە چۆکی بەدەسەلاّتی ڕژێم داداو لە بەرامبەردا تەسلیم بە ئیرادەی جەماوەر بوو بە لێبوردنێکی گشتی هەموو زیندانیەکانی ئازادکرد بەماموّستا جەمال تایەری سەرکردەوە، کە مەبەستێکی زۆر گەورەبوو بەڕزگاربوونی لەبەر دەستی ڕژێمداو ئەم لێبوردنە گشتیە لە (١٩٨٢/٧/١٤) ئەمە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەو دیاربوو بۆ جەماوەری ڕاپەڕیووی گەلی کوردو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتی بەتایبەت شۆڕشی نوێخواز بەسەرپەرشتی (ی.ن.ك)، لەم کاتەدا ئەوەندەی تر ورەی خەڵکی بەرزکردەوەو لەناو شارو شارۆچکەو دێکاندا وەکو ئاهەنگو شاییەك پۆل پۆل جەماوەر زۆر بەشانازیەوە پێشوازیو سەردانی زیندانییە ئازادکراوەکانیان ئەکرد بێ ترسو سڵ کردن لەدەزگاکانی ئەمنی ڕژێم، هەتا چەند ڕۆژێك ماڵەکانیان بەو جۆرە بوو بەتایبەت ماڵی شەهیدی سەرکردە ماموّستا جەمال تایەر کە زۆر ئەشکەنجە درابوو ماوەی ٤٠ ڕۆژ هەر لەناو سەردابی ئاودا دانرابوو بەو زستانە ساردە وە هەر لەدوای ئەم ئازادکردنە کۆمەڵێکیان پەیوەندی کرد بەسەرکردایەتی شۆڕشەوە لە پێش هەموویانەوە شەهیدی سەرکردە ماموّستا جەمال تایەر، کاکە حەمەی فەرەج، کاك أحمد کوردە، قادر مەنمی.

---

* یادەوەریەکانی نوسەر لەو کاتەدا، خوالێخۆش بوو کەمال تایەر کە خۆی زیندانی بوو لەو کاتەدا.

## لێبوردنی گشتی ڕژێم بۆ سەربازە هەڵاتوە كوردەكان لەناوچە ئازادەكاندا( ڕزگاركراوەكان )ی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە

وە لـەناو بەرنامـەو پیلانـەكانی ڕژێـم بەمەبەسـتی بـەرگری‌و لاوازكردنـی هێـزی پێـشمەرگە بەخەیاڵی خۆی‌و لە (١٩٨٢/٧/١٧) لێ بوردنی گشتی بۆ سەربازە هـەڵاتوەكانی كوردستان دەركرد، بەبۆنـەی یادی چەند ساڵەی بەناو شۆڕشی حزبی بەعس‌و چەند ساڵەی دەسەڵاتداریتی صدام حسێن بە سـەرۆك كۆماری عێراق كە لـە ١٩٧٨/٧/١٧ دا بوو بە لادانی سـەرۆكی پێشوو (احمد حسەن بەكر) لـەم كاتـەدا بەبۆنـەی شـەڕی عێراق و ئێران باوەڕ نەبوونی ڕۆڵەكانی گەلی كورد بەم شەڕەو بە سەركردایەتی حوكمی بەعس لە عێراقدا بەسـەدەهاو هـەزارەها سەربازی هـەڵاتووی كورد لە سنووره ئازادكراوەكانی بەردەست هێـزی پێشمەرگەدا بوون و زۆر بـە خۆشحاڵیەوە دڵنیا بوون لـەخۆیان‌و ژیانیـان‌و دایـك‌و بـاوك‌و كـەس‌و كاریـان هاوكاریـان ئـەكردن و زۆریەشـیان بـەخێزان‌و مناڵەكانیانەوە بوون، لەترسی گرتنی ڕژێم وە زۆریش لـەم سـەربازە هەڵاتوانە هاوكاری پێشمەرگەو ڕێكخستنەكانیان ئـەكردو هـەواڵ و زانیـاری و دەنگ و باسیان لـە سنورەكانی ڕژێمـەوە ئەگەیاند، بەهۆی هات و چۆی كەس‌و كاریان، ڕژێم بـەم لێبوردنـە گشتیە ڕێژەیـەكی زۆریـانی هێناوەو لەكارو سنووری هێزی پێشمەرگەی پچڕاندن، وە لە ساڵی ١٩٨٢ دا ڕژێمی ئێران هاوكاری چەكدارکردنی كۆمەڵێك خەڵكی كردبوو ژمارەی چەند سەد كەسێك ئەبوو، بەڵام لە سنورەكانی هێـزی پێشمەرگەدا بە ناوی ئیسلامی و مەترسی ئەخستە سەر سنورەكە بۆ هێنانی دەستی دەرەوە لـە بەرئـەوە بڕیاری چەك كردنیان درا لەلایـەن هێزی پێشمەرگەوەو لـە مـاوەی چەند ڕۆژێكی مـانگی ١٩٨٢/٧ كۆتـایی یـان پـێ هـات، بـەڵام بەداخـەوە فەرمانـدەی عەسـكەری هێـزی پێـشمەرگە كـاك صـلاح مهنـدس (خـەراجیانی) شـەهیدبوو لـەم چـالاكیەداو ئـەم تاقمـە بـەناو ئیسلامیە دروست كراوانـەی لـە سـێ دەوڵەتی دراوسێ كۆتاییان پێ هاتو زۆربەی جەماوەری ناوچەكە كەهاوكاری هێـزی پێشمەرگەیان كرد.

### داستانی قازان:

هەر لەو ساڵەیشدا بوو لـە ١٩٨٢/٣/٥ لـە داستانی قازان دا شـەهید ئـەنوەر حەسـەن كەركوكی فەرمانده بەخۆی و ١٠ پێشمەرگەی قارەمان و دڵسۆزەوە شەهیدكران لەوانە:-

((ڕزگار، عەبدولخالق (ئاسۆ)، عەبدوڵڵا چیا، سوارە، كامەران، كەریم گۆران، نـەعمان، حەمە شكور، نەجمەددین، سیروانە سوور)) وە لـە كۆتـایی سـاڵی ١٩٨٢و سـەرەتای سـاڵی ١٩٨٣ گەشەیەكی دیارو بەرچاو لە بزووتنەوەی كوردایەتی لە كوردستانی عێراقدا كەوتـە

بەرچاو لەڕووی ناوو چالاكی هێزی پێشمەرگەو دەست وەشاندن لە هێزەكانی ڕژێمی داگیركەرو گرتنی شوێنو جێگا لێی‌و فراوانكردنی سنوری ڕزگار كراو لەدێهاتو ناوچەكانی كوردستان كە ئەمانە هۆكارێكی سەرەكی بوو بۆ پێشكەوتنی هێزی پێشمەرگەو پێكهاتەی تازە لەدەستەو كەرتەوە بۆ تیپو هەر یەكەیەك لەسنوری چالاكی خۆیانداو لەم ساڵەدا تیپ و فەرماندەی تیپ ڕۆڵی دیاریان هەبوو.

## دەرکەوتنی تیپی پێشمەرگایەتی وەکو هێزێکی دیاری

یەکەی تیپو ف/ تیپ ناوو ناوبانگێکی زۆر سەرکەوتووی هەبوو لەناو هێزی پێشمەرگەو جەماوەری کوردستانو لەهەمان کاتدا ترسو سامێکی زۆری بوو بەرامبەر بەهێزەکانی ڕژێمی حزبی بەعس، چونکە ئەم فەرماندە عەسکەریانەی هێزی پێشمەرگە لەناو جەرگەی کارو چالاکیو خاوەن ئەزمونو توانایدا پلەیان وەرئەگرت، جگە لەسەرپەرشتی پێشمەرگە لەڕووی عەسکەریو ئیداریو پەروەردەییو بەکارهێنانیان لەکاتی هەڵمەتو چالاکی دا سەرپەرشتیان ئەکردن، وە لەدوای تیپ کەرت بوو کە بەچەند کەرتێك تیپێکی پێك ئەهێناو سنوری تیپەکەی بەسەردا دابەش ئەکراو لەکاتی چالاکی دا کەرت بەسەرپەرشتی فەرماندەکەی شوێنی تایبەتی خۆی وەرئەگرت، وە یەکەم گوللەی ئاربی جی لەسەعاتی سفرداو لەیەك کاتدا ئەبوایە لە شوێنی مەبەستی بدایەو ڕاستەوخۆ دەستەی هجومی بۆ دیاری ئەکرا لەگەڵ یەکەم لێدانی شوێنەکەو لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دوکەڵەکەدا ئەبوایە ئەو شوێنەیان کۆنتڕۆڵ بکردایەو لەیەکەم چوونە ناوەوەو نیشانەی گرتنو سەرکەوتن لەهەر بنکەو بارەگایەکی ڕژێمدا یەکسەر ئەو دەستە پێشمەرگە بەیەك سەلیەی گرداز ئەوە نیشانەی سەرکەوتنو خۆشی بوو، بەڵام ناخۆشیش لەوەدا بوو کە شەهید یان برینداری خراپ بدرایە چونکە لەناو هێزی پێشمەرگەدا خۆشەویستیەکی یەکجار توندو پتەوو برایانە هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە بەحەماسو هەستی شۆڕشگێڕی کار ئەکرا شەهید بوون زۆر ئاسایی بوو گرنگتریش ئەوە بەشانازیەوە کام دەستەو کەرتو تیپ زۆرترو ئازایانەتر شوێنەکەی دیاری کراوی خۆیان بگرن، خۆ مردن لەوەدا بوو کە نەگیرێت ئەو دەستەیە زۆر بەشەرمەزاریو هەست بەلاوازیەوە ئەگەڕانەوە، بە شەرمەوە خۆیان ئامادە ئەکرد بۆ چالاکیەکی تر کە هەقی بکەنەوە ئەگەر شەهیدیش بووبن. (پێکهێنانی مەڵبەندو بەشەکانی) بەم جۆرە لە ساڵی ١٩٨٣ یەکەی پێشمەرگە لە بەرفراوانی سنوری چالاکی هێزی پێشمەرگە وا بەچاك زانرا بۆ سەرپەرشتی سنورەکانی هەر تیپێكو سەرپەرشتیو چاودێری ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی لەسنورەکاندا مەیدانیین، تازەترین یەکەی مەڵبەند دروست بوو کە لە سەرەتادا ژمارەی چوار مەڵبەند بوو کە مەڵبەندی یەك لەسنورەکانی شارباژێڕو قەرەداغو گەرمیانو شارەزوورو هەورامانو پێنجوێنو شلێرو سنوری سلێمانی بەناو شاریشەوە، مەڵبەندی دوو سنورەکانی سەرگەڵوو بەرگەلو دۆڵی جافاتی کە ئەم سنورە بارەگای بەڕێز مام

جەلال و كاك نەوشیروان و (م.س)ی تیابوو مەڵبەندی ٣،٤ دوایی یەكخرابوو بەمەڵبەندی سێ لەسنوری دۆڵی بالیسان (خەتێ) بارەگاكەی و سەرپەرشتی سنوری تیپەكانی هەموو ناوچەی هەولێر هەتا بناری باڵەكایەتی ئەكرد بەناو شاری هەولێرەوە، هەموو مەڵبەندێك شوێنی بارەگایەكی خۆیان هەبوو، زۆر بەدیاری بەخانوو تیپێكی مەڵبەند لەو نزیكەدا پارێزگاری ئەكرد، وە هەر مەڵبەندێك ئەندامێكی (م.س) بەرپرسی یەكەم بوو وەكو بەرپرسێكی (ی.ن.ك) لەهەموو دەزگاكانی پێشمەرگایەتی و كارو چالاكی و رێكخستنەكان و كۆمەڵایەتی و ئەندامەكانیش بریتی بوون لە بەرپرسی هەردوو رێكخراوەكە بەكۆمەڵەو شۆرشگێرانەوە، بەرپرسی هێزی عەسكەری كە لەسەر تیپە دێرین و خاوەن ئەزموون و سەركەوتوەكان دیاری ئەكرا، هەندێ جار مەڵبەندێك لەیەك بەرپرسی عەسكەری زیاتری هەبوو، ئەم بەرپرسە عەسكەریانە بەراوێژ لەگەڵ لێپرسراوی مەڵبەندو رێكخستنەكان زانیاری تەواویان لەسنورەكەی خۆیان لەهێزی رژێم وەرئەگرت و لەكاتی خۆئامادەكردن بۆ چالاكی بەرنامەیەكیان دائەرشت و كات و شوێنیان دیاری ئەكردو دابەشی شوێنەكانی رژێم بەسەر تیپ و كەرتەكانداو لەكاتی ئەنجامدانیا سەرپەرشتی تەواویان ئەكردن بەپێی مەبەستی سەربازیی سیاسی پێویست.

وە لەناو ئەندامانی مەڵبەندا بەرپرسی كۆمەڵایەتی هەبوو بۆ سەرپەرشتی ئیش و كارو كێشەی جەماوەری سنورەكەو بەرێوەبردنی ئیدارەكانی دارایی و پێویستیەكانی مەڵبەندو لەهەمان كاتدا سەرپەرشتی دادگای سنورەكەیان، كە هەر سنورە چەند دادوەرێكی تیا بوو بۆ لێپرسینەوە لەو كەسانەی رژێم كە ئەگیران لە شەرەكاندا یان لەچالاكی ناو شارو بەردەستەكانی رژێم، یان ئەوانەی سەرپێچی یاساییان ئەكرد، بەرووی پێشكەوتنی شۆرش بەجۆری یاسایی و بەدادگایی سەرپەرشتی دادوەرەكان (حاكمەكان) ئەنجام ئەدراو كەس بۆی نەبوو دەست وەرداتە كاروباریان و لە لایەن لیژنەی باڵای دادگاوە كە (م.س) سەرپەرشتی ئەكرد بەچەند دادوەرێكی بەتواناتر چاودێری و سەرپەرشتی ئەكران و كارو كێشەكانی جەماوەری سنورەكەیشیان بەجۆری یاسا ئەگەیانە ئەنجام، وە زۆر پێیان باشبووە لەناو دەزگاكانی مەڵبەندەكاندا دەزگای راگەیاندن كە بەرپرسی تایبەتی هەبوو بۆ رازاندنەوەی بەرنامەو پەخشان و نووسینەكانی راگەیاندن و كارو چالاكیەكانی هێزی پێشمەرگەو گەیاندنی بە رادیۆو رۆژنامەو بڵاوكراوەكانی سەركردایەتی و(م. س) بە جۆرێكی زۆر بە حەماس و سەرنج راكێشەری جەماوەر لەرووی هەستی شۆرشگێرییەوە، هەندێ جار كاری هونەریشیان پێشكەش ئەكرد لەشانۆگەری و كۆرو كۆبوونەوەو سیمینار لەسەر بابەتی بەكەڵك و سەردەمو خولی رووناكبیری بۆ

کادرەکان و ڕێکخستنەکان، وە لەناو دەزگاکانی تری مەلبەندا دەزگای خەستەخانەو پزیشکەکان هەبوو کە لەو پزیشک و برین پێچانە پێك هاتبوو کە پەیوەندیان بەهێزی پێشمەرگەوە کردبوو کە بەڕاستی خزمەتی دیارو لەبەرچاویان هەبوو لەلایەك پزیشك بوون لەولاشەوە پێشمەرگەو ناوجەرگەی چالاکیدا بەشداریان ئەکرد، زۆر ئازایانەیش لەکاتی بریندار بوونی پێشمەرگەدا بەئەدەواتی پێویستی پزیشکی هەر زوو هەڵ ئەسان.. *

## هاوکاری نێوان هێزی پێشمەرگەی کوردستان و جەماوەر و ڕێکخستن

به چارەسەرکردنی (أسعافات أولى)و ڕزگارکردنیان لەمەترسی شەهیدبوون بەڕاستی ئەم پزیشکانەی شاخ خزمەتی گەورەیان کرد بەهێزی پێشمەرگەو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو هەمیشه لەخزمەتی جەماوەری سنورەکەی خۆیان بوون و بووبونە مایەی دڵخۆشی دێهات نشین و خێزانە جوتیارەکانی سنورە ئازادکراوەکانی بەردەستیان ڕۆژانە ژن و منداڵ و پیرو گەنج بەتایبەت سەربازە هەڵاتوەکان لەکاتی نەخۆشیەکانیاندا ڕوویان تێئەکردن و زۆر بەڕووی خۆشەوە چارەسەریان ئەکردن ئەگەر بەدەستنیشان کردنی داوو دەرمانیش بوو بێت، تەنانەت هەندێ نەشتەرگەریی (عملیات)ی بچوکیشیان ئەنجام ئەدا یان مارو دوپشك پێوەدان یان خوێن بەربوون زوو فریای ئەکەوتن بەتایبەت بۆ ژن لەکاتی مناڵبوونیاندا کە ئەمە بارێکی زۆر مەترسیدارو پڕ بایەخ بوو لەسنورەکانی هێزی پێشمەرگە چونکە ڕژێم هەموو ئەم دەزگا تەندروستی و پەروەردەو خزمەت گوزاریانەی گەڕانبوەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆیان و ئەم سنورانەی بەردەست هێزی پێشمەرگە بێبەری کردبوو لەو جۆرە خزمەتە جەماوەریانە لەگەڵ ئەو کەم و بێتوانایی دەزگاکانی سنووری پێشمەرگە بۆ خزمەتی خەڵکەکە زیاتر جەماوەرەکە دڵیان بەو سنورە ڕزگارو ئازادکراوانە خۆشتربوو لەگەڵ ئەوەشدا کە لەبەردەم هەڕەشەی تۆپ و فڕۆکەو پەلامارو جۆرەها نەخشەی دوژمن دا بوون، تەنانەت ئابلۆقەی ئابووریان لەسەربوو پیاوەکانی ڕژێم نەیان ئەهێشت خواردەمەنی و هیچ پێویستیەکی ژیان بەئاشکرا ببرێت بۆ ئەم سنورانەو هاتووچۆی سەیارە لەم دواییەدا بەتەواوی قەدەغەکرا تەنانەت خەڵك بەنهێنی ئەبوایە هاتوچۆیان بکردایەو چەندەها لەم ڕێگایەدا تووشی ئازاری گرتن و کوشتن بوون، بەڵام بۆ مێژوو.

---

چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێزان: مامۆستا جەمال هەڵەبجەیی، عادل شوکر گەرمیانی.
چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێزان حمە ڕەشید باریکەیی، حمە نوری گەرمیانی.

**شه‌ڕی براكوژی ( خۆ كوژی ):**

جــه‌ماوه‌ری شــارو شارۆچــكه‌كانی به‌رده‌ســتی ڕژێــم و لــه‌پێش هه‌موویانــه‌وه ڕێكخستنه‌كان به‌ ئه‌وپــه‌ڕی هه‌ســت به‌لێپرسینه‌وه‌وه‌ پێویستیان ئه‌گه‌یانده‌ سنوره‌كانی هێزی پێشمه‌رگه‌و دێهاته‌كان و پێویستیه‌كانی هێزی پێشمه‌رگه‌ ته‌نانه‌ت ته‌قه‌مه‌نی و له‌ناو ماڵ و خێزانه‌كانی خۆیاندا كه‌سانی هاتووچۆكه‌رانیان ئه‌حه‌وانده‌وه‌و هاوكاریان ئه‌كردن و زۆرجاریش چه‌كداره‌ كورده‌كـان له‌سـنوره‌كاندا هاوكـاری به‌رچـاوی هێـزی پێـشمه‌رگه‌و پێویستیه‌كانیان ئه‌كردن، وه‌ له‌ناو شارو شارۆچكه‌كانیشدا كاروباری چالاكی و په‌یوه‌ندی ڕێكخــستنه‌كان هــه‌تا ئــه‌هات زیــادی ئــه‌كردو گه‌شــه‌ی بــه‌خۆوه‌ ئــه‌بینی به‌تایبــه‌ت ڕێكخستنه‌كانی نـاو (ی.ن.ك) لـه‌ ڕێكخستنه‌كانی كۆمه‌ڵـه‌ی ڕه‌نجـده‌ران به‌پلـه‌ی یه‌كـه‌م و دوایـی یـه‌كێتی شۆڕشگێڕان وه‌ لـه‌ چالاكیه‌كانی ئـه‌م ساڵه‌داو لـه‌ (١٩٨٣/١/٢) بـه‌نهێنی یه‌كێتی هونه‌رمه‌ندانی كوردستان دامـه‌زرا. ساڵی هه‌شتاكان و چه‌ند شـه‌ڕێكی براكوژی و (خۆكـوژی) كوردكـوژی هه‌رچـه‌ند سـه‌ره‌تای هه‌شـتاكان سـاڵێكی بـه‌ره‌و پێشـچوونی گه‌شــه‌كردن و ده‌ركــه‌وتنی هێــزی پێــشمه‌رگه‌ی كوردســتان بــوو له‌هــه‌موو ناوچــه‌كانی كوردســتاندا ده‌ســه‌ڵات و چـالاكی هێزه‌كـانی پێـشمه‌رگه‌ی ئه‌گه‌یـشتێ و زیـانی گـه‌وره‌و جگه‌ربڕیان له‌داموو ده‌زگاكـانی ڕژێمی به‌عسی سه‌دام یـان ئه‌داو زۆر لـه‌ نه‌خشه‌و به‌رنامه‌ ڕه‌گه‌زپه‌رستیه‌كانیان پوچه‌ڵ ئه‌كرده‌وه‌ به‌جۆرێك جێگـای ئومێدو پشتی گـه‌لی كورد بوو، بۆیه‌ به‌تایبه‌ت له‌ پاراستنیان لـه‌ ڕاگواستن بـه‌ڵام ئه‌وه‌ی جێگـای داخێكی هـه‌ره‌ گـه‌وره‌بوو له‌م ساڵانه‌دا ئه‌وه‌بوو كه‌ هێزو ده‌سته‌ پێشمه‌رگه‌ جیاجیاكانی سـه‌ر به‌حزبه‌ كوردستانی و نیشتیمانیه‌كان ده‌ستیان و سه‌نگه‌ره‌كانیان سووركرد به‌خوێنی هاوڕێكانیان و ئـه‌و فیشه‌ك و ته‌قه‌مـه‌نی و چـه‌كانه‌ی ئه‌بوایـه‌ به‌حـساب به‌مه‌به‌سـت بـه‌كار بهێنرایـه‌ به‌رامبـه‌ر به‌دوژمنـه‌ داگیركـه‌ره‌ سه‌رسه‌خته‌كه‌ی گه‌له‌كه‌یان، ئـه‌مان به‌پێچه‌وانه‌وه‌ له‌لاشـه‌ی برینـداری خۆیانـدا سـه‌رفیان كردو به‌گشتی دڵ پڕ لـه‌ تاسـه‌ی ئازادیه‌كـه‌ی دایكی جگه‌رسۆزی نیشتیمانیان سوتاندو له‌ساته‌ وه‌ختێكدا چه‌ند دایكێكیان پێكه‌وه‌ جه‌رگ بڕی و له‌چه‌ند خاڵێكی ڕه‌شدا مێـژوویان لـه‌ناو بزووتنـه‌وه‌ی نه‌ته‌وایه‌تیمانـدا له‌كـه‌دار كـرد، لـه‌و شـه‌ڕی بـرا كـوژی و خۆكوژیانه‌دا:-

١- لــه‌ ڕۆژی (١٩٨١/٦/٢٣) له‌ســنوری هــه‌رێمی ٣ی شــارباژێر بــه‌ به‌رپرســی ده‌سته‌كه‌وه‌ شه‌هید كران كه‌ مامۆستا جمال عزیز فارس و شه‌هید فه‌رهاد قادر ڕه‌شیدو شه‌هید فایق محمد مارف (فایه‌قی خه‌بات)و شه‌هید جه‌لال احمد رسوڵ وڵوبه‌یی و شه‌هید وه‌ستا ڕه‌حیم بوون.

٢- لە ڕۆژی (١٩٨١/٨/٢٠) شەهید جمال عەلی باپیر فەرماندەی هەرێمی ٤ لەگەڵ شەهید شێرکۆ شێخ عەلی و شەهید اسماعیل صالح گەورە دێیی و شەهید کاروان چالاخی و شەهید حەسەن مەحمود قارەمان گەلاڵەیی و شەهید محمد دۆڵ مازەڵەیی لە سنوری دۆڵی جافایەتی لەچەند مەترە چوارگۆشەیەکی ئەو سنورەی خاکی کوردستاندا لوولەی چەکەکانیان کردە یەکتری و گەورەترین زیانیان لەسامانی بەنرخی گەل و شۆڕشەکەیان دا.

٣- وە لە (١٩٨٣/٤/١٥) شەهیدی فەرماندە کاکە (شەماڵ) شێخ محمد باخی شەهید کرا لە دێی باداوان. جگە لەم بارە نالەبارەی ناو هێزەکانی پێشمەرگەو لەملاشەوە ڕژێمی بەعس بەچەندەها دەستەی چەکدار کردبوو بەناوی (مەفرەزە خاصە)و وەکو گورگی هار چەشەی کردبوون و بەسەیارەو چەك و پارە لە خۆیانی بایی (غەمرا) و هەڵنابوون بۆ ڕاوی پێشمەرگەو لەبەرامبەری هەر دەست وەشاندنێکدا هەندێ خەڵاتیان بکات، زۆر بەداخێکی گەورەوە لەو دەست وەشاندنە خۆفرۆشانەی چەند دەستەیەکی چەکداری سنوری زەڕایەنی شارەزوور.

## شەهید بوونی سیروان تاڵەبانی فەرماندەو هاوڕێکانی

لە شەوی (٢٩-١٩٧٩/٤/٣٠)دا لەنێوان هەردوو دێی زێڕینجۆدا بۆسەیان بۆ شەهیدی سەرکردەو فەرماندەی هەرێمی (٥)ی قەرەداغ دانا لە کاتێکدا کە بەمەبەستی گەیاندنەوەی کۆمەڵێك چەك و تەقەمەنی بەتراکتۆرێك بگەیەنێتەوە ناوچەی سنوری هەرێمی (٥)ی قەرەداغ و گەرمیان بەڵام زۆر بەداخەوە ئەم چەکدارانەی ڕژێمی بەعس بەهەموو توانایانەوە لەم فەرماندەو پێشمەرگانەیان داو هەموویان شەهیدکردن و لاشەکانیان خستنە بەردەم ئاغاکانیان لە پیاوەکانی دەزگاکانی ڕژێمی بەعس و شەهیدە نەمرەکانیش ئەمانە بوون: شەهیدی فەرماندە سیروان (فیصل شێخ ڕەشید تاڵەبانی، شەهید حەسەن خاوێیی، شەهید حاجی چاوشین، شەهید علی چلبی، شەهید نەجات کەرکوکی، شەهید محمد مام کەریم ڕاوگانی سایەقی تراکتۆرەکەو دانیشتووی دێی زێڕینجۆ بوو لەکاتێکدا شەهید حەسەن خاوێیی بەبریندراری قاچێکی کەوتبووە ژێر تایەی تراکتۆرەکە زۆر هەوڵی دابوو نەیتوانیبوو دەری بکات و دەربازبێت هەتا بەیانی ڕۆژ بووبوەوەو زۆر هاواری کردبوو کە ڕزگاری بکەن بەڵام چەکدارەکان لەبەیانیدا زۆر نامەردانە ئەچنە سەری و بەگولله دەست ڕێژی لێ ئەکەن و شەهیدی ئەکەن بەم دیمەنە پڕ لەستەمە یەکپارچە جەماوەری سنوری ئەم دێیانەو شارەزوورو کوردستان ئەو ڕۆژە غەمبار ئەکەن و دڵی دوژمنانی گەلی کوردیان پێ خۆش ئەکەن.

## حەڤدە شەهیدەکەی قرگە :

وە لەناو هەمان بەرنامەو بۆسە نامەردانەکەی ڕژێمی بەعس کە بۆ پێشمەرگەکانی کوردستانی ئەنرایەوە بەدەستە چەکدارە خۆفرۆشە ئەڵقە لە گوێکانی، ئەو بۆسەیە بوو کە تیایدا (١٧) حەڤدە پێشمەرگەی ئازاو چاونەترسی تیا شەهید بوو، ئەو پێشمەرگانەی کە بەشەوانی ساردو سەرماو سەهۆڵ بەندان لە شارباژێری مەڵبەندی یەکەوە ئەگەیشتنە ناوجەرگەی شاری سلێمانی و شەوانە چەندەها کەسانی لە پیاوەکانی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ئەمن و استخباراتی ڕژێمیان تەمێ ئەکردو بەسزای گەل و شۆڕشیان ئەگەیاندو شەهید بوونی ئەم دەستەیە بەداستانی شەهیدانی قرگە لە مێژووی شۆڕشی گەلەکەماندا تۆمارکرا کە ئەویش لە شەوی (٢٨-١٩٨٣/٦/٢٩) لەکاتێکدا چەند دەستەیەکی هێزی پێشمەرگە لەناو شاری سلێمانیەوە ئەگەڕێنەوەو لەدێی قرگەی چاونەترس و لە شەوێکی ڕەمەزاندا لە پارشێودا پشویەك ئەدەن و بەدوو تراکتۆر ئەگەڕێنەوە بەسەرپەرشتی هەردوو شەهیدی فەرماندەی کاکە شێخ حسێنە سورو کاکە عبدالرحمانە سوور هەرچەند دوو پێشمەرگە بەکەمین لەپێش خۆیانەوە ڕەوانە ئەکەن کەئەوانیش کاك فەرەیدونە سووروو کاك بەکر کوشنچی بوونەو کاتێك ئەگەنە هەردوو پێشمەرگەکە دڵنیا ئەبن لە ڕێگاکەو هەڵیان ئەگرن نازانن کەمینی ئەو خۆفرۆشانە لە شوێنێکی زۆر نادیاردا لەنێوان دێی قرگەو بناری وێڵەدەردا ئەبێت، تراکتۆری شەهید شێخ حسێن لە پێشەوە ئەبێت لەپڕ بەئاربی جی لێیان ئەدەن تێکڕا بەسەختی دەست ڕێژی هەموو چەکەکانیان، لە ئەنجامدا ئەم پێشمەرگانە شەهید ئەبن: (١- شەهید ئاگری نوری ڕەزا ٢- شەهید ئاراس محمود هەمزە ٣- شەهید تەها عبداللە محمد سعید ٤- شەهید محمد کەریم ساڵح محمد ٥- شەهید ئازاد ڕەشید عارف) (شەهید عیسا غەفور محمد ئەمین، شەهید نەوزاد محمد تاهیر، شەهید محمد عبدالکریم قادر، شەهید محمد عبدالرحمن ئەحمەد، شەهید بەکر ڕەحمان حسێن، شەهید عومەر شەریف مستەفا، شەهید ڕەحیم عوسمان کەریم، شەهید دڵشاد نەوزاد مستەفا، شەهید سالار فتح اللە محمد، شەهید کاروان عمر محمد، شەهید ئامانج عبداللە محمد، شەهید غەفور عبدالکریم ئەمین، کە ئەمە سایەقی تراکتۆرەکە بوو، شەهید شێخ حسێن سوور کە لەوکاتەدا بەخەستی بریندار بووە بەڵام زۆر ئازایانە توانیویەتی خۆی دەرباز بکات و لەناو شارایەکی دەغڵو داندا خۆی بشارێتەوە، هەروەها کاك فەرەیدونە سووروو کاك ئازاد عەلی بەبریندار خۆیان دەرباز کردووەو خەڵکی دێکانی: قرگەو ڕازایانەو داربەڕولەو دوایی وێڵەدەر زۆر مەردانە هاوکاریان کردوون بە سەیارەو تراکتۆر، وە لەهەمان شەودا پێشمەرگەکانی تراکتۆری

دووەم بەتایبەت کاك حداد ئەگەڕێنەوە بۆ شوێنی ڕووداوەکەو لەو ناوەدا شەهید شێخ حسێن سوور بە برینداری ئەدۆزنەوەو بەکۆڵ ئەیگەیەننەوەو دێی وێڵەدەر لەماڵی مامۆستا مارف بەتایبەتی زۆر هاوکاری و خزمەت ئەکرێن، دوایی ئەیانگەیەننەوە نەخۆشخانەی شۆڕش لەدێی باراو، کاتێك تراکتۆرەکەیان بینی کە ناوەکەی پڕ بووە لەخوێن و سەر ژمێری پێشمەرگەکانیان کرد زانیان کە ئەوانەی لەو تراکتۆرەدا بوون هەموویان شەهید بوون و لاشەکانیان براون، و پیشمەرگەیەکیش بەناوی نەوزاد بەبرینداری بەدیل گیراوە، بەم تاوانە گەورەیە ئەم دەستە چەکدارەی ڕژێم ڕووی خۆیان ڕەش کرد لەبەردەم جەماوەری گەلەکەیاندا بۆ هەتاهەتایی و لە مێژووی ڕەشیاندا تۆمارکران و شۆڕشیش هەر بەردەوام بوو هەتا ڕاپەڕینی سەرتاسەری و سەرکەوتن وە لەبەیانی دا کاك سید احمد برزنجی برای شەهید شێخ حسێنە سور ئەگاتە لایان و زۆر مەردانە هاوکاریان ئەکات.

---

چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێزان سەید احمد بەرزنجی، حداد ، فەرمیدون.

# چەند ڕاپەڕینی جەماوەریو چالاکیەکانی هێزی پێشمەرگە پێش ووتووێژی ساڵی ١٩٨٤

لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرکردایەتی ڕژێمی بەعسی سەدام هەمیشە بەردەوام بوو لەلێدانو سەرکوت کردنی گەلی کورد بەجۆرەها نەخشەو بەرنامە دارێژراوەکانی لە ڕاگواستنی شارۆچکەو دێهاتەکانی کوردستانو گرتنو ئەشکەنجەدانی ڕۆڵەکانی گەلی کورد بەلام جەماوەری گەلی کورد لەهەموو شوێنەکانی کوردستاندا تا دەهات خۆڕاگرترو ڕق ئەستورتر دەبوونو زیاتر جۆشو خرۆشی گیانی بەرگریو شۆڕش گێڕیان زیاد ئەبوو بەتایبەت لەئەنجامی گەشەکردنو فراوان بوونی هێزی پێشمەرگەو زیاد بوون و گەیشتنی چالاکیان بۆ زۆربەی شوێنو ناوچەکانی کوردستانی ژێر دەسەلاتی ڕژێمو زیان گەیاندن بەدام و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانیانو بەسزا گەیاندنی پیاوەکانیان، هەربۆیە لەڕۆژی (١٩٨٣/٣/٢٨) بەرفراوانترین خۆپیشاندانی نارەزاییو ڕاپەڕین لە شارۆچکەی ڕەواندز کرا بەرامبەر بەسیاسەتی نەگریسی ڕاگواستنو ئەم ڕاپەڕینە هەموو جەماوەری شارەکەو دەوروبەری گرتەوەو توانیان کۆنترۆڵی شارەکە بکەن هەتا ڕژێم ناچار بوو بە هێزێکی زۆر گەورەی عەسکەریو فرۆکە دوای چەند ڕۆژ زۆر بەلاوازیەوە چووەوە ناو شارەکە. وە لە هەمان ساڵدا بەمەبەستی تەمێ کردنی پیاوەکانی ڕژێمی بەعس لە سنوری دێی ( بانی خێلان)ی دەربەندیخان کە نەیان ئەهێشت خەڵکی ئەم دێیانە بچنە سەر ئێشو کاری زەوی و زارو کشتوکاڵەکانیان بۆیە هێزی پێشمەرگە لەسنوری مەڵبەندی یەکو چەند دەستەیەك بەسەرپەرشتی شەهیدی فەرماندە کاکە محمودی مامە عزیزو فەرماندە کاکە سەلامی کوێخا عەزیزو حمە قاشتیو چەند دەستەیەك بە بەرنامەیەکی گونجاوو هاوکاری تەواوی ژنو پیاوی دێکە توانیان لێدانێکی باش لەو هێزە سەربازو پیاوەکانی ئەمنو استخبارات بدەنو بۆ هەتاهەتایی تەمێیەکی باشیان کردن، ئەمانە نمونەیەکن کە هەمیشە هێزەکانی پێشمەرگە قەڵغانی پاراستنی جەماوەری گەلی کوردو هێزی بەرگری بوون، لە جەماوەر لەهەر جۆرە دەست درێژیەکی پیاوەکانی ڕژێم، وە لە (١٩٨٣/٧/١٤)دا مامۆستای سەرکردە (جەمال تایەر) لە کارەساتێکی چاوەڕوان نەکراودا بەڕووداوی سەیارە شەهید بوو کە بوو بەزیانێکی زۆر گەورە لە سەرکردایەتی گەلی کوردو شۆڕشە ڕزگاری خوازەکەی بەتایبەت مامۆستا جەمالی سەرکردە پاڵەوانی هەڵسانەوەی شۆڕش بوو لەدوای کارەساتی هەرەسو سەرکردەیەکی زۆر بەتواناو بلیمەتی مەیدانی خەباتی ڕێکخستنو پاڵەوانی ناو زیندانو سەرکردەیەکی خۆشەویستی ناو

هێزی پێشمەرگە، لەم ساڵەداو لەسنوری بالیسان شەهید بوو. وە لەشاڵاوێكی دڕندانەی ڕژێم بۆ سەر گیانی كوردو لە ١٩٨٣/٧/٣٠، دەزگاكانی ڕژێم لەسنوری پارێزگای هەولێر نزیكەی (٨) هەشت هەزار بەڕزانی لە پیاوو كوڕو گەنجی بە ئەنفال برد بێسەرو شوێن لە نیوە شەودا دای بەسەریاندا لە مجەمەعەكانی هەردوو قوشتەپەو بحركەو حەریر و گۆڕە تووی لای مێرگەسوور. وە لە ١٩٨٣/٨/٢٨ شاڵاوێكی زۆر دڕندانەی عەسكەری ڕژێم بۆ سەر گوندی چیمەنەكانی نزیك شاری كەركوك بەشەهید كردن و بریندار كردنی چەندەها لە خەڵكی ئەم چیمەنانەو وێرانكردن و كاول كردنی دێكان و لەم كاتەوە چیمەن ناونرا بە چیمەنی شەهیدان، وە لە ١٩٨٣/١٠/١٣ هەڵمەتێكی فراوان و پێشمەرگە ئاسا بۆ سەر ناوچەو سنورەكانی بێتواتەو ڕزگاركردنی ئەم سنورە لەچەكدارەكانی ڕژێم كە وەكو پیلانێك ڕژێم ئەنجامی دابوو بۆ دژایەتی كردنی هێزی پێشمەرگە، بەڵام زۆر ئازایانە لەم چالاكیەدا هێزی پێشمەرگە زۆر پاڵەوانانە لەماوەی چەند ڕۆژێكدا بەتەواوی سنورەكەیان پاك كردەوەو ئەو ناوچەیە ڕزگاركرا وە پیلانەكەی ڕژێم پوچەڵ كرایەوە، ئەم چالاكیەی هێزی پێشمەرگە لەم كاتەدا چاوشكاندنێكی زۆر گەورە بوو بۆ هێزو بەرنامەكانی ڕژێم و هەروەها بەرزكردنەوەیەكی بەرچاوی وورەی پێشمەرگەو هەستی شۆڕشگێڕی و دڵسۆزی جەماوەر بوو، وە لەساڵی (١٩٨٣ و ١٩٨٧/١١/١٢)دا ڕژێمی بەعس هێرشی كردە سەر دێی چیمەنی دێرینی نزیك شاری كەركوك و (١٥) كەسی لێ شەهید كردن و لەو ڕۆژەوە ناوی چیمەنی شەهیدانی وەرگرت لە ١٩٨٧/١١/١٢ جگە لەوەی ئەم گوندە هەزارەی چیمەن خاوەنی چەندەها لەم جۆرە هێرشانە بووە لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە بەهەموو جۆرە چەكەكانیان بەمەبەستی كوشتن و دەرپەڕاندنیان و چەندەها كەسیان لە هەموو ئاستە تەمەنەكانیان شەهید بووە لە ژمارەی ماڵەكانیان زیاتر، لەو شەهیدانە (بەكرو سەید مەجیدو هیواو كاوەو زەیدان و هێرش و حاجی صادق و ئازادو اسماعیل و مامەقالەو ڕزگارو ئارام و (عزیز و غەریب) دوو برا فەقێ محمد و نافع و كامران و بەكرو احمد و كاوە ناصح و مەجیدو شەریف و ڕەجەب و زەیدان مستەفا و عبدالرحمن و صادق و جبار عبێد، بەگشتی (٦٣) شەهیدی دێی چیمەن، وە لەئەنجامی ئەم هەموو چالاكی و فراوان بوونەی هێزی پێشمەرگە لە زۆربەی سنورو ناوچەكانی كوردستانداو بەرەنگاری تەواو بەرامبەر بەشكستی بەرنامەكانی ڕژێم لە كوردستاندا وەكو هێزو پشتیوانێكی جەماوەری گەلی كوردستان و بەدەركەوتنی سەركردایەتی و هێزەكانی پێشمەرگە وەكو هەیبەتێك كە تێكڕای جەماوەری كوردستان بەخاوەنی خۆیان بزانێت بەتایبەت سەركردایەتی و هێزەكانی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) كە بەڕاستی لەو ساڵانەدا وەكو تاقە هێزێكی بەتواناو شۆڕشگێڕ لەمەیدانی خەباتدا زۆربەی ناوچەكانی خستبووە ژێر دەسەڵاتی وە

لەهەمان ساڵدا شەڕی عێراق ئێران بەرەو سەختیو ماڵوێرانی تر ئەڕۆیشت کەتیایدا گەلی عێراق و ئێران لەمەترسی سوتاندنی ئاگرەکەی دابوون هەتا ئەمات دژوارتر ئەبوو بەتایبەت لەم کاتەدا شۆڕشی کۆماری ئێران بەڕابەری ئیمام خومەینی لەسەرەمی زۆر بەحەماسو خۆ بەقوربانی داندا بوون، جۆرەها بیرکردنەوەیان بوو وەکو مەزهەبێکی شیعی خۆیان کە هەرچی زووتر خۆیان بدەن بەکوشتو بەناوی شەهیدبونیان و زووتر گەیشتنە بەهەشت تەنانەت ئەگەر بەدیلی بگیرانایە ئەگریان لەوەی بۆ شەهید نەبوون، وە زۆربەی دانیشتوانی (٦٠) ملیۆنی ئێران بەشێوەی خۆبەخش (تەتەوع) لەناو سوپای پاسداران ناونووسو نیزامیو ئامادەکرابوون بۆ شەڕ بەجۆرەها ناوی سوپای پاسداران، ئەمانە تەنیا لەناو کوورەی ئەو دۆزەخی شەڕەدا کۆتاییان پێهات ئاڕادەیەك و ناوچەکەیش لەمەترسیان ڕزگاربوون لەوکاتەدا بەهێزێکی نێودەوڵەتی.

## هاتنە پێشەوەی ووتوێژ (مفاوەزات) ی ساڵی ١٩٨٤

وە هەر لەم ساڵەداو لە مانگی ١٩٨٣/١١ ڕژێمی بەعسی سەدام مبادرەیەکی هێنایە پێشەوە کەئەویش هێنانە پێشەوەی ووتووێژ (مفاوەزات) تایبەت لەگەڵ سەرکردایەتی (ی.ن.ك)دا هەرچەندە ئەم جۆرە کردارانە بەتەمەنی شۆڕشەکانی گەلی کورد لەلایەن حکومەتو حزبەکانی دەسەڵاتدارو هەمیشە هێناویانەتە پێشەوە بەچەندەها جار هەر لەساڵەکانی (٦٣، ٦٤، ٦٧، ٧٠، ١٩٨٤، ١٩٩١) بەڵام هەموو کاتێك بێئەنجام بووە هەر بەدەستی ڕژێم خۆی، ئەگەر چەند ساڵیشی خایاندبێت هەموو کات ئەم ڕژێمانە وەکو بەرنامەو پیلانێك لەکاتی پێویستیو هەڵسانەوەی بەرژەوەندی خۆیدا بووە لەگەڵ ئەوەشدا گەلی کوردو شۆڕشو سەرکردایەتی بەئەوپەڕی ماوەی شۆڕشو جەماوەری گەلی کورد بەتایبەتی لەناو ساڵەکانی ووتووێژ لەنێوان ١٩٨٣/١١ بۆ ١٩٨٥/١/١٥ نیەتی پاكو خۆشحاڵیو سەلماندنی هاونیشتمانێتی و شانازی لەکوردو شۆڕش بەوەی کە کێشەکەی بەڕێگای ئاشتیو ووتووێژ چارەسەر بکرێت، ئامادەییان پیشان ئەدا بۆ ئەم مەبەستانەو لەم کاتەشدا کە ڕژێمی عێراق لەو شەڕەدا بوو لەگەڵ ڕژێمی ئێراندا لەبەر ئەم هۆیانە سەرکردایەتی (ی.ن.ك)و لەسەرووی هەموویانەوە بەڕێز مام جەلال سکرتێری گشتی هەر زوو ئەم پێشنیارەی ووتووێژەی قبوڵ کردو لەماوەی ئەو ساڵەدا لەنێوان نوێنەری هەردوولادا چەندەها خولی دانیشتن کرا، کە هەر لەسەرەتاشەوە وەفدەکانی یەکێتی نیشتیمانی بێسەڵ کردنەوە چوونە بەغداو ئامادەییان دەربڕی بۆ دانیشتن، زۆر بەپەرۆشەوە بەگشتی شۆڕشو هەموو جەماوەری گەلی کوردو گەلی عێراقیش بەهێزەکانی

عەسکەریشەوە تەنانەت لەو ساڵەدا هەموو لایەنەکان چالاکیان وەستا تا ڕادەیەك و شەڕو شاڵاوو پەلاماری ئێران بەهەمان شێوە، هەموو لەئاستی چاودێری گەیشتن بەدوا ئەنجامی ئەم ووتووێـژەی نێـوان سـەرکردایەتی (ی.ن.ك*) و ڕژێمـی عێـراق دا بـوون، تەنانـەت هێزەکـانی پێـشمەرگە هاتنـە نـاو جـەماوەر لـە سـنورەکانی ژێـر دەسـەڵاتی ڕژێـم و سـەر جادەکان و لیژنەی تەنسیق لەنێوانیاندا لە شارو شارۆچکەو سنورەکاندا دروست بوو بۆ کـارو پەیوەندیـەکانی نێوانیـان، کێـشەکانی ڕۆژانـەیان، وە لـە ڕۆژی ١٩٨٤/٣/٢١ وەکـو ڕۆژێکی مێژوویی گەورەترین کۆبوونـەوەی پێشمەرگایەتی کرا بەسەرپەرشتی هەڤاڵ مام جـەلال لـە قەشـقۆڵی دوکـان لەهـەموو شـوێنێکی عێراقـەوە، کـە (مامـە ڕیـشە) زۆر بەخۆشەویـستی جـەماوەر دەرکـەوت بـەڵام زۆر بەداخـەوە هـەروەکو نیەتـەکانی پێـشووی ڕژێمەکان لەم جۆرە داهێنانی ووتووێژانەدا نەیان هێشت بگەنە ئەنجام بەبیانووی ئەوەی لـەدوا هەوڵـدا کـە ئیمـزا کردنەکـەی هـەردوولا مـابوو گوایـە بەدەسـت تێـوەردانی دەوڵـەتی تورکیاو ناردنی بەرپرسێکیان ڕژێمی عێراقی ناچارکرد کە پەشیمانی بکاتـەوە، هەرچەندە ئەمە پیلانێك بوو بۆ لەدەست دانی ئەم هەلە، بەتایبەت دژی گەلی کورد کـە ئەبوایـە ڕژێمـی عێـراق وەکـو بەرژەوەنـدی خـۆی و نیـشتیمان و گەلەکـەی ئـەنجامی بدایـە، وە لـە ڕۆژی ١٩٨٤/٣/٢١ پێشمەرگەی دیارو بەتواناى شارباژێڕ کاکە برا بەهەڵگرتنەوەی مین شـەهید بـوو زیـانێکی گـەورەی گـەلی کـورد بـوو، لەگـەڵ ئـەم پاشـگەزبوونەوەی ڕژێمـی عێراقـداو لەهەمان کاتدا سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی پێشنیاری ئەوەی کرد کـە ڕازیـە بـەوەی شـەڕ نـەبێت وەکـو هودنەیـەك هـەتا دوای شـەڕی عێـراق و ئێـران بەمـەرجێك دێهاتـەکانی کوردستان تێك نەدرێت کە دێهاتی نیشتیمانی عێراقە وەکو هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕی و نیشتیمانی.

بەڵام زۆر بەبێ شەرمانە ڕژێمی بەعس وەڵامی ئەم پێشنیارەی سەرکردایەتی دایەوەو بەجۆری زۆر ناشیرین بە بەڕێز مام جەلال، وە وەڵامدانەوەی ڕژێم بەهەڕەشەو سووربوون لەسەر وێرانکردنی هەموو دێهاتەکانی کوردستان بەهەر تواناو سامانێك بێت ووتیان ئێمە ئەوە مەبەستی سەرەکیمانە ئەبێ دێکانی کورد نەهێڵین.

## شەهید کردنی چەند سەرکردەو پێشمەرگەیەك

شەهید کردنی هەردوو فەرماندە: شەهیدان ملازم سەید کەریم و مامەڕیشەی ناسراو بە ( رجل حديدي)، هەرچەندە لەو ساڵانەی ووتووێژدا بەناو کە ئەکرا، لەهەمان ئەو کاتانەدا ڕژێم پیاوو دەزگاکانی هان ئەدا بەچەندەها پیلان و کوشتن و گرتن و بۆسەنانەوە بۆ هێزی پێشمەرگەو سەرکردەو فەرماندە عەسکەریەکانی، نمونەیش لە (١٩٨٤/٩/١٥) لە بۆسەیەکی نامەردانەدا لە سەرجادەی تاسلوجەی نزیك سلێمانی سەرکردەو فەرماندەی بەتواناى هێزی پێشمەرگە کاکە سەید کەریمیان شەهید کردو هەر لەو ماوەیەدا لە ١٩٨٤/٣/٢١ پێشمەرگەی دێرین کاکە تۆفیقی حاجی و خوێندکارێك بەناوی هیوا محمد رەزا شەهیدکرا کە خەڵکی دێی مولنی شارەزوور بوو، ئەمانە لە کاتێکدا لەئاهەنگی نەورۆز ئەگەڕانەوە کە لە قەشقوڵی دوکان سازکرا بوو بەسەرپەرشتی هەڤاڵی بەڕێز مام جەلال، و سەرکردایەتی و هێزی پێشمەرگە کە زۆربەی جەماوەری گەلی کورد لەهەموو شارەکانی کوردستاندا تیا بەشدار بوو تەنانەت لە ناوجەرگەی شاری کەرکوکیشەوە، وە بە یەکەم کردنەوەی ئاهەنگی نەوروزی کورد ئەژمێردرێت لەمێژووی چەند ساڵەی گەلی کوردو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازەکەی دا، کە پێکەوە هێزی پێشمەرگەی کوردستان و جەماوەری کورد بەو قەبارە هەرە زۆرو گەورەو لەو بەهارە خۆش و سەوزەدا بکرێتەوە لەدوای ئەو هەموو ترس و تۆقاندن و کوشتن و بڕینەی دەزگاکانی ڕژێم ئەنجامی دابوو دژ بەگەلی کوردو شۆڕشەکەی، لەو چەند ساڵانەی پێشوودا، وە لەناو ئەم ئاهەنگەدا کە جەماوەرو پێشمەرگە ئامێزی یەکتر بووبوون و بەچەندەها فەرماندەو پێشمەرگەی دیارەوە شادبووبونەوەو وێنەیان لەگەڵ ئەگرتن لەناویاندا فەرماندەی هەرە دیاری مامە ڕیشە کە لەلایەن دەزگاکانی ڕژێمەوە بە ( رجل حديدي) ناسرا بوو، لەگەڵ داخێکی زۆردا دوای چەند مانگێك و لە ١٩٨٥/١/٢٤ بە پیلانێکی زۆر نامەردانە شەهیدیان کردو لەگەڵ هەردوو پێشمەرگەی بەتواناو دڵسۆز محسن بی کەی سی و سەردار قەرەتاووری بەدەستی چەکدارێکی خۆفرۆش کەدیاری بوو.

## دروست بوونی چەکداری ڕژێم بەناوی أفواجي ( خفیفە ) سووك

کەهەمان دەستی سوور بوو بۆ شەهیدکردنی پێشمەرگەو فەرماندەی دێرین کاکە حەمە ئاغجەلەری و ٦ پ.م لە ساڵی ١٩٧٧ لە کانی بی دەشتی کۆیە. وە لەهەمان ساڵی ١٩٨٤ داو لە گەرمەی ووتووێژو هات و چۆکردنی وەفدەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بۆ بەغداو بەمەبەستی گەیشتن بەئەنجامێك کە تیایدا ئاواتەکانی گەلی کوردی

لهكوردستانی عێراقدا تیا بێتهدی لهناو جهرگهی ئهو ووتووێژه پڕ چاوهڕوانی كراوهدا، دهسهلاتدارێتی ڕژێم بهرنامهی چهكداركردنی ناو خهڵكی كوردستانی دهست پێكرد بهناوی تازهی فهوجه سوكهكان (افواج خفيفه) كه بریتی بوو بهناوی كهسێكی دیاری عهشایهری یان خاوهن كهس و كارو ناو جهماوهر لهگهڵ فهرمانده عهسكهریهك وهكو ئهفسهرێكی ناو سوپای عێراق و چهند سریهیهك بهناوی فهرماندهی سریه پێكیان ئههێنا بهجلی كوردیهوه، وه بهزۆری لهسهربازه هەڵاتوهكان و بارهگای تایبهتی شوێنی بۆ دیاری ئهكردن له سنورهكانی كوردستان و بهزۆری بهدهوری سهربازگهكانهوه بۆ پاراستنیان و پارهیهكی زۆری ئهدا به بهرپرسهكانیان بهتایبهت ڕاوێژكارهكان (مستشار)، وه دوایی جێگرو فهرماندهی سریهكان وه بهزۆریش چهكداری بهناوی ئیجازهكردنهوه بۆیان و مووچهكهیان بۆ خۆیان وهرئهگرت، كه له مانگێكدا بهدهیان ههزار دینار مووچهیان ئهبوو كه بهداخێكی زۆر گهورهوه لهم كاته زۆر ناسك و پێویستیهدا كه ئهبوایه ههموو گهلی كورد بهههموو چین و توێژهكانهوه لهدهوری شۆڕش و كێشهی گهلهكهیان و سهركردایهتی شۆڕش كۆببنهوه ههتا ببونایه بهپشت و پهنایهك بۆ سهركهوتنی ووتووێژهكهو بهئهنجام گهیاندنی كورد بهمافی ڕهوای خۆیان، كه ئهركی سهرشانی ههموو كوردبوو بهلام بهپێچهوانهوه بهدهها بهناو چهكداری كوردی (افواج خفيفه) دروست بوو كه ژمارهیان له (٤٨٦) فهوج تێپهڕی و بووبووه ململانێ لهنێوان زۆربهی سهرۆك هۆزو تیرهكانداو لهلایهن دهزگاكانی ڕژێمهوه ئیهانهی یهكتریان پێئهكردن ههتا ئاژاوهو ناخۆشی لهنێوانیاندا دروست ببێت، وه خۆیان چهكدار بكهن بۆیهكتری و دوایش زۆربهی دێهاتهكانی كوردستانیان بهیهكتری پێ تێكدان لهساڵی ١٩٨٧ بهتهواوی ناچاری خهڵكهكانیان كردن بۆ كۆمهڵگاكان نزیكهی پێنج ههزار دێیان لهههموو كوردستاندا پێ تهخت و كاول كردن، جگه لهچهندین شارۆچكهی دیارو ڕازاوهی كوێستانهكانی كوردستان، وه زیندووكردنهوهی دیاردهی عهشایهری بۆ گیانی یهكتر كه ئهمه ههمیشه پیلانێكی دهستی نهتهوه ڕهگهزپهرستهكانی دهروبهر بوون بهمهبهستی داگیركاری كوردستان و ژێردهستهیی گهلی كورد بهدرێژایی مێژوو.

### كۆتایی ساڵهكانی ووتووێژ (١٩٨٤):

بهم جۆره ساڵی ١٩٨٤ ههتا ئههات بهرهو تهسكبونهوه له وهزعی هێزی پێشمهرگهو چهكداركردنی خهڵكی كوردبوو بهرامبهریان لهناو دهستهی تایبهتی و فهوجی خهفیفهداو لهههمان كاتدا ئهنجامی ووتووێژی نێوان سهركردایهتی (ی.ن.ك) و ڕژێمی عێراق بهرهو درێژبوونهوهی چاوهڕوانی و نائومێدی ئهڕۆیشت، لهگهڵ ئهوهشدا خۆڕاگری و

بەتەنگەوەچوونی سەرکردایەتی (ی.ن. ك) بۆ گەیشتنە ئەنجامو پشوو درێژی زۆر بەهەستی لێپرسراوێتیەوە، لەماوەی زیاتر لەساڵێك بەرنامەکانی خۆیان بەجێ ئەهێنا لەناو ئەو هەموو ئاڵۆزیو نەخشەو پیلانەی دەزگاکانی ڕژێمدا، سەرکردایەتیو هێزەکانی پێشمەرگە لەناو سەرپەرشتی مەڵبەندەکانی خۆیاندا سەرقاڵی کاروباری خۆیان بوون کەژمارەی هێزەکانیش زیادێکی زۆرو لەبەرچاوی کردبوو، وە هەر لەو ساڵەدا هەردوو ڕێکخستنەکانی ناو یەکێتی بەکۆمەڵەو شۆڕشگێڕانەوە کۆنفراسی خۆیان بەست بە هەڵسەنگاندنی باروودۆخی سیاسیو چۆنێتی ئەنجامی وتووێژەکەو سازدانەوەی خۆیانو ڕێکخستنەکانیان بەجۆرێك خۆڕاگرانە مامەڵە بکات لەوکاتەدا لەگەڵ ئەوەشدا گەلی کوردو خەڵکە دڵسۆزەکەی زۆر بەبایەخەوە سەیری ئایندەی شۆڕشو وتووێژەکەیان ئەکردو بەچاوێکی زۆر بەئومێدەوە چاوەڕوانی سەرکەوتنی بوون، وە خۆشیو ئارامی کوردستانیان زۆر لامەبەستو پیرۆزبوو تەنانەت خەڵكو کەسایەتیە دیاریەکانی دەرەوەی عێراقو دەرەوەی کوردستان هەر لەو ساڵەداو لە ١٩٨٤/٢/١٦ کەسایەتی دیاری محمد تۆفیق وەهبی لەشاری بەغدا کۆچی دوایی کرد لەسەر وەسێتی خۆی تەرمەکەیان هێنایەوە کوردستانو لەناو پێشوازیەکی بێوێنەی جەماوەری کوردستان دا لەنزیك چیای پیرەمەگرون نێژرا بە بەشداری سەرکردایەتی (ی.ن.ك)و لەپێشیانەوە بەڕێز مام جەلال بەوتارێکی گرنگ لەکاتی سپاردنی بەخاکدا دەربارەی ژیاننامەو ڕۆڵی محمد تۆفیق وەهبی لەخزمەتی کوردو بزووتنەوەی کوردایەتیدا وە بوو بەڕۆژێکی زۆر گرنگی کۆبوونەوەی جەماوەری لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا، وە لە ١٩٨٤/٥/٧ مانگرتنو خۆپیشاندانی زانکۆی صلاح الدین لە هەولێر ڕووی دا دژی هەندێ ڕەفتاری ڕژێم کە بەزۆر ئەیانوویست بیانسەپێنێ بەسەریانداو خوێندکارەکانیش قبوڵیان نەکردو بووە هۆی دەرکردنی ژمارەیەك خوێندکار لەم کاتە ناسکەدا.

## بارەگاکانی هێزی پێشمەرگە لەکاتی وتووێژدا:

وە لەماوەی ئەو ساڵە وتووێژەدا زۆرترین بنکەو بارەگاکانی هێزەکانی پێشمەرگەو ڕێکخستنەکان لەزۆرترین شوێنەکانی کوردستان لەناو جەماوەری گەلی کورد نزیك بوونەوە، تەنانەت سەرکردایەتی هاتنە ناحیەی سورداش بۆ زیاتر ئاسانتر بەکاروبارەکانیانو هاتوچۆکردنو سازدانی کۆبونەوەو چاوپێکەوتنەکانی وەفدەکانی هەردوولا، وە بارەگای مەڵبەندی یەك هاتنە دێی گرێزەی شارەزووری بارەگای هەندێ لە تیپو کەرتەکان بڵاوبوونەوە بەدێکانی: کانی پانکەو موانەکاندا بەڕێزو پێشوازی

خەڵکەکە لەم ناوچەیەو لەهەموو ناوچەکانی کوردستاندا، ئەو ساڵی ووتوویژە خەڵکی کوردستان بە ئەوپەڕی خۆشیو چاوی بەئومێدی ژیانی هەموو پێشمەرگەکان شادبوونەوە بەکەسو کارو منداڵو خێزانەکانیانو ئەو ماوەیە بەزۆری پێکەوە بوون. بەلام زۆر بەداخەوە هەتا ئەهات ووتوویژ بێئەنجام ئەبوو ساڵی ١٩٨٤ کۆتایی هات لەگەڵ ئەو هەموو پیلانو نەخشە خراپەی ڕژێمی عێراق و دەزگاکانی ئەنجامیان ئەدا دژی هێزی پێشمەرگەو شەهیدکردنی فەرماندەو تەنانەت سەرکردەی فەرماندە ڕۆژانە نانەوەی کێشەو گرتنی پێشمەرگە لەشارەکاندا، لەگەڵ ئەم هەموو کۆسپانەی ڕژێمدا تەنانەت بایەخ نەدانی بواری ڕاگەیاندنی ڕژێم بەجۆرێك کە گەلی کورد دڵی پێ خۆش بێت بەو جۆرە هەر نەبوو، بەلام بۆ مێژوو کەهەموو گەلی عێراق ئەزانێت سەرکردایەتی (ی.ن.ك) بە ئەوپەڕی هێزو تواناو ئەوپەڕی نیەت پاکیو چاکیو ئەوپەڕی هەست بە لێپرسینەوەی نیشتیمانی هەوڵو تەقەلای تەواوی دا بۆ سەرکەوتنی ئەم ووتوویژەو چەسپاندنی ئاشتیو برایەتی ڕاستەقینە لەنێوان هەموو گەلی عێراق بە عەرەبو کوردەوە، بەپێچەوانەوە ڕژێمی بەعسی سەدام حسێن لە بەرنامەی خراپەکاریو سیاسەتی دژایەتیو جیاوازی کاری خۆی نەئەکەوت بەهەموو جۆرێكو بەتایبەت دروست کردنی جۆرەها چەکداری کورد لە (افواجی خفیفە) و جۆرەهای تر کەزۆر بەداخێکی سەختەوە بەپێچەوانەی بەرژەوەندی گشتیو گەلی کورد بوو، هەرچەندە لەملاشەوە هێزی پێشمەرگە زیادو گەشەیەکی لە بەرچاوی کردبوو بەخۆڕاگریو دان بەخۆداگرتنو هەست بە لێپرسینەوەی مێژوویی زۆر لەکێشە دروست بووەکانیشیان بەرامبەریان کۆتایی پێ ئەهێنا تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە سەرکردایەتی (ی.ن.ك) گەیشتنە دوا خاڵی نائومێدیو بڕیاڕی یەکجارەکی.

## چالاکی و بارودۆخی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و رژێمی عێراق دوای تێکدانی وتوویژ لەلایەن رژێمەوە

لە سەرنەکەوتنی وتوویژەکەیان لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٥و لە ١٩٨٥/١/١٥ بە بەیاننامەی کۆمیتەی سەرکردایەتی بریاری یەکلایی کردنەوەو برینی تەواوی وتوویژیان لەگەڵ رژێم دا، بەڵام بە بەرنامەی بەرگری کردن لەخۆیان و هێزەکانیان لێرەشدا پەیوەستی و هەست بەلێپرسینەوەی نیشتیمانی خۆیان سەلماند بەرامبەر بە چارەنووسی بەرپرسێتی شەرخوازی و شەری خوێن رشتنی گەلی عەرەب و کورد بەیەکتری، هەر بەم پێیە هێزەکانی رژێم لەسەرەتادا بەهێزەکانی فەوجە سوکەکان دەستیان پێکردن بەهێرش بردنە سەر بنکەو بارەگاکانی هێزی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) لە سنورەکاندا نمونەیش پەلاماری لەناکاوی رژێم بەسەرپەرشتی (فەتاح بەگ) کە کۆنە ئەفسەرێکی کوردی ئەڵقە لەگوێی رژێم بوو لەم کاتەدا هێنایانە پێشەوە بۆ پێکهێنانی ئەم فەوجە خەفیفانە لە شارەزوورو گەرمیاندا یەکەم هێرش بەمیان کرد، بەرەو بناری شارەزوور بۆ شاخی قەرەداخ کە خۆشبەختانە بەلوتی شکاوەوە بەجۆرێك شکان کە نانەکەیان پێ نەخورابوو کە بۆیان ئامادە کردبوون، هەمان هێزی خەفیفە هێرشیان پێ کردن بەرەو دێی گۆپتەپەی سنوری ئاخجەلەرو عەسکەر بەهەمان شێوەو لە١٩٨٥/٢/٧ بەلووتی شکاوەوە شکاندنیانەوە لەسنوری تیپی ٢١ی کەرکوك هەرچەند زۆر بەداخەوە کادری دڵسۆزو بەرپرسی دادی ئەو سنوورە حاکم کەمال محمود مەرگەیی شەهید بوو لەگەڵ دوو پێشمەرگە بەناوی زهیر سعدون و اسماعیل عەزیز دوای چۆڵ کردنی هێزی پێشمەرگە رژێم دێکەی روخاندو کاولی کرد، رژێم لەوە ئەچوو کە بەهەموو عەقڵ و بۆچوونی خۆی وای ئەزانی ئیتر هێزی پێشمەرگە بەو جۆرانەی پێشوو شەری پێناکرێت ئەم بەرگریە بەسەرپەرشتی فەرماندەی عەسکەری مام رۆستەم ئەنجامدرا کەخۆیشی بریندار بوو.

## داستانی دابان هه‌لاج و چه‌ند داستانێكی تری هێزی پێشمه‌رگه

ئیتر سه‌ركردایه‌تی (ی.ن.ك) كه‌وته سازدانه‌وه‌ی خۆی‌و هێزه‌كانی پێشمه‌رگه‌ی به‌رامبه‌ر به به‌رگری له‌هێرش‌و پیلانه‌كانی ڕژێم، وه یه‌كه‌م داستانی كه تۆماریان كرد به‌مه‌به‌ستی سه‌لماندنی له (دابان هه‌لاج) ئه‌نجامیان دا له‌نێوان شاخی پیره‌مه‌گرون‌و دوكاندا له شه‌وی ١٤-١٥ /١٩٨٥/٢، كه له‌م داستانه‌دا له‌ماوه‌ی شه‌وو ڕۆژێكدا هێزی پێشمه‌رگه توانی هه‌موو بنكه‌و بارەگا سه‌ربازیه‌كانی فه‌وج‌و سریه‌و ڕه‌بایه‌كانی ئه‌م سنوره ستراتیژیه ده‌ست به‌سه‌را بگرێت، و له پۆستاڵی داگیركه‌رانی كوردستان پاك بكاته‌وه‌و سنوره ڕزگاركراوه‌كان ببه‌ستێته‌وه به‌سنوری سه‌رگه‌لۆ به‌رگه‌لۆو دۆڵی جافاتی‌و سنوره‌كانی پشته‌وه‌ی شارباژێر كه به‌داخه‌وه له‌م داستانه مه‌زنه‌دا فه‌رمانده‌ی دێرینی پێشمه‌رگه كاكه (والی باریكه‌یی) شاره‌زووری شه‌هیدبوو له ڕۆژی ١٩٨٥/٢/١٥ له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا كه كۆمه‌ڵێك دیل‌و ده‌سكه‌وتی زۆر كه‌وته ده‌ست هێزی پێشمه‌رگه، ئیتر لێره‌وه هیچ به‌ڵگه‌و بیانویه‌ك له‌ده‌ستی ڕژێمدا نه‌ماو زۆر به‌ناچاری سه‌ركردایه‌تی (ی.ن.ك)و هێزه‌كانی پێشمه‌رگه به‌سه‌رپه‌رشتی سیٚ مه‌ڵبه‌ندی له‌سنوره دابه‌شكراوه‌كه‌ی چالاكی دا به‌پێكهاته‌ی یه‌كه‌ی تیپ‌و كه‌رت‌و ده‌زگاكانی ڕێكخستن‌و كادره لێهاتوه‌كانیانه‌وه به‌سیاسی‌و عه‌سكه‌ری هه‌ر له‌مه‌كته‌بی سیاسی هه‌تا كه‌رته‌كان شوێنی خۆیان گرت‌و كه‌وتنه‌وه سازدانه‌وه‌ی چالاكی‌و به‌رگری له‌شوێنه ڕزگاركراوه‌كانیان، به‌م جۆره سه‌ره‌تای ساڵی ١٩٨٥ بوو به‌ساڵێكی یه‌كلاكه‌ره‌وه‌و ده‌ست پێكردنه‌وه‌ی شه‌ڕو ماڵوێرانی و كوشتن‌و بڕین له كوردستاندا به‌ناچاری ئه‌وپه‌ڕی ده‌سه‌ڵات‌و توانا فه‌رمانی سه‌ركرده‌كانی ڕژێمی ده‌سه‌ڵاتداری عێراق له‌وكاته‌دا كه (ڕژێمی به‌عسی سه‌دام حسێن)ی دژ به‌كوردو هه‌موو گه‌لی عه‌ره‌بی عێراق‌و نه‌ته‌وه‌كانی تر بوو به‌خوێن ڕشتنیان به‌یه‌كتری وه له چالاكیه‌كانی تری هێزی پێشمه‌رگه‌ی كوردستان له (١٩٨٥/٩/٢ له‌نێوان هه‌ولێرو مه‌خمور ئه‌نجامیان دان‌و ده‌ستی باشیان له‌ڕژێم وه‌شاند هه‌رچه‌ند ڕژێم دریغی نه‌ئه‌كرد له‌لێدانی كورد به‌هه‌موو كه‌س‌و شوێنه‌كانه‌وه له‌وانه بۆردومانی ئۆردوگاكانی زێویٚ له بادینان به فڕۆكه‌و زۆر نامرۆڤانه نزیكه‌ی (٢٠٠) دوو سه‌د كه‌س له ژن‌و منداڵ‌و پیرو گه‌نجیان شه‌هید كرد له‌یه‌ك كاتدا، هێزی پێشمه‌رگه‌یش له‌چالاكیه‌كی به‌رچاودا له (١٩٨٥/٩/٥) توانی له هێرشێكی ئاسایی دا سه‌یته‌ره‌ی نزیك شاری كه‌ركوك ده‌ست به‌سه‌را بگرێت كه ئه‌مه هه‌ڕه‌شه‌یه‌كی ته‌واو بوو بۆ ڕژێم‌و سه‌لماندنه‌وه‌ی توانای ده‌سه‌ڵاتی هێزی پێشمه‌رگه بوو

بۆ هەموو شوێنە حەساسەکانی ڕژێم کە بەخەیاڵی پیاوو دەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم ئەم جۆرە شوێنانە دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە ناتوانن بیانگەنێ، وە ووتوویژ ئاستی پێشمەرگایەتی لاوازکردووە، کە ئەمە بەپێچەوانەوە شکایەوە بەسەریاندا بەئەڵقە لەگوێکانیشەوە.

## کرداره نامرۆڤەکانی ڕژێم دوای کۆتایی ووتوویژ لەگەڵ جەماوەری گەلی کوردا :

ڕژێم لەو ساڵەدا هەروەکو بەرنامەی هەمیشەیی خۆی بەکەوتنە گیان و جەستەی هەموو گەلی کورد بێ جیاوازی لە پێشمەرگەو جەماوەری هەژار، بە داڕشتنی بەرنامەیەکی کێو ماڵکردن (تمشیت) بە بەکارهێنانی هێزەکانی زۆری سەربازی بەهەموو هۆکارە عەسکەری و دەزگاکانی ئەمن و استخبارات لەڕۆژی (١٧/١٠/١٩٨٥) کەوتنە پشکنینی هەموو ماڵەکان و خێزانی جەماوەری شاری سلێمانی و ڕۆژێکی ڕەشیان بۆ خۆیان و ئاغاکانیان تۆمارکرد لە مێژووی ڕەشیاندا بەرامبەر بەگەلی کورد، کە لەناو کوردو جەماوەری سلێمانیدا بەڕۆژە ڕەشەکەی و منع التجول ١٧/١٠/١٩٨٥ تۆمار کراوە، لەدوای ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠و ڕۆژی حوزەیرانی ١٩٦٣و دەهاو سەدەها ڕۆژانی ڕەش ئەم گەلە هەژارەی کورد لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەرانی کوردستانداو لەم ڕۆژەشدا بەدەهاو سەدەها کەس بەبێ تاوان و بەجۆرەها بیانوی نایاسایی و ناشەرعی دەستگیرکران و بە ئەوپەڕی کردەوەی دڕندانەو نامرۆڤانەوە ڕاپێچی زیندانەکان و شوێنی ئەشکەنجەدانەکانیان ئەکردن، وە لەو گیراوانەیش ژمارەیەکیان لێ هەڵبژاردن کە ژمارەیان (٢٠) هاوڵاتی بوون لە کەسانی دیاری و کوردپەروەر لەناو جامیەی کۆنی سلێمانیدا داریان بۆ چەقاندن و زۆر بێشەرمانە گوللە بارانیان کردن و گەیاندنیانە کاروانی شەهیدانی گەلە بێ تاوانەکەیان کە ئەوانیش ئەمانە بوون (شەهیدانی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣یە):

| ژ | ناوەکان | تەمەن |
|---|---|---|
| ١ | ابوبکر حسین محمد | ١٩٦٢ |
| ٢ | ریبوار عوسمان میرزا | ١٩٦٥ |
| ٣ | کمال احمد عبدالرحمن | ١٩٦٥ |
| ٤ | ابراهیم عمر معروف | ١٩٦١ |

---

چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێز وەستا غەفور.

| | | |
|---|---|---|
| ٥ | جزا حمه ئهمین كریم | ١٩٦٤ |
| ٦ | كریم محمود علی | ١٩٦٤ |
| ٧ | محمد علی احمد محی لدین | ١٩٥٣ |
| ٨ | جبار محمد شریف | ١٩٦٢ |
| ٩ | ئاراس كریم میره | ١٩٦٢ |
| ١٠ | محمد ابراهیم محمد | ١٩٥٧ |
| ١١ | كاروان اسماعیل محمد | ١٩٦٥ |
| ١٢ | هوشیار فتاح عبدالكریم | ١٩٦٥ |
| ١٣ | شوان محمود علی | ١٩٦٣ |
| ١٤ | حمه رهووف سعید زوراب | ١٩٤٧ |
| ١٥ | عزیز ابراهیم عزیز | ١٩٥٤ |
| ١٦ | سامان محمد گهوره | ١٩٦٠ |
| ١٧ | سهرسهنگ محمد گهوره | ١٩٦٤ |
| ١٨ | ابراهیم عبدالله عهولا | ١٩٤٨ |
| ١٩ | فهرهاد احمد عوسمان | ١٩٦٣ |
| ٢٠ | خالد حهمه كریم رسول | |

ئهمانهیش بهم جۆره شههیدیان كردنو تهرمهكانیشیان نهدانهوه خاوهنهكانیان ونیان كردن بهناشتنیان لهشوێنه جیاجیاكانی گردی سهیوانو سهربازگهی ساردلو سهرووی رۆژئاوای شاری سلێمانی وه ههموویان خانوهكانیان بهشۆفل تێكداو خێزانهكانیان دهربهدهركردن، وه له رۆژی ١٨/١٠/١٩٨٥، بهسهرپهرشتی عهلی كیمیاوی ئامۆزای سهدامی دیكتاتۆری دژ بهگهلی كورد به بهرچاوی خهڵكهوه لای حهمامی نالی سلێمانی لهههمان ئهو زیندانیانهو بهههمان رهفتاری نامرۆڤانه (٩) كهسی تری دیارو تێكۆشهریان گوللهباران كردو دوای تێكدانی ماڵهكانیان و ئازارو ئهشكهنجهدانی كهسو كاریان، كهئهوانیش ئهم تێكۆشهرانه بوون كه شههیدیان كردن دوای منع تجولی ١٧/١٠/١٩٨٥:

١) مامۆستا خهبات شێخ محمد غهریب باساكی دهرچووی كۆلێجی بهشی فیزیا لهدایك بووی ١٩٦٠

٢) تایهر محمد عمر لهدایك بووی ١٩٣٥.

٣) ئاسۆ تایەر محمد عمر ١٩٦٤

٤) ئامانج تایەر محمد عمر ١٩٦٣

٥) ئامانج احمد غفور ١٩٦٣

٦) دلێر عبدالله عزیز ١٩٦٧

٧) حسێن شەریف محمد ١٩٣٣ کە بەمامۆستا شێخ حسێن دارۆخانی ناسرابوو، مامۆستاو کەسێکی تێکۆشەرو دیار بوو.

٨) زەردەشت حسێن شەریف ١٩٦٦ کوڕی مامۆستا شێخ حسێن.

٩) ئاوات محمد شەریف ١٩٦٧.

تەرمی ئەمانەیشیان نەدایەوەو لە سەربازگەی سارداو شاردیانەوە هەتا دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی گەلی کورد لەبەهاری ساڵی ١٩٩١دا بەرپابوو کە هەموو کردارە چەپەڵو نامرۆڤانەکەی ڕژێمی بەعس تیا ڕیسوا کردو خستیە سەرزەوی‌و بەردەم ویژدانی جیهان ئەم گۆڕە بەکۆمەڵەی شەهیدانە لە ڕۆژی (١٩٩١/٩/٢٥) دۆزرایەوەو هەڵدرایەوەو بە مەراسیمێکی زۆر پیرۆزو شکۆدار لەناو ئامێزی جەماوەری شاری سلێمانی‌و دەوروبەریدا ئەمجارە بۆ هەتا هەتایی بەخاکی گردی سەیوانی دیارو بە ئاشکرا لەبەردەم ڕێزو خۆشەویستی دایك‌و باوك‌وکەس‌و کارو جەماوەری دڵسۆزی سلێمانیدا بەخاك سپێردران، وەکو هەر هەموو شەهیدانی کوردستان، وە لە ١٩٨٥/٣/٣١ لە لایەن سەرۆکی لیبیا (معمر القەزافی) پشتیوانیەکی چاکی لەگەڵ کوردو یەککگرتن‌و سەربەخۆیی گەل‌و نیشتیمانەکەی کرد کە ئەمە چەندەمین هەڵوێستی مەردانەو دیار بوو هەروەکو هەڵوێستی مێژوویی لە کۆنگرەی (بنغازی لیبیا) دا لە ١٩٧٩/١٠/١ بە ئاشکرا دەری بڕی.

## لێدانی ڕژێم لە هەندێ دێهات و ناوچەکان بەفڕۆکە :

وە لەئەنجامی هێرشەکانی ڕژێم بۆ سەر دێهات‌و سنورە ڕزگارو ئازاد کراوەکانی بەردەستی هێزی پێشمەرگە بەگشتی‌و بەتایبەت دێهاتە سنووریەکان بەبیانوی بەرگری لەهێرش‌و پەلاماری سوپای ئێران‌و لەهەمان کاتدا دەرپەڕاندنی هێزی پێشمەرگە لە سنورەکانداو وێرانکردنی دێهاتەکان، ڕژێم بەهێزێکی زۆرەوە پەلاماری سنووری شاربازێڕی نێوان ناحیەی بەرزنجەو قەزای چوارتاو پیری شەوکێڵی دا لەڕۆژی (١٩٨٥/٥/٢٥) هەرچەند بەرگریەکی باش کراو زیانی زۆر لەڕژێم و چەکدارە خۆفرۆشەکان کەوت، بەڵام زۆر بەداخەوە فەرماندەی تیپی ٣١ ی سلێمانی کاك عەلی چوارتایی شەهید

---

* لە یادێکی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستاندا، ڕوونکردنەوە لەگەڵ هەڤاڵ عبداللەی حاجی سەعید.

بوو، لهگهڵ فهماندهى كهرت سالارى حاجى قادر نزارميى، وه له (١٩٨٥/٦/٩) دوژمن هەروەكو پیشەی هەمیشەیی لەلێدانی كورد بێجیاوازی بە فڕۆكە لە ئوردوگای زێوێی بادینانی داو زیاتر له (٢٠٠) دووسهد كهسى لێ شههيدو برينددار كردن كه زۆربهيان ژن و منداڵو پير بوون، وه له ١٩٨٥/١١/١٥عمليهى منع التجول لهناو شارى كهركوك كردو بههەزارەها خەڵكی كوردی دەستگیركردو خستیە ناو زیندانەكانی وه له ڕۆژانى (٢٦بۆ ١٩٨٥/١١/٢٩) وهفدى يهكيتى نيشتيمانى كوردستان بهشدارى كۆنفراسى ميللهتانى بێدەوڵەتی كرد، وه هەر لەم ساڵەداو لە ئەنجامی سەركەوتنی هێزی پێشمەرگەی كوردستان له شهڕى دابان هەلاج و داستانی ڕزگاری منداڵانی هەڵەدن تیپێكیان پێكهێنا بوو لهو ڕۆژگاره سهختهى بهردهم هێرشى ڕۆژانهى فڕۆكهو كيمياوىو تۆپى دوور هاوێژ ئهم تيپه بۆ ماوهى ١٠ ڕۆژ له (١٥ بۆ ١٩٨٥/٥/٢٥) شانۆگەری دابان يان پێشكەش كرد، له زۆرترين دێكانى دۆڵى جافايهتيدا، وه لههاوينى ساڵى ١٩٨٦ دا ڕژێمى عێراق بهبيانوو گرتن بهمامۆستاو خوێندكاران و فهرمانبهران ههموويانى خسته مهشقى سهربازى لهنزيك دبسى كهركوك، كۆمهڵێك مامۆستا بهشداريان نهكردو ئهمرهكهى ڕژێميان شكاند، ڕژێميش فهرمانى دهركردنى بۆ دهركردن كه ژمارهيان(١٨) مامۆستا بوو بهفهرمانى ژماره (٣٤٤٩) له ١٩٨٧/٢/١٢ بهپێى فهرمانى وهزارى ژماره (٩٧٢٣) له ١٩٨٧/١٢/١٦ بهبڕيارى بهناو (مجلس قيادة الثورة) رقم (٩٣٣) له ١٩٨٦/١٢/٢ دا.

به‌گ چون به‌هانایانه‌وه بۆ دورخستنه‌وه‌و ڕه‌وانه‌کردنی بریندارە سه‌خته‌کان، ئینجا له‌شه‌ودا هه‌ر هه‌شت شه‌هیده‌کانیان به‌جله‌کانی خۆیانه‌وه ناشتن له‌دارو شه‌خسه‌که‌ی نزیک دێی شانه‌خسێ وه‌لای سه‌ری هه‌ر شه‌هیدێك ناوونیشانی خۆیان نوسی، له شوشه‌یه‌کی بچوکدا دایان ئه‌نا، ئه‌و شه‌وه‌یش به‌و شپرزه‌یی و کاره‌ساته ناخۆشه‌وه هه‌ر له‌وێ مانه‌وه بۆ به‌یانی واته (١٩٨٨/٣/٢١) کاك شێخ دارای حه‌فید هات به‌ده‌میانه‌وه بۆ هاوکاری بریندارە‌کانیان و هه‌ندێ سێوی له‌سه‌ر ده‌شتی ئێرانه‌وه بۆ هێنابوون، به‌گشتی سنوره‌که‌یان به‌جێ هێشت و مالئاوایی یان له‌سنوری چۆڵ و هاوڕێ شه‌هیده‌کانیان کردو به‌ره‌و سه‌رده‌شتی ناو ئێران ڕۆیشتن، دوایی بۆ بنکه‌کانی سنوری قاسمه‌ڕه‌ش و ناو زه‌نگ، بۆ جارێکی تر خۆسازدانه‌وه‌و وه‌رگرتنی ئه‌رکی پێویست، له‌و سنورانه‌ی پێشمه‌رگه که‌مابوون له‌ژێر ده‌سه‌ڵاتیاندا، لێره‌دا کۆتایی ته‌واو به‌ئه‌نفالی یه‌ك و هێرشی ڕژێم له‌م سنوره‌دا هات به‌م کاره‌ساته سه‌خته.*

## ناوی شه‌هیده‌کانی شه‌ڕی سه‌رکردایه‌تی له هێرشی ئه‌نفالی (١) ی ڕژێمدا

| ژ | ناوی ته‌واوی شه‌هید و نازناوی | پله‌ی پێشمه‌رگایه‌تی | شوێنی شه‌هیدبوونی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | محمد ڕازانی (محمده سور) | فرمانده‌ی تیپی ٦٣ی جوتیاران | شه‌ده‌ڵه |
| ٢ | اسماعیل ته‌ها ئه‌مین (شێخ اسماعیل) | جێگری فه‌رمانده‌ی تیپی ٩٠ | گه‌ڕه‌دێ |
| ٣ | عبدالله اسماعیل | فه‌رمانده‌ی تیپی که‌رتی ٧٨ | قه‌ڵه‌م پاشا |
| ٤ | نامق علی تۆفیق | فه‌رمانده‌ی که‌رتی تیپی زمناکۆ | شه‌ده‌ڵه |
| ٥ | دلێره سوور | فه‌رمانده‌ی که‌رتی ٣ی تیپی ٢٥ | شه‌ده‌ڵه |
| ٦ | میکایل | فه‌رمانده‌ی که‌رتی ١ی تیپی ٨٥ | گه‌ڕه‌دێ |
| ٧ | حکمت محمد وهاب | جێگری فه‌رمانده‌ی که‌رتی ٥ تیپی ٥٩ | شاخی کونه کۆتر |
| ٨ | عبدالرحمن ره‌شید | جێگری فه‌رمانده‌ی که‌رتی ٢ تیپی ٢٩ | قوڵه پوشێن |
| ٩ | هه‌ژار صالح عه‌سکه‌ر | جێگری فه‌رمانده‌ی که‌رتی تیپ له تیپی ٢٩ | قه‌وڵه‌پوشێن |
| ١٠ | عبدالله محمد حسن | جێگری فه‌رمانده‌ی که‌رتی ٦ی ت ٤٢ | شارستێن |
| ١١ | ئه‌رسه‌لان فایق محمد | جێگری فه‌رمانده که‌رتی تیپی ٣٩ | شاخی پیرکه |
| ١٢ | مجید محمد علی | جێگری فه‌رمانده که‌رتی ٣ی ت ٢١ | توکڵ |
| ١٣ | احمد عبدالرحمن | جێگری فه‌رمانده‌ی که‌رتی ٤ی ت٥٣ | کونه کۆتر |
| ١٤ | کامران عباس اسماعیل | فه‌رمانده‌ی مه‌فره‌زه‌ی که‌رتی تیپی ١٩ | شاخی پیرکه |
| ١٥ | مام برایم کریم فتاح | فه‌رمانده‌ی مه‌فره‌زه‌ی که‌رتی ٣ی ت ٢٥ | توکڵ |
| ١٦ | ملا علی | فه‌رمانده‌ی مه‌فره‌زه‌ی تیپی ٣١ | دۆڵه ڕووت |

* چاوپێکه‌وتن له‌گه‌ڵ به‌ڕێزان حداد ته‌ها سلێمان، ئه‌به‌ز زرگوێزی.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٧ | فارس عزیز | فەرماندەی مەفرەزەی کەرتی ٣ی ت ٢٥ | شەدەڵە |
| ١٨ | سیروان حمە فرج | فەرماندەی مەفرەزەی تیپی مەڵبەندی ٢ | قەمچوخە |
| ١٩ | محمد فاتح (حمە بی کەی سی) | فەرماندەی مەفرەزە تیپی ٥٧ | قەڵەم پاشا |
| ٢٠ | کامەران | فەرماندەی مەفرەزە کەرتی ٥ی ت ٨٧ | گەڕەدێ |
| ٢١ | اسماعیل عەسکەری | فەرماندەی مەفرەزەی کەرتی ٥ی ت ٨٧ | هەوارە بەرزە |
| ٢٢ | مامۆستا محسن | رابەر سیاسی تیپی ٨٣ | شەدەڵە |
| ٢٣ | مامۆستا زانا | لێپرسراوی ڕێکخستنی تیپی ٨٣ | شەرگەی شارستێن |
| ٢٤ | مامۆستا محمد رسوڵ | ڕێکخەری تیپی ١٩ | گوندی مەلا سەفێن |
| ٢٥ | یاسین | ڕێکخەری کەرتی ٢ی تیپی ٢٥ | خوڕخوڕە |
| ٢٦ | محمد مستەفا رسوڵ | کەرتی ٣ی تیپی ٤٣ | توکڵ |
| ٢٧ | سلام حمە ئەمین | کەرتی ١ی تیپی ١٧ ی زمناکۆ | قەڵەم پاشا |
| ٢٨ | حسن عبدالله مرزا | کەرتی٢ی تیپی ٥٩ی حەمرین | کونە کۆتر |
| ٢٩ | خلیل ابراهیم محمد | کەرتی ٤ی تیپی ٥٩ حمرین | کونە کۆتر |
| ٣٠ | شوان | کەرتی ٢ی تیپی ٢٥ | شەدەڵە |
| ٣١ | عبدالله رحمان | کەرتی تیپ- تیپی ٩٩ | توکڵ |
| ٣٢ | محمد قاسم | کەرتی تیپی تایبەتی مەڵبەند ١ | کونە کۆتر |
| ٣٣ | جلال عرب | تیپی ٣٩ خنجرە | کونە کۆتر |
| ٣٤ | حسین عزیز قادر | تیپی ٥٣ی شێروانە | کونە کۆتر |
| ٣٥ | حمە ئەمین محمد موراد | کەرتی ٤ی تیپی ٥٣ | کونە کۆتر |
| ٣٦ | جبار توفیق عزیز | کەرتی ٣ی تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون | پیرکە |
| ٣٧ | ادریس سعید امین | کەرتی ٤ی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان | توکڵ |
| ٣٨ | عوسمان احمد(شەماڵ) | تیپی ٦٣ | دابان |
| ٣٩ | عوسمان عبدالرحمن | تیپی ٥٧ی سەگرمە | قەڵەم پاشا |
| ٤٠ | سامان حسن محمود | کەرتی ٥ی تیپی ٥٣ | قەڵەم پاشا |
| ٤١ | هەژار جلال شیرە | کەرتی ٣ی تیپی ٨٥ | گەڕەدێ |
| ٤٢ | حمە عبدالله حمد(حمەسور) | تیپی ٨٧ | توکڵ |
| ٤٣ | بەهرۆز کاکل(ئارام) | تیپی ٢١ی کرکوك | خوڕخوڕ |
| ٤٤ | عبدالمتلب اسعب | تیپی ١٩ | شارستێن |
| ٤٥ | دارا محمد شەفیق | کەرتی١ی تیپی ٨٧ | شارستێن |
| ٤٦ | تالب مەجید | تیپی ٢٥ | شارستێن |
| ٤٧ | مەغدید سەمەد | تیپی تایبەتی مەڵبەندی سێ | شارستێن |
| ٤٨ | احمد | کەرتی ١ی تیپی ٥١ی گەرمیان | قەمچوخە |
| ٤٩ | نازم حمید مجید | تیپی ٥١ی گەرمیان | جادەی سلێمانی.دوکان |
| ٥٠ | هەڵمەت | تیپی ٩٩ | شەرگەی شارستێن- مەرگە |
| ٥١ | هەمزە | تیپی ٩٩ | - |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥٢ | سه‌عید كادر | تیپی ١٢ی سۆران | شه‌رگه‌ی هه‌واره به‌رزه |
| ٥٣ | سه‌عده‌دین(ڕێبان) | تیپی ١٢ی سۆران | - |
| ٥٤ | ئازاد مه‌غدید | تیپی ١٢ی سۆران | - |
| ٥٥ | محمد حسین | تیپی ١٢ی سۆران | - |
| ٥٦ | سه‌عید اسماعیل(كۆچه‌ر) | تیپی ١٢ی سۆران | - |
| ٥٧ | ته‌لعه‌ت | تیپی ١٢ی سۆران | - |
| ٥٨ | عوسمان حمه ئه‌مین | تیپی ١٩ | - |
| ٥٩ | ره‌شاد | تیپی ١٩ | - |
| ٦٠ | مه‌هداوی | تیپی ١٩ | - |
| ٦١ | ڕێباز | تیپی ٧٨ی كاروخ | هه‌وارمبه‌رزه-یاخیان |
| ٦٢ | هۆمه‌ره سور | تیپی ٧٨ی كاروخ | - |
| ٦٣ | ره‌وه‌ند | تیپی مه‌لبه‌ندی ٣ | - |
| ٦٤ | خالید تاڵه‌بانی | تیپی ١٢ی سۆران | - |
| ٦٥ | كریم | تیپی ٨٧ | - |
| ٦٦ | به‌ختیار ابراهیم اسماعیل | پێشمه‌رگه‌ی پشتگیری | زێوێ |
| ٦٧ | محمود حمه ئه‌مین | پێشمه‌رگه‌ی پشتگیری | زێوێ |
| ٦٨ | عه‌تا عبدالكریم | كه‌رتی ٤ی تیپی ٥١ی گه‌رمیان | دۆڵه رووت |
| ٦٩ | ته‌یب فاتیح(ناسۆ) | كه‌رتی٣ی تیپی ٥١ی گه‌رمیان | دۆڵه‌ڕووت |
| ٧٠ | فه‌تحوڵلا مه‌جید احمد | فه‌رمانده‌ی مه‌فره‌زه كه‌رتی٥ی تیپی ٥١ | دۆلچه‌رووت |
| ٧١ | محمد رسوڵ | پارتی | دلبان |
| ٧٢ | كامل شێخ علی به‌رزنجی | فه‌رمانده‌ی مه‌فره‌زه تیپی ٥٥ی قه‌ره‌داخ | |
| ٧٣ | ئارام گه‌رمیانی | تیپی ٥٥ی قه‌ره‌داخ | |
| ٧٤ | فازڵ شێخ علی قه‌ره‌داخی سه‌ركۆیی | فه‌رمانده‌ی مه‌فره‌زه تیپی ٥٥ی قه‌ره‌داخ* | |

* له گۆڤاری (ڕێبازی نوێ) ی ژماره (١) ی ساڵی ١٩٩٠ دا وه‌رگیراوه..

# كۆتایی ئەنفالی یەك و گەڕانەوەی پێشمەرگەكانی هەردوو مەڵبەندی (١و٣) بۆ سنورەكانی خۆیان

مەڵبەندی یەك و مەڵبەندی سێی هەولێرو متفەرقەكان و تیپی ٢١ ی سلێمانی هەموو بەرەودوا ڕۆیشتن بۆ قاسمە ڕەش، بۆ ئەوەی بگەنەوە سنووری خۆیان لەناو كوردستانی عێراقدا، كە بە ناچاری گەڕانەوەی هێزی پێشمەرگە زۆر سەخت بوو، ئەشبوایە بە زوویی هەر هێزە بگەیشتایەوە سنوری مەڵبەندی خۆی، لەبەر ئەوەی ڕژێم بەردەوام بوو لە هێرشەكانی بەناوی ئەنفال هەر جارەو بۆ سنوری مەڵبەندێك، بەناوی ژمارە یەكی ئەنفالەوە، بەتایبەت بۆ پێشمەرگەكانی مەڵبەندی یەك ئەبوایە زوو بگەیشتایەتەوە، لەبەر ئەوەی سنووری قەرەداخ و بنكەو بارەگاكانی مەڵبەندەكە لەقۆپی قەرەداخ هەمووی نەمابوو، تەنیا سنووری گەرمیان مابووەوەو هەموو ئەو هێزانەی لەوێ مابوونەوەو جەماوەری ناوچەكە لە چاوەڕێی ئەم هێزەدا بوون بگەڕێنەوە، كە ئەمانیش بە (حەولە العالەمێك) بەو ڕێگا سەخت و دژوارە بەفراوییەدا ئەبوایە بگەڕایانەتەوە مەگەر هەر بە پێشمەرگەی بەتوانا بكرێت، هێزەكان بەرەودوا لە قاسمەڕەش و ناو زەنگەوە بەڕێ كەوتن، بە ڕێی قەڵاتوكانی چیای سەختی قەندیل داو لەوێوەبۆ ناشقوڵكەو سوورەدێ و پشت ئاشان، دێی وەرتێ و مەلەكان و شیرێ، لەدێی وەرتێی ئەم سنورەوە پێشمەرگەو هێزەكانی مەڵبەندی سێی هەولێر گەیشتنەوە سنورو شوێنەكانی خۆیان، بەڵام پێشمەرگەكانی مەڵبەندی یەك كە بەڕێزان كاك قادری حاجی عەلی و كاك شێخ جەعفەر قەرەداخی لەگەڵیاندا بوو، هەروەها تیپی ٢١ی سلێمانی كە مامۆستا جەمال حاجی محمد فەرماندەی بوو، لەدوای ئەمانەوە بوون، بەڕۆژێك بەرەو یەك ناراستە لە شیرێوە ڕۆیشتن بۆ سكتان و بۆ جەلی لە جادەی كۆیە پەڕینەوە، لەنێوان چنارۆكی هەیبەت سوڵتان و بێستانەوە بۆ دیوی حاجی قەڵای كۆیە، بۆ دێكانی دەشتی كۆیە لە دێی قزڵو بەكەڵەك لەناوی زێی بچوك (زێی دوكان)، هەموو پێشمەرگەكان بەچەند جارێك پەڕینەوە بەكەڵەك پێشمەرگەكانی مەڵبەندی یەك زۆر بەپەلەو لەپێشەوە ئەڕۆیشتن و لەمزۆر شوێنەكان هەواڵیان بۆ پێشمەرگەكانی تیپی ٢١ ی سلێمانی بەجێئەهێشت كە بەپەلە بەدوایاندا بڕۆن تا بیانگەنێ، بەم جۆرە هەردوو ڕەتڵەكە گەڕانەوەی پێشمەرگەكان لەدوای تەواو بوونی شەڕی سەركردایەتیەوە بەرەو سنورەكانی خۆیان، بەتایبەت پێشمەرگەی هێزەكانی مەڵبەندی یەك بۆ سنووری وەرتێ و دۆڵی بالیسان و سماقوڵی و هەندێ لە

شوێنهكانی سنوری ههولێر كه هێشتا بنكهو بارهگاكانیانی لێ مابوو، بارهگای مهڵبهندی سێ له خهتێ بوو، ههروهها پێشمهرگهكانی مهڵبهندی، یهك و تیپی ۳۱ ی سلێمانی بهرهو سنورهكانی گهرمیان، ئهمانه لهدێی شیرهوه هێزه زۆرهكهیان بهرهو دێی چێویێ و كونه فلوسهو كاموسهك و نازهنین و سماقوڵی و لهنزیك دێی گۆپتهپهی دهشتی ههولێر له جادهی كۆیه – ههولێر له ئێوارهدا پهڕینهوهو بهرهو دێی مهرزان و پهڕینهوه له جادهی تهق تهق كۆیه بۆ دێی مهلا زیادی دهشتی كۆیه، ئهو شهوه لهوێ مانهوهو بۆ بهیانی بهكهڵهكی ئهو دێیانه له زێی بچووك پهڕینهوه دێی ساتو قهڵاوه بۆ دێكانی ههنجیره لهوێوه بۆ سنوری ناوشوان، بهرهو چهمچهماڵ بهدێكانی حهیدهر بهگی و لهنزیك دێی گۆرانی و گورگهیی خاسهوه لهنێوان چهمچهماڵ و تهكیهدا پهڕینهوه بهری ههمهوهند، ئنجا بهرهو سنوری سهنگاو بهدێكانی:– خوێلێن و مملحهو گوڵباخ و كۆیی سهر ئاوه سپی و ئینجا لهدێی فهقێ ستهفاوه بۆ دێی مهسۆیهكان و دێی دهربهند دهرهوارهكان كه بهڕێز كاك عومهر فهتاحی لێ بوو لهم كاتهدا لهگهڵ چهند فهرماندهو سهرتیپێك، دانیشتوانی ههژاری دێكانی گهرمیان بهگشتی شپرزهو سهرلێشێواو بووبوون، بهزۆری لهناو دێكاندا نهمابوون بهكهل و پهلی ماڵ و ئاژهڵهكانیانهوه چووبوونه ناو ههردهو كهلۆزو چاڵ و چۆڵ و نهدیوهكانی دوور له دێكانیانهوه، خانوهكانیان بهچۆڵی مابوونهوه، لهشهودا سهریان ئهدایهوه بۆ بردنی پاشماوهی ئهو كهل و پهلانهی بهجێیان هێشتبوو، لهگهڵ ئهم باره نالهبارو خراپهدا، خهڵكی ئهم سنووره زۆر بهورهو دڵسۆزانه هاوكاری پێشمهرگهیان ئهكرد، بهئومێدهوه ههوڵی مانهوهی خۆیان ئهدا، لهماوهی خهباتی شۆڕشی نوێخوازدا بۆ یهكهم جاربوو ئاوا لێیان بقهومێ، بهگهورهترین كارهساتی ژیانیان ئهزانی، چونكه تێكڕا جهماوهری سنوری ههموو گهرمیان به ژن و پیاوو گهنج و پیرهوه به خاوهنی باوهڕی ڕاستهقینهو ههستی شۆڕشگێڕی كوردایهتی بوون، لهسهرووی پێشمهرگهوه خۆیان بهههستی لێپرسراوێتی دائهنا، زۆرترین كوڕو پیاوهكانیان لهڕیزی پێشمهرگهو بهرپرسێتیدا بوون، ئهوانی تریان وهكو هێزی پشتگیری بهباوهڕ ههمیشه ئامادهو له سهنگهری پێشمهرگهدا بوون و ژن و پیرهكانیشیان ههمیشه هاندهرێك بوون بۆ خهبات و گیانی كۆڵنهدانی پێشمهرگایهتی و خاوهنی دهها شههیدی پیاوو كوڕی ڕۆڵهی جگهر سۆزیان بوون و زۆر بهشانازیهوه باسیان ئهكرد، ماڵیان بهردهوام دهرگای لهسهر پشت بوو بۆخزمهت و حهوانهوهی پێشمهرگه، ئهو خواردنهیان لاچاك بوو كه دهرخواردی پێشمهرگهی بدهن، پێشمهرگه لهههموو سنوری گهرمیاندا وهكو ماڵ و كهس و كاری خۆیان ڕهفتاریان لهگهڵ ئهكرا، بهجۆرێ دابهش بوون نهبوو، ئهو پێشمهرگانهشی كه خهڵكی ئهم

سنووره نەبوون ئەگەر بریندار یان شەهید بونایە بە ئەوپەڕی ڕێزەوە بۆ بریندارەکان یان نەخۆشەکان لەناو منداڵو خێزانی خۆیاندا خزمەتیان ئەکردن، بەجۆرێك دڵیان ئەدانەوە وایان ئەزانی لەناو ماڵی خۆیانو لای دایكو باوکیانن، ئەوەندەی تر هەستی شۆڕشگێڕیو پێشمەرگایەتیان بەهێزتر ئەبوو، بۆ شەهیدەکانیش کۆڕی لاواندنەوەی ژنانو پرسەی بەسۆزو پڕ بە بایەخیان بۆ دائەنان، ئەم سنوره پشتو پەناو قەڵایەکی پڕ لەشانازی گیانو هەستی شۆڕشگێڕی، باوەڕی لەبن نەهاتووی هێزی پێشمەرگە بوو، جگە لەوە جێگای حەوانەوەو پاراستنی گەنج و لاوو کەسانی هەڵاتوو سەربازی ڕاکردووی هەموو سنورەکانی کوردستان بوو هەر لە بەغداو خانەقینو دووزو کفریو کەلارو کەرکوكو شوێنەکانی تر، کە لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمو دەزگاکانی هەڵ ئەهاتن پەنایان بۆ سنوری گەرمیانی دڵسۆز ئەبرد، زۆر بەڕێزو وەفاوە هاوکاریو مامەڵەیان لەگەڵ ئەکردن، لەهەمان کاتدا جێگای پشوو بەیەکگەیشتنو مانەوەو سەردانی ژنو منداڵو کەسو کاری پێشمەرگەکان بوو، بۆ دیدەنیو چاو پێکەوتنیان، بەدرێژایی کاتەکانی ژیانی پێشمەرگایەتی لەم سنورەدا، لەهەمان کاتدا قەڵایەکی سەختو پڕ لەقینی پەنگ خواردوەی چەند ساڵەی ڕژێمی بەعس بوو، هەمیشە بەچاوێکی تۆڵەوە سەیری ئەم سنورەی ئەکرد، کرداری دوژمنی سەرەکی بۆ خەڵكو دانیشتوانەکەی ئەکردن، بێبەری کردبوون لەهەموو ڕەسمیاو خواردەمەنیو کەلو پەلێکی پێویست بۆ ئەم سنوره تەنانەت چاودێری سەختی دەزگاکانی لەهەموو سنورەکانەوە لەسەر هاتووچۆکەران و سەیارەو تراکتۆرەکانیش دانابوو، بەهەموو سوتەمەنیەکانی گازو نەوتو غازو شتی ترو سەرچاوەی ژیانیش، ئەمانیش زۆر بێباکانە ئەژیانو سەروەریان بەمانەوەیان بەو ئازادیە دائەنا کە لەژێر دەسەڵاتی پڕ لەشانازی پێشمەرگایەتیدا بژینو بمرن، هەر بۆیە سەلماندیان کە زۆرترین قوربانیان دا.*

**ئەنفالی ۲ ی قەرەداغ:**

ئەم ئەنفالە بۆ سەر دێکانی سنوری ناوچەی قەرەداغ کرا، کە لەسنوری کۆتایی ناوچەی بازیانەوە دەست پێئەکات هەتا دێکانی نزیك دەربەندیخان، لەنێوانو بەدرێژایی هەردوو شاخی بەرانانو قەرەداغ لەلایەكو قۆپیو سەگرمەو زمرنە لەلاکەی تر، لەکاتێکدا ئەم هێرشەی ڕژێمی بەعس دەستی پێکرد کە نزیکەی ۷۰ ٪ ی پێشمەرگەکان لەشەڕی ئەنفالی (۱)ی بەرگری لەسنورەکانی مەڵبەندی ۲ و بارەگای بەڕێز مام جەلالو

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز خالید مامە مەجید کە لەگەڵ هێزەکەدا بوو.

سه‌ركردایه‌تی له سه‌رگه‌ڵوو به‌رگه‌ڵوو بوون، كه به‌سه‌رپه‌رشتی به‌ڕێز كاك قادری حاجی علی لێپرسراوی مه‌ڵبه‌ندی (١) و به‌ڕێز كاك شێخ جه‌عفه‌ر لێپرسراوی به‌شی عه‌سكه‌ری مه‌ڵبه‌ند ڕۆیشتبوون، له‌سنوری مه‌ڵبه‌ندی یه‌كیشدا كه بارەگاكه‌ی له‌شاخی قوڕی قه‌ره‌داخدا له‌ئاستی ڕێی گۆشان بوو، به‌ڕێز كاك عومه‌ر فه‌تاح ئه‌ندامی مه‌ڵبه‌ندو لێپرسراوی به‌شی ڕێكخستنی كۆمه‌ڵه‌بوو سه‌رپه‌رشتی ئه‌كرد، كافیه‌خانی هاوسه‌ری له‌گه‌ڵیدا بوو به‌ڕاستی ڕۆڵی چاكی بوو هاوكاری ئه‌كرد، له‌و فه‌رمانده تیپانه‌ی مابوونه‌وه به‌ڕێزان: كاك جه‌میل هه‌ورامی ف/ت ١٧ ی زمناكۆ، كاك مه‌حمود سه‌نگاوی ف/ت ٥٧ی سه‌گرمه، كاك عه‌دنانی حه‌مه‌ی مینا ف/ت ی تایبه‌ت، جه‌لال كوڵكنی ف/ت ی شاره‌زوور له‌دێی كۆره، لاله سه‌رحه‌د ف/ت ی ٢٩ ی خنجه‌ره‌و باره‌گاكه‌ی له سوڵه‌و له‌شاخی خنجه‌ره بوو هه‌روه‌ها كاك ئازادی سه‌گرمه له‌سنووری تیپی ٥٧ ی سه‌گرمه دانیشت بوو پێشتر به‌ڵام وه‌كو به‌رنامه‌و ئه‌ركی هه‌موو پێشمه‌رگه‌و لێپرسراوانی ناو شۆڕشی (ی.ن.ك) له‌كاتی پێویستدا ئه‌بوایه ڕاسته‌وخۆ په‌یوه‌ندی بكردایه‌ته‌وه به‌شوێنێك یان سه‌رووی خۆی له‌و سنوره ئاگادار بكردایه بۆ دیاریكردنی جێگاو شوێنی پێویستی به‌ڕاستی ئه‌مانیش فه‌رمانده ئاسا ڕۆڵیان بینی. هێرشه‌كانی ڕژێم زۆر به‌ربڵاو له‌چه‌ند لایه‌كه‌وه بوو، له‌سنووری زه‌ڕایه‌نی شاره‌زوور به‌ره‌و دێی ده‌ربه‌ن فقره‌و ئاوه‌كه‌ڵه، له یه‌خشی شاره‌زوور به‌ره‌و زه‌ڵه ڕه‌ش و شاخی گه‌وره قه‌ڵاو ێی سوڵه، له جاده‌ی برجه‌كه‌ی قه‌ره‌داغ به‌ره‌و سه‌رشاخی گڵه‌زه‌رده‌و قوته‌ی به‌رزی میریاسی، كه پێشمه‌رگه‌كانی حزبی شوعی پێوه‌بوو، به‌شێكیش له قسرته‌وه به‌ره‌و دێكانی شه‌مه‌و وێڵه‌كه، كه پێشمه‌رگه‌ی پارتی لێبوو شه‌هید صه‌لاح لێره‌دا شه‌هید بوو، له‌لایه‌كی كه‌شه‌وه به‌سه‌ختی له‌سنوری بازیانه‌وه به‌ره‌و دێكانی سوڵه‌و دێلێژه، ئه‌م قۆڵه ئه‌یانووت ئه‌فسه‌ری درنده بارق احمد حاجی حنته سه‌رپه‌رشتی ئه‌كرد، زۆربه‌ی ئه‌نفال كراوه‌كان له‌م سنوره‌دا به‌ده‌ستی ئه‌م كرا، له چه‌مچه‌ماڵیشه‌وه به‌هه‌موو جاده‌دا به‌ره‌و سه‌نگاوو ڕه‌بات و هه‌زاركانی ئه‌ودیوی شاخی سه‌گرمه به‌بن شاخه‌كه‌دا به‌دیوی گه‌رمیاندا، له‌لایه‌كی تریشه‌وه له سنوره‌كانی نێوان دێی میره‌دێ و ده‌ربه‌ندیخانه‌وه به‌ره‌و چه‌مه‌رگه‌و باوه‌خۆشێن و دێكانی عه‌لیاواو بەڵخه‌و سێوسێنانی شه‌هیدی كیمیاوی و دێی به‌له‌كه‌جاڕ، كه ئه‌میش به‌هه‌مان كردار كیمیاوی لێدرا، به‌شێكی ئه‌م لایه به‌ره‌و دێی كه‌ڵۆش كه له‌گه‌ڵ به‌شه‌كانی كه‌دا یه‌كیان ئه‌گرته‌وه هه‌ڵگه‌ڕان به‌ره‌و شاخی قه‌ڵا قایمسی ناوه‌ڕاستی ناوچه‌ی قه‌ره‌داخ كه ئه‌م شاخه پێشمه‌رگه‌كانی تیپی تایبه‌تی به‌سه‌ره‌وه بوو، له‌و فه‌رمانده كه‌رتانه‌یان: كاك ئه‌نوه‌ری حه‌لاو، كاك سه‌اد خانه‌قینی، كاك ئیمام كه به‌داخه‌وه له‌بناری قه‌ندیل شه‌هید بوو، كاك

حسین قاسم، کاك بەختیاری مەلا عزت ڕابەر سیاسی ئەم تیپە بوو لەسەرەتادا لەگەڵ کاك عەدنان لەگەڵیاندا بوو لەسەر شاخی قەڵا قایمس لەشەڕەکەداو زۆر قارەمانانە بەرگریان لە هێرشی دوژمن ئەکرد، پێشمەرگەکانی حزبی سۆشیالست لەپشت دێی بلیکان بوون بەشداری شەڕی سنووری خۆیان ئەکرد، بنکەی لقی سلێمانیو لقی کەرکوکی پارتی لەدێی جافەران بوون پێشمەرگەشیان هەبوو لەدێکانی بناری شارەزوور (شەمەو وێڵەکەو ئاوەکەڵە)، لەلایەکی تری هێرشی ڕژێم بۆ سەر ئەم سنوورەو لەم ئەنفالەدا لە سنوری خۆرئاوای دەربەندیخانو دێی بانی خێڵان بەرەو شاخی زەردەکە بەڕاستی بەرگری چاکی تیاکرا لەلایەن پێشمەرگەکانی تیپی ١٧ ی زمناکۆ بەسەرپەرشتی جمیل هەورامیو شەهید ئەنوەری خەلیفە خورشید کە بەداخەوە لەدەشتی کۆیە لە مێژوو ١٩٨٨/٥/٤ لە تەکەڵتوو لەکاتی هێرشی ئەنفالی ٤ شەهیدبوو، هەروەها پێشمەرگەی کادر عمر چەوتانیو عوسمان بیەڕەشکەیی ناوچەی شۆڕشگێران، لەگەڵ ژمارەیەك پشتگیری سنوری گەرمیان بەشداری ئەم قوڵەی شاخی زەردەیان کردو سەرپەرشتی ئەم قوڵە بەڕێز کاك محمود سەنگاوی بوو کە مام صالح گۆڕ ئەسپیو مەلا احمدی جەیرانو شێرزاد محمد عەزیزو نزیکەی زیاتر لە ١٠٠ پێشمەرگە پشتگیری گەرمیانو قەرەداخ بوون، هێرشەکەی ڕژێم بەپشتیوانیو بەکارهێنانی تۆپی دوورهاوێژ هاوەن، لەمەر شوێنێکەوە ڕەصەدی خۆیان دیاری کردبوو بۆ شوێنو بارەگاکانی پێشمەرگەو بێدەست پاراستن لەهەموو دێکان، لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٢٢ەوە هەموو چالاکیە سەربازیەکان لەهەموو قوڵەکانەوە ئامادەکرابوو.

## لێدانی کیمیاوی لە دێی سێوسێنانی قەرەداخ

لەشـەوی ٢٢ و٢٣ /١٩٨٨/٣/ لـەکاتی نـان خـواردنی ئێـوارەدا لـە سـەربازگەی دوو دارەوە بەتۆپی کیمیاوی زۆر بەخەستیو نامرۆڤانە لە دێی سێوسینانی پڕ لەژنو منداڵو جوتیاری هەژاری دا کە ڕاستەوخۆ بەر دێکە کەوتو هەر لەیەك ماوەی کەم دا نزیکەی (٦٧)کەس شەهید بوون و دەها بریندارو ماڵوێران کرا..

ڕژێمی بەعسی بەو هەموو جۆرە هێرشە دڕندانەی بۆ سەر ئەم ناوچەیە وازی نەهێنا، هەتا بۆ دواجار هەڵمەتێکی فراوانی لەچوار قۆڵەوە بەناوی شومی ئەنفالی ٢ی قەرەداخ لە شەوی ٢٢ر٢٣ / ١٩٨٨/٣ دا بەهەموو هێزو توانای عەسکەریو جۆرە چەکەکانیانەوە کردە سەری، سەرەتا لە ئێوارەی ئەو شەوەدا بەکیمیاوی بارانی خەستی دێی خاوەن خەباتو خزمەتی بێوێنەی پێشمەرگە کە دێی (سێوسینان)ی هەمیشە زیندووی قەرەداخ بوو دەستی پێ کرد، بە ڕاجیمە لەنزیك سەربازگەی دوو دارەو ئەم دێیە مێژوویەکی دێرینی هەیە لەم سنورەداو لەبنەڕەتدا خێزانێك بەناوی (سەید حسێن) ئاوەدانی کردۆتەوە ئەمانە ڕۆیشتوون دواتر ناوەکە هەر کەس چووەتە ئەوێ ئەو ناوە کراوە ب سەید حسێنیەکانو بووە بەسەیدو سەینیەکان ئینجا (سێوسینان)و لەو بنەماڵە خێزانانە کەتیا جێگیر بوون قادر وەیسو محمود خدرو کوێخا حەسەن کە باوکی کوێخا زۆرابو باپیرەی کوێخا نەجمو دوایی حەمە سوور و فەقێ محمدو حسێن گەرمیانی، بەڵام زۆر بەشانازیەوە ئەوەندە پێکەوە ژیاوون وەکو یەك بنەماڵە بوون لەناو کارەساتی کیمیاویەکەی ڕژێمیشدا لەیەك شەودا (٦٧) شەهید لەمناڵی شیرەخۆرە هەتا کوڕو کچی عازەبو پیر پێکەوە خەڵتانی کیمیاوی بوونو قوربانیان دا، کە گەورەترینو سەخترین قوربانیو کارەساتی ئەم سنورەو کوردستان بوو لەدوای شاری هەڵەبجەی شەهید.

ناوی شەهیدەکانیشی بەگشتی و بە پێی خێزانەکانیان ئەمانەیە:

## ناوی تەواوی شەهیدی کیمیاوی بارانی دێی سێوسێنانی قەرداغ

| ژ | ناوی شەهیدەکان | ژ | ناوی شەهیدەکان |
|---|---|---|---|
| ١ | مەلیحە عبدالقادر مەجید (٣٤) ساڵ | ٣٥ | خاتوون سلێمان احمد (٦٠)ساڵ |
| ٢ | پەیمان عوبێد محمود (٨) ساڵ | ٣٦ | محمد فەریق محمود (١٤ ) ساڵ |
| ٣ | تابان عوبێد مەحمود ( ٦) ساڵ | ٣٧ | هیوا فەریق محمود (١٨) ساڵ |
| ٤ | ڕۆژگار عوبێد مەحمود (٥) ساڵ | ٣٨ | هۆما نەجم زۆراب ( ٣٩) ساڵ |
| ٥ | ڕزگار عوبێد محمود ( ٤) ساڵ | ٣٩ | گۆران کەریم وادی ( ٥ ) ساڵ |
| ٦ | کوردە عوبێد مەحمود ( ٢ ) ساڵ | ٤٠ | خدیجە حەسەن احمد (٥٨) ساڵ |
| ٧ | یادگار عوبێد مەحمود ( ١) ساڵ | ٤١ | محمد احمد عبدالکریم (١٥) ساڵ |
| ٨ | نەریمان ئیدریس هەورامی ئەمە پێشمەرگەیەك بوو هەر لەم ماڵەدا شەهید بوو بەمیوانی تازە گەڕابووە لەکارەساتی کیمیاویەکەی هەڵەبجەی شەهید لەو ماڵەدا باسی لە کیمیاویەکەی هەڵەبجە کردبوو.. | ٤٢ | زەیدان محمد حەمە فەرەج (٢١) ساڵ |
| ٩ | ڕەحیم پێنجوێنی ئەمیش هەر پێشمەرگەیەك بوو ئەو کاتە لەدنیێکە گەڕابووەوە. | ٤٣ | تاهیر محمد حەمە فەرەج (١٨)ساڵ |
| ١٠ | مەهدی هادی نەجم ( ٥٧ ) ساڵ | ٤٤ | زەینەب احمد فارس (٣٨) ساڵ |
| ١١ | شەوقی تۆفیق محمد (٥٣) ساڵ | ٤٥ | سەردار احمد عبدالقادر (٣) ساڵ |
| ١٢ | فایەق مەهدی هادی (٢٦) ساڵ | ٤٦ | شنۆ احمد عبدالقادر ( ٢ ) ساڵ |
| ١٣ | عبدالله مەهدی هادی ( ٢٥ ) ساڵ | ٤٧ | غەیدان حسێن ڕەشان (٢٨) ساڵ |
| ١٤ | نەوشیروان مەهدی هادی (٢١) ساڵ | ٤٨ | عەلادین عمر حسێن ڕەشان (١٦) ساڵ |
| ١٥ | زهدی مەهدی هادی ( ٢٠ ) ساڵ | ٤٩ | پەیمان عومەر حسێن ( ١٠ ) ساڵ |
| ١٦ | هیدایەت مەهدی هادی (١٦) ساڵ | ٥٠ | حەمە ئەمین أسماعیل شەریف (٥٤) ساڵ |
| ١٧ | ئومێد مەهدی هادی ( ١٣ ) ساڵ | ٥١ | خانم صابر وەسمان (٥٣) ساڵ |
| ١٨ | زمناکۆ مەهدی هادی (٨) ساڵ | ٥٢ | شەهاب حەمە ئەمین اسماعیل (١٠) ساڵ |
| ١٩ | بێستون مەهدی هادی ( ٦) ساڵ | ٥٣ | بەناز حەمەامین أسماعیل(٤) ساڵ |
| ٢٠ | ئاوات فایەق مەهدی ( ٤ ) ساڵ | ٥٤ | فاتمە حەمە ئەمین أسماعیل (١٤) ساڵ |
| ٢١ | ئاشنا فایەق مەهدی ( ٢) ساڵ | ٥٥ | بەهیە تۆفیق حەسەن (٤٣) ساڵ |
| ٢٢ | فەریق سەعید صاڵح ( ٣١ ) ساڵ | ٥٦ | جەزا ڕەزا محمد امام (١٩) ساڵ |
| ٢٣ | دادام عبدالقادر مەجید ( ٢٢ ) ساڵ | ٥٧ | بابان ڕەزا محمد امام ( ١٦ ) ساڵ |
| ٢٤ | ئاسۆ فەریق سەعید ( ٦ ) ساڵ | ٥٨ | سەبیحە ڕەزا محمد امام (٢٤) ساڵ |
| ٢٥ | ئاشنا فەریق سەعید ( ٧ ) ساڵ | ٥٩ | زینەت فەریق محمود ( ٢٤ ) ساڵ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| هێمن حەسەن احمد ( ٤ ) ساڵ | ٦٠ | تانیا سەعید صالح ( ١١ ) ساڵ | ٢٦ |
| شادان حەسەن احمد( ٣) ساڵ | ٦١ | ڤانیا فەریق سەعید ( ١ ) ساڵ | ٢٧ |
| شادی حەسەن احمد ( ٢ ) ساڵ | ٦٢ | تاهیر نەوزاد حەمە ئەمین | ٢٨ |
| هەردی حەسەن احمد ( ١ ) ساڵ | ٦٣ | ئەختەر حسێن محمد ( ٣٢ ) ساڵ | ٢٩ |
| ڕەفیق صدیق حەمە ئەمین (٣٣) ساڵ | ٦٤ | مەهاباد غەیدان محمد ( ١٥ ) ساڵ | ٣٠ |
| چنور فایەق نەجم ( ٢٠ ) ساڵ | ٦٥ | عبدالله عبدالعزیز زۆراب (٤٩ ) ساڵ | ٣١ |
| ئەسمەر صدیق حەمە ئەمین (٢١) ساڵ | ٦٦ | شادی عبدالله عبدالعزیز (٥) ساڵ | ٣٢ |
| ئاواز صدیق حەمە ئەمین (١٠) ساڵ | ٦٧ | کەژاڵ عبدالله عبدالعزیز (١٩) ساڵ | ٣٣ |
| | | عائشە عبدالکریم احمد (٥٧) ساڵ | ٣٤ |

وە نزیکەی زیاتر لە ٣٠٠ کەس منداڵو ساواو گەنج و پیری ئەم دێیە بریندار بوون، تیایاندا پیرەژنێك بەناوی (مەعروب صالح محمود) لەدوای کوێربوون لە کۆمەڵگای نەصر مرد، ئەم بریندارانەش بەنهێنی چارەسەرئەکران، عمر حسێن ڕەشان هەر بە شەلەلی ماوەتەوە، وە لەهەمان شەوی ٢٢ ر٢٣ /١٩٨٨/٣ و لە کاتژمێر نزیکەی (٤٠ :١١)ی شەودا بە ڕاجیمەو تۆپی کیمیاوی لەدێی (دوکان)ی قەرەداغی دا، کە بنکەی تیپی ٥٥ ی قەرەداغی تیابوو چەندەها پێشمەرگەو خەڵکی برینداکرد لەوانە پێشمەرگەی دێرین کاك زۆرابو خێزانەکەی، مامۆستا سۆرانو حەمە ڕەزای کادرو بەهزادو....دوو کەسی شەهیدکرد کە یەکێکیان کچە عازەبێکی ١٨ ساڵی بەناوی گەردە احمدو ئەوی کەیان قەدریە عزت عبدالقادر خێزانی محسن حەمە فاتیح کە خاوەنی دوو منداڵی بچووك بوو لەوکاتەدا، سەیر لەوەدابوو ئەم ژنە خەڵکی دێی سێوسێنان بوو، لەهەمان کاتدا لەدێی دوکان بەرکەوتو شەهیدبوو، هەر لەو شەوانەدا کیمیاوی لەدێی بەلەکەجاڕی بنکەی تیپی ١٧ی زمانکۆی داو پێشمەرگەی عەدەد جیهازی تیپەکە بەناوی (وشیار) شەهیدکردو چەندەها پێشمەرگەی بریندارکرد لەوانە حەمەبۆر قرگەیی و صابیرە بچکۆلو چەند پێشمەرگەیەك شەهیدبوون لەوانە وشیار هەر لە ژوورەکەی خۆیدا بە بەتانیەکەوە پێچرایەوەو نێژرا. لەچەند شەوی دوایی لەدێی جافەرانی دا بەکیمیاوی، هێرشی ئەنفالی (٢) ماوەی ١٠ ڕۆژی خایاندو خۆڕاگری خەڵکەکە هەتا دواکاتی مانەوەیان لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا بوون، بەخۆیانو خێزانیانەوە بە ئەوپەڕی ئومێدی مانەوەیان بوون، لەژێر سایەی ئازادی پێشمەرگەدا نەك بەرەو کۆمەڵگا زۆرەملێکانی ڕژێم لە نەصرو باریکەی شارەزوور، کاتێك هێزی پێشمەرگە ناچار کشایەوە بەرەو گەرمیانو بنکەو بارەگاکانیان لەهەموو شوێنەکان و مەڵبەند لە قۆپیەکان سوتاند، ئینجا خەڵکەکە بەبێ ئومێدی بەرەو لای ڕژێم ڕۆیشتن و تووشی

کارەساتی بەئەنفال کردنی چەندەها ڕۆڵەو کەسوکاری خۆیان بوون، هەرچەندە بەمەبەستی دوورکەوتنەوە لەدەستی ڕژێم چەندەها ماڵیان خۆیان گەیاندەسنوری دێکانی گەرمیان، زۆر بەداخەوە لێرەیش بەر زیان کەوتن، لە ئەنفالەکانی ئەم دێیانە: دێی عەلیاوای قەرەداغە کە بە بەڵخەی خوارویش ناسراوە، خەڵکی ئەم دێیە لە هەڵمەتی ئەنفالی قەرەداغدا بەرەو گەرمیان ڕۆیشتن بەنیازی دەرباز بوون لەدەستی ڕژێم، بەڵام زۆر بەداخەوە لەڕۆژی (١٥/٤/١٩٨٨) لەکۆتایی ئەنفالی ٣ی گەرمیان (٤١) کەسیان گیراو ئەنفال کران، لەهەمان شەو کە لەدێی دوکان درا بەراجیمەی کیمیاوی چەند کادرێك بریندار بوون لەوانە کاك بەهزادو کاك حەمە ڕەزا ئیبراهیم هەموو ئەو خێزانانەی کاك ڕەزای دوکاندارو کاك محمودی خەزوری کە دە سەر خێزان بوون کیمیاوی لێی دابوون گواستیەوە بۆ دێی دوکەرۆ، لە بەرەبەیانی ١٩٨٨/٣/٢٣، دا هێرشی سەربازی بە مودرەعەو زرێ پۆش‌و بەپشتیوانی تۆپ‌و هاوەن لەهەموو قۆڵەکانەوە دەستی پێکرد، لەسەرەتادا هێرشە زەمینیەکە لەسەرخۆ وەکو مەشغول کردن بوو بەمەبەستی سەرف پێکردنی تەقەمەنیەکانی هێزی پێشمەرگەو زانینی تەواوی بەرەکانی شەڕی بەرگریان، لە ماوەی دوو ڕۆژدا بەم شێوەیە بوو، بەرەکان لەهەموو قۆڵەکانەوە دامەزران شەڕ تا ئەهات بەرەو خەستی‌و نزیك بوونەوەی هێزەکانی ڕژێم ئەچوو، شاڵاوەکانیان زیاترو نزیکتر ئەبوەوە، لە شاخەکان‌و لە بەرزاییەکان کاك وەستا تۆفیق خەراجیانی ئەو کاتە کادری کۆمەڵایەتی بوو لەدێی دەربەن فەقرەی ڕووی شارەزوورەوە زۆر ئازایانە بەری لەو هێرشە گرتبوو، کە لەزەرایەن‌و دێی دسکەرەوە سەرکەوتبوون، چەند پێشمەرگەیەکی کەمی لەگەڵدا بوو، هەتا ژمارەیەك پێشمەرگەی پشتگیری لەسنوری دێکانی ئەستێڵەکانەوە بۆ گەیشت، لەوکاتەدا بەڕێز ئەرۆیشتن کە سەریان بخات بۆ بەرزاییەکەی بەردەم دێی دەربەن فەقرە یەکێکیان لەدواوە هەندێك دواکەوت هاوەنێك هات لێی داو شەهیدی کرد، لەڕۆژی سێیەمدا واتە ١٩٨٨/٣/٢٥ بەتەواوی هێرشەکەی ڕژێم زۆر سەخت بوو، لەگەڵ تۆپ بارانێکی زۆرو چڕ کەتوانیان سەرکەونە سەر شاخەکانی هەموو سنورەکان و پێشڕەویان کرد، هێزەکانی پێشمەرگەیش پاشەکشەیان دەست پێکرد بەرەو ناوەڕاستی ناوچەی قەرەداغ، پەڕینەوە لەئاوی دێوانە بۆ دێکانی بەری قۆپی، لەگەڵ هێرشەکاندا سەربازو چەکدارەکانی ڕژێم دەستیان کرد بەسوتاندنی ئەو دێیانەی ئەیان گەیشتنێ، هەرچەند زۆربەی ماڵەکان بەتۆپ ڕووخا بوو، لەگەڵ تاڵان کردنیان لەم کاتەدا دانیشتوانی گوندەکانی ئەم ناوچەیە کەچەند ڕۆژ لەوەوپێش لەدێکان دەرچووبون بە هەندێ کەل‌و پەل‌و ئاژەڵ‌و ولاخەکانیانەوە لەدووری دێکان لە چاڵی‌و چۆڵی خۆیان حەشاردا بوو بەئومێدی ئەوەی هێرشەکە بشکێت‌و بچنەوە ماڵەکانیان، چونکە هەر هەموو بێزاربوون لەژیانی ناو

کۆمەڵگا زۆرەملێکان و مردنی خۆیان پێ باشتربوو لەوەی دێ و زەویەکانیان بەجێ بهێڵنو بچنە ژێر دەسەڵاتی ڕژێم، بەڵام بەداخەوە ئەو ئاواتەیان ئەو کاتە نەهاتە دی و کاتێك ئومێد براوبوون هەر هەموو بەشپرزەیی و ناچاری هەر کۆمەڵە کەسێك لەهەر شوێنێکەوە بۆی بکرایە بەرەو سنورەکانی بەردەستی ڕژێم ڕای ئەکرد، هەر شوێنە بەپێی لای خۆیەوە، بەزۆری بەرەو کۆمەڵگاکانی نەصرو برایەتی و زەرایەن و عەربەتی سنووری شارەزوور، ئەوانەی دێکانی ڕووی بازیان بەرەو کۆمەڵگاکاکانی ئەڵڵایی. زۆریش بۆ ناو شاری سلێمانی و خۆشاردنەوەیان لەناو ماڵە خزمو ناسیاوو دۆستەکانیاندا بە ئەوپەڕی ترس و لەرزو نائومێدیەوە، ئێمەیش وەکو پێشمەرگە لەو سنورانەدا بووین هەمووومان و هەریەکەمان لەهەر شوێنێکەوە لەگەڵ خەڵك و ژن و منالی ئەو دێیانەدا ژن و منالەکانی خۆمانمان ناردەوە بۆلای کەس و کارەکانمان لەناو شاری سلێمانی و کۆمەڵگاکاندا، کاتێك خێزانەکەم و منالە بچوکەکەمان بەناوی (دیار) پێنج مانگانە بوو تازە گەیشتبوونەوە لام ماڵمان لە دێی شیوی قازی بووین بەپەلە ئەو ڕۆژە گوێ دریژێکی عمر هەژارم بۆ گرتن کە بیگەیەنمە دێی فەقێرە، دەمەو ڕۆژئاوابوون گەیاندنمە دێکە، لەگەڵ ژنەکەی مامۆستا عەلی بچکۆل پێنجوێنی و حاجی عبداللەی باوکی و ژن و منالەکانی: حەمەخان و غەفورو ناصر مۆریاسی هەموویانمان دایە دەستی کاك مستەفای حاجی قادر ئاوەکەڵەیی، کە لەم کاتەدا سعدەخان لە سلێمانیەوە گەڕابووەوە هەموو خەڵکی دێی فقیرەو کەل و پەل و ئاژەڵەکانیان کۆکردەوەو لە تاریکی دا بەرەو دەربەن فەقەرەو قسرت و کۆمەڵگاکان بەڕێکەوتن، ئێمەیش خواحافیزی دوا ڕۆژێکی نادیارمان لەیەکتری کرد، دوای ئەوەی من لەهەموو کە لو پەلی ماڵەکەی خۆمان تەنیا تاقمی ڕیش تاشینەکەم و یەك دەستە کوێزانم خستە گیرفانی چاکەتەکەم، هەتا قاتێ جلی کوردیم بۆ هاتبوو بەهیوا بووم لەو نەورۆزەدا لەبەری بکەم بەناچاری ناردمەوە، وا ڕێکەوت ئەو قاتەم لەشارۆچکەی پیرانشهر (خانەی)ی ئێران لەبەر کرد، کە هەر ئەوکاتە بەخێزانەکەم ڕاسپارد کە هەرچیمان هەیە لەسلێمانی بیفرۆشێت و هەرکات گەیشتینە جێیەك ئەگەر مابن و ئەو شوێنەیش بناری قەندیل بوو ووتم تەنیا پارە بێنەو هەرواشی کردبوو دوای دوو مانگ و نیو لە ١٩٨٨/٦/٣ لەدێی قرناقای بناری قەندیل بەخۆی و هەموو منالەکانمان و پارەی ماڵە فرۆشراوەکان و هەمان قاتە جلەکەی قەرەداغی بە لەبەرنەکراوی جارێکی تر بۆ هێنامەوە، دوای ناردنەوەی ژن و منالەکانمان لە قەرەداغەوە ئێمە چووینە خوارەوە ڕۆژی دوایی واتە ١٩٨٨/٣/٢٥ من لەپشتی دێی شیوی قازی بووم ژن و منال و هەندێ ئاژەڵی مام عەلی قەڵا قایمسم بینی ژنەکەی سواری ماینێك بوو، ئەڕۆیشتن تەنیا ئەوەندەی لەمن پرسی ووتی مامۆستا عوسمان توخوا ئەبێ ڕۆژێك بێت ئێمە بگەڕێینەوە شوێنی خۆمان، منیش ووتم

بەخوا ڕۆژێك ئەبێ هەر بگەڕێینەوە دێکەی خۆتان و هەندێ دڵم دانەوە، مام عەلی قەڵا قایمس ماڵی بەسەر ئەو شاخەوە بوو بەتاقە ماڵە زۆر لەخزمەتی پێشمەرگەدا بوو بەداخەوە ماوەیەك لەوەوپێش بەهۆی هەڵگرتنی بەردێك کە دیار بوو کیمیاوی پێوە بوو لەزەویەکانی دا سکی ژانی خراپی لێهات و لە نەخۆشخانەی سلێمانی مرد. لەم کاتەدا هێزەکانی پێشمەرگەو جەماوەری ناوچەکە لەیەکتر جیا ئەبوونەوە، جەماوەر بە شپرزەییەوە بەرەو ڕێگاو شاخەکانی قەرەداخ دەرباز بوون، بەناو سەیتەرەو هێزی عەسکەری و چەکداری ڕژێمدا، پێشمەرگەیش بەخۆی و چەکیەوە بەرەو ئەوبەری چەمی دیوانەو دێکانی بناری قۆپی، من چوومە دێی ئەستێڵی سەروو نزیك قۆپی دووەم، لێرە بنکەی تیپی تایبەت بوو، هەموو چەکە زیادەکانی تیپەکانی ١٥ ی شارەزوور ٥٥ی قەرەداخ کە بە زۆری کلاشینکۆفی سینی بوون لەمەخزەنی ئێرە کۆکرابوەوە، خۆشیان تیپی تایبەتی چەکی قورستر بوون، بەتایبەت قاعدەی ڕاجیمەو گوللە ڕاجیمەیەکی زۆر، هەندێ چەکی تر، لەولا دێکەیشەوە بەردێکی گەورەی بن بۆشی لێ بوو هەرچی چەکی مەڵبەندە بەزیندانیەکان گواستبوویانەوە ژێر ئەم بەردە، هێشتا کەمێك بەرگری لەسەر شاخی قەڵا قایمس مابوو کە پێشمەرگەکانی تیپی تایبەتی مەڵبەند بوون، کاك عەدنانی حەمەی مینە هاتە خوارەوە لەسەر شاخ منی ڕاسپارد کە مقەرەکە بەجێ نەهێڵم و ئاگاداری کاك بەختیاری حەمەی مەلا عزەت بکەم کە هەندێ لەم چەکانە! بەتایبەت قاعدە ڕاجیمەکان و گوللەکانی بگوێزرێتەوە بۆ گەرمیان، کاك عەدنان خۆی بە سەیارەکەی ڕۆیشت دوای ئەو کاك بەختیار هاتە خوارەوە ڕاسپاردەکەم پێووت بەزوویی تراکتۆرێکی هێناو لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا ئەوی بەچاکیان زانی لە پێویستی ڕاجیمەکان و هەندێ تەقەمەنیان بارکرد، هەر ئەو شەوە لە ڕێی سەگرمەوە گەیاندیانە کاك عەدنان لە گەرمیان، لە گەڕانەوەیدا کاك بەختیار لەسەر ڕێی شاخی سەگرمە کەوتە ناو کەمینی چەکداری ڕژێم و بەبریندار دەرچوو، لەبەیانیدا کاك حەسەن سەعید زۆراب پێنجوێنی کە فەرماندەی کەرت بوو لەتیپی ٣٥ ی خنجەرە لەکاتی پەڕینەوەدا لەناوی دیوانە لەنزیك دێی چەمی سمۆر فڕۆکە هات لێیدان و شەهید بوو، ئەمانە کۆمەڵێك پێشمەرگەی تێکەڵاوی تیپی ٣٥ ی خنجەرە کە شەهید خاڵە کەریم مۆریاسی بەرپرسیان بوو، لەگەڵ کەرتێ لە پێشمەرگەکانی تیپی ٥٥ ی قەرەداخ لەگەڵ کاك شێخ احمد شێخ عەبدول لێپرسراوی کۆمەڵایەتی ئەوکاتەی تیپ و مامۆستا سۆران خانەقینی لێپرسراوی ئیدارەی تیپ بوون، لاشەی کاك حەسەنی شەهیدیان هێنا بۆ نزیك دێی ئەستێڵی سەروو، لە شوێنێکی نادیاری سەرووی دێکەوە دوو ژوور دروست کرابوو بەتەنیا پڕکرابوو لەهەموو جۆرە زەخیرەیەکی ئەو دێیە، لەبەردەم ئەم دوو ژوورە گۆڕمان بۆ هەڵکەند بەجلەکانی

خۆیەوە ناشتمان، تەنیا پێشمەرگە هاوسەنگەرەکانی بەچوار دەوریەوە بوون، ئەو عەسرە پێشمەرگە بەتەواوی شپرزە بوو، هێزەکانی بەرەو قۆپی ڕۆیشتن، تەنانەت ئەوانی دێی بەلەکەجارو سەر شاخی قەلا قایمسیش، کاک سهاد خانەقینی هات بۆلام جیهازێکی بچووکی دامی، ووتی من ئەچم بۆ لای کاک عومەر فەتاح لەمەڵبەند لەسەرەوە هەرکات بەجهاز ئاگادارم کردیت هەموو مقەرو مەخزەن‌و مەشجەبی چەکەکان بتەقێنەوەو وەرە سەرەوە، ووتی کاک عومەری قالە گوڵباخ لە خوارتەوەیە هێشتا نەهاتووە، دوای ماوەیەك جهازم کردەوە زانیم کاك عمری قالە گوڵباخ گەیشتۆتە مەڵبەند، من لەگەڵ کاک غەفور مۆریاسی مابووینەوە کاک سهاد گەڕایەوە لامان‌و لەئێوارەیەکی درەنگدا مقەرەکانمان تەقاندەوە ئەوکاتە چەکدارو عەسکەری ڕژێم لەناو شاری قەرەداغەوە پەڕیبوونەوە دێی گۆشان بەری شاخی قۆپی، نزیك بارەگاکانی مەڵبەند، کاک سهاد خۆی ڕۆیشت‌و ئێمەی نارد بۆ لای بەردی مەرجەبەکە کاتێك گەیشتینە نزیك بەردەکە لەسەر ڕێگاکە ٣ چەکدارمان بینی نزیك بووینەوە ناسیمانن پێشمەرگەی خۆمان بوون حەرەسی بەردی چەکەکان، کە ئەوانیش کاك سەردار فەرەج و کاك سالاری برای و کاك شێخ محمودی برای کاك شێخ أحمدی کۆمەلایەتی بوون، زۆریان پێخۆش بوو ئێمەیان بینی، داوایان لێ کردین کەلایان بین، ئێمەیش وەعدمان دانێ لایان ماینەوە، لەم کاتەدا تەنیا ئەم پێنج پێشمەرگەیە لەهەموو سنوری قەرەداغ مابووینەوە، هەتا زانیاریمان نەبوو کە بارەگاکانی هەموو بەشەکانی مەڵبەند لەسەرەوە سوتێنراوەو زیندانیەکان ئازادکراون‌و هەموو هێزی پێشمەرگە بەکاك عومەر فەتاحەوە کشاونەتەوە بۆ دیوی گەرمیان، دوای چەند کاتژمێرێك شەو ئاگرێکی بچوکمان کردبوەوە چامان لێ نابوو زۆر بەوورییاییەوە دانشتبووین، کاتێکمان زانی هەندێ دەنگە دەنگی قسەی مرۆڤ و تەقەی پێی ولاخ دێت، لێمان نزیك بوونەوە ئاگاداریان کردین کە خۆمانین‌و دەنگمان ناسین کاك سهاد خانەقینی‌و کاك حسێن قاسم خانەقینی‌و کاك مەلا کەریم کە چوار وولاخیان هێنابوو دوو گوێ درێژو دوو ئەسپی باری بۆ بردنی هەندێ چەکی پێویست بۆ دیوی گەرمیان، بەپەلە وولاخەکانمان بارکرد، بەتایبەت چەند چەکێکی بیکەسیمان هەڵبژارد، بەلام ئەوی کە زۆر سەیربوو هەرچەند هەنگاوێك ئەم وولاخانە بەو چەکە کەمانەوە ڕۆیشتن‌و نەیان توانی بڕۆن‌و پەکیان کەوت‌و ئەکەوتن نەمانزانی ماندووبوون، ناچار چەکەکانمان لێ کردنەوەو لەهەندێ شوێنی نادیارو جیاجیادا شاردنمانەوەو ئەوی بن بەردەکەیش کە چەند سەد چەکێك زیاتر بوو هەروا بەجێمان هێشت لەوکاتەدا، وولاخەکانیشمان ناچار بەڕەڵاکرد بەهەموومان ٩ پێشمەرگە بووین، کاك سهاد ووتی ئەبێ زۆر بەپەلە بڕۆین یەك پێشمەرگە لەم دیو نەماونەتەوە تەنیا ئێمە نەبێت، لەقۆپی دووەمەوە بەناو ئاوەکەدا سەرکەوتینە سەرەوە،

مانگە شەو بوو، کە چووینە سەرەوە ئاگری بارەگاکان دامرکابوەوە، کاک حسێن قاسم کوڵێ کتێبی هەڵگرتبوو لەڕێگا بەجێئەما، کاک سەهادیش تووڕە ئەبوو ئەیووت ئەم کوڵە چیە بەکۆڵتەوە درەنگە، بازوو بگەینە برادەران، بەم جۆرە لەنێوان هەزار کانی و دێی دەربەند دەرەواری دیوی گەرمیاندا چووینە خوارەوەو جەماوەری هەژاری دێکانی ناوچەی قەرەداخیش لەگەڵ وەیشومەی ڕەشی ئەنفالی ٢ دا بەرەو ژێردەسەڵاتی ڕژێم و قەدەری نادیاری ئەنفال و ماڵوێرانی هەڕەشەی مەرگی بێچارەنووسی و بەپەرش و بڵاوەیی ئاوارەی ناو شاری سلێمانی و کۆمەڵگا زۆرە ملێکانی شارەزوور بەگشتی بوون، کە هەمیشە لێی ئەترسان و بەگۆڕستانی مەرگیان ئەزانی، ماوەی ڕەشەبای شومی ئەم ئەنفالە ڕەشە هەتا نزیکەی کۆتایی مانگی ١٩٨٨/٣ ی کێشا، کۆتایی بەمێژووە ئەگریسەکەی بەو کارەساتە ماڵوێرانیەی ئەم ناوچە هەژارە بەقەناعەتەی خاوەن باوەڕی هەستی کوردایەتیە بەو شێوەیە هێنا، لەهەمان کاتەکانی ئەم کارەساتەی ئەنفالداو لە شەوی ٢٤ر١٩٨٨/٣/٢٥ ڕژێمی بەعس بەتۆپ و ڕاجیمەی کیمیاوی دای لەدێی جافەران، پێشمەرگەی هاوبەشی یەکێتی و پارتی تیابوو زیانی گیانی نەبوو، وەکو شەهید لەبەر ئەوەی خەڵکی دێکە چۆڵیان کردبوو، پێشمەرگەکانیش هەندێ کاری لەچاوو گیانیان هەبوو، هەر ئەو شەوە گەیشتنە لامان لەدێی ئەستێل و هاوکاریمان کردن، وە لەشەوی دواییدا بەهەموو مەزەندەیەك تۆرەلێدانی کیمیاوی لەبنکەی ئەستێل بوو، لەبەر ئەوە بەسەرپەرشتی کاك (عەدنانی حەمەی مینە) هەر لەئێوارەوە ئیحتیاتی خۆمان کردو هەموومان بە بەتانی چووینە بەرزاییەکەی پشتی دێی (ئەستێل)و هەتا نیوەشەوی درەنگ ماینەوەو لێی نەدرا، چونکە بەزۆری لێدانی کیمیاویەکە هەتا کات ژمێر (١٢)ی شەو بوو، وە لەسنورەکانی تیپی (٥٧) ی سەگرمە لە ڕۆژی (١٩٨٨/٣/٢٧) هێزێکی ڕژێم لە چەمچەماڵەوە هێرشی کرد بەهەموو چەکەکانیەوە بەرەو (سەنگاو)، لەنزیك دێی (کانی خاکی) و (کەلە ڕەش) و (هەمزە ڕۆمی) لەلایەن پێشمەرگەو پشت گیریەکانی ئەم دێیانەوە بەرگریەکی باشی لێکرا بەسەرپەرشتی کاك ئازادی سەگرمەو (١٥) پێشمەرگەو لەوانە کادری کۆمەڵایەتی کاك (ئاسۆ مەمەند) کە بەمەڵۆ ناسرا بوو، لەگەڵ شەهید عوسمان شێخ ڕەئوف کانی خاکی و ئاکۆ شێخ برایم و سەرکەوت و ڕێبوار، لەگەڵ ئەوەی کە ڕژێم کۆپتەری زۆری بەکارئەهێنا لەشەڕەکەدا، بەڵام لەکاتی گەڕانەوەیاندا بەهەلیان زانی پێشمەرگەکان ئەوەندە بەوورە بوون هێرشیان کردە سەر عەسکەریەکەی ڕژێم و مصفحەیەکیان بە کۆمەڵێك بەڵگەنامەوە گرت، لەگەڵ ئەفسەری حەرەکاتی لیوا بەناوی (فاروق حەمید شەلال)و مامەڵەی دیلیان لەگەڵ کرد...

## ئەنفالی ٣ ی گەرمیان لە رۆژی (٧ بۆ ٢٠)/ ١٩٨٨/٤

لەکۆتایی مانگی ١٩٨٨/٣ هەموو پاشماوەی پێشمەرگەکانی سنوری دێ و بەرەکانی قەرەداخ بەناو دەربەندەکانی شاخی قۆپی قەرەداخدا کشانەوە بۆ سنووری دێکانی ناوچەی گەرمیان، ئێمە لەگەڵ کاک سهاد دوا دەستە بووین، لەسەر قۆپییەوە لەنێوان دێی هەزارکانی و دەربەند دەوارەی گەرمیاندا چووینە خوارەوە، بەدیوی گەرمیاندا، سوپای عێراقی هەتا هەزارکانی هاتبوو کوێرانە بەرەو دێی دەربەند دەرەوار تەقەی ئەکرد، خەڵکی دێکان لەناو ماڵەکانیان دەرچوو بوون و پەرتەوازەی ناو ئەو چاڵی و شیوو ئەدیویانەی هەردەو دووری دێکانیان بووبوون، ئاژەڵەکانیان زۆری پەردەوازە بوو بوون، بەتایبەت ئەو دێیانەی عەسکەریەکەی پێگەیشتبوو، ئێمە بەشاخەکەوە چەندەها بەرخ و دایکەکانمان بینی لەیەکتر براببوون، هەموو ئەیان باڕاند بێخاوەن، زۆربەی دێکان لەخەڵکەکەی چۆڵ کرا بوو، بەلام زۆری کەلێ پەلی تیامابوو، خەڵکەکە شپرزەو سەرلێشێواو کەوتبوونە بارێکی دەروونی زۆر نائاسایی، خۆیشیان بەرنامەی خۆیان و چارەنووسیان نەئەزانی، پێشمەرگەیش ماوەی یەك هەفتە بەو دێیانەدا ئەگەڕاین، ئەوانی قەرەداخ بەتایبەتی هەتا دێکانی هەر سێ مەسوییەکان و فەقێ مستەفاو کوردە میرەکان و گۆڕ ئەسپ و تالەوان و بەکر بایەف و بێستانەو شێخ تەویل و دەربەند دەرەوارەکان، هەرکەس لەگەڵ کۆمەڵێ پێشمەرگەدا ئەگەڕاین بەو دێهاتە چۆڵانەدا، هەندێ لەخەڵکەکانی هێشتا مابوونەوە لە دەرەوەی دێکەو شەوانە سەریان لە ماڵەکانیان ئەدایەوەو پێشمەرگەیان ئەبینی زۆر دڵیان خۆش ئەبوو، بە ئەوپەڕی دڵسۆزیەوە هاوکاری خواردنیان ئەکردین، پێشمەرگەکانی گەرمیانیش لە تیپەکانی:٥١ی گەرمیان و ٥٣ ی شێروانەو ٥٦ ی حەمرین ئەوی مابوونەوە لەسنوری خۆیاندا مابوون، لەخوارەوەی گەرمیان و بەشی رۆژئاوای، هێشتا پێشمەرگەکانی سەرکردایەتی نەگەڕابوونەوە هەر ئەیان ووت: بەرێوەن، کاك عمر فەتاح لەدێی دەربەند دەرەوار بوو کافیە خانی هەر لەگەڵ بوو لەو فەرماندەی تیپانەو کادرانەی نزیکی بوون (کاك ئاوات و کاك مەحمودو کاك ئازادو کاك عەدنان و کاك جەمیل) کاك عومەر غەریب بەرپرسی دارایی بوو، هەموو دارایی و سامانی پارەی مەڵبەند بەچەند پێشمەرگەیەکەوە بەباری چەند وولاخێك زۆر بەئازایانە ئەیان پاراست، لیژنەی پزیشکەکانی مەڵبەند کەبریتی بوون لە دکتۆر فایەق گوڵپی هەورامی کە بەڕاستی د. فایەق لەئاستی خزمەتێکی بێوێنەی پێشمەرگەو هەم جەماوەری ناوچەکەدا بوو، ماندوو نەناسانە ئەکرد، لەم دواییەدا لەسنوری مەڵبەندی یەك لەدێی

بەلەكەجاڕی قەرەداخ خەستەخانەیەكی بۆ كرابووەوە سەرپەرشتی ئەكرد، بەهەندێ دەزگای پزیشكی سادەو داوو دەرمان، بەڵام ئەم دكتۆرە تەنانەت هەندێ نەشتەرگەری پێویستی تیا ئەكرد، كە جێگای شانازی بوو، لەهەمان كاتدا لەكاتی شەڕەكانیشدا هەم پێشمەرگەو دكتۆریش بوو بەڕاستی كوڕی حەمە ئەمین گوڵپی باوكی بوو كە لەچوونە سەر دەبابەو گرتنی دا لەپردی زەڵم شەهیدبوو لەگەڵ د٠ فایەق دا هەندێ دكتۆرو برین پێچ ئیشیان ئەكرد لەوانە د٠ ناصح شێخ ئەنوەر بوو نموونەی ڕەوشت بەرزیو هێمنی و هەست بە مەسئولیتانەی كوردو شۆڕش ئیشی ئەكرد لەگەڵ ئەمانەشدا د. جەلال عوسمان رشیدو د. جەبار كەركوكی د. ناجح و د. محمودو یاریدەرانی پزیشكی سەركەوت زەكیو جوتیارو ئیبراهیم محی الدین و یاریدەدەری پزیشكی لە تیپەكاندا بوون، لەم نەخۆشخانەیەدا تەنانەت چەند قەرەوێڵەیەكی تایبەتیان دانابوو كە بریندارو نەخۆشی تیا ئەخەوێنرا، چارەسەری پێویستی بۆ ئەكرا لەكاتی كشانەوەشدا، بۆ گەرمیان توانیبویان زۆرترین پێویستیەكانی پزیشكی بەجێنەهێڵن و بەولاغ و بەكۆڵ گەیاندیانە سنوری گەرمیان، هەمیشە بەخۆیانو چەند پێشمەرگەیەكەوە بەدەوریا بوونو ئەیان پاراستو خزمەتی پێویستیشیان پێئەكرد، لەم كاتەدا د. جەلال عوسمان ڕشید لەگەڵ هێزەكەدا چوو بوو بۆ سەركردایەتی كە بەڕاستی دكتۆرێكی گورجوگۆڵ بوو وە پێشتر د. جەبار كەركوكی لەمێوڵیو لەسنوری تیپی ٥٧ ی سەگرمە هەروەها یاریدەدەری پزیشكی بۆتان تاڵەبانی هاوكاریان بوو، كە بەداخەوە لەدواییدا ئەنفال كراو لەم دەستە پزیشكیو تەندروستیە كە درێژەیان بەخەباتدا، هەتا ماوەی سێ ساڵ لە ئاوارەییمان د. فایەق و د. ناصح قەرەداخیو د. جەلال عوسمان ڕەشیدو د. جەبار كەركوكی د. ناجح گوڵپی و یاریدەدەری پزیشكی كاك جوتیار مۆرباسی و كاك ئیبراهیم محی الدین لەگەڵ تیپی ٥٥ی قەرەداخیش كاك حەسەن برین پێچ هەمیشە لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا بوو، هەروەها لەناو دام و دەزگاكانی شۆڕشی (ی.ن.ك) لەهەموو سنورێكی مەڵبەندێكدا دەزگای (دادگا) هەبوو كە هەموو لەكەسانی دەرچوانی كۆلێجی یاساو بەجۆری (دادوەر)و بە ئەوپەڕی سەربەخۆییو لەئاستی یاسادا كێشە كۆمەڵایەتیەكانی جەماوەری سنورەكانیان، هەر كێشەیەكی جیاجیا بەجۆری یاسا ئەیان گەیاندە ئەنجامی خۆی، لەسنوری مەڵبەندی یەكدا دادوەرەكان بریتی بوون لە:- ماوەی پێش ووتووێژی ساڵی ١٩٨٤ لە شاربازێرو لەدوای پێكهێنانی مەڵبەندی یەك لەدێی حاجی مامەندی شاربازێر بوون لەكۆتایی ساڵی ١٩٨٢و دادوەرەكانیش ئەمانە بوون:-

١) حاكم قادر حەمەجان كە ئێستا سەرۆكی شارەوانی سلێمانیە.

٢) حاکم سەردار حاجی سەعید گەلاَلی کە ئێستا لە بەریتانیایە.

وە هـاوڕێ دوای وتووێـژ لـەمانگی ١٩٨٥/١ کـە مەڵبەنـد چـووبوە دژی سـیتەك و دادوەرەکـەیش بریتـی بـوو لـە حـاکم ئیـبراهیم حـسێن دواتـر لـە هـاوینی سـاڵی ١٩٨٥ دا مەڵبەنـد گواسـتراوە بـۆ سـنوری قـەرەداخ دژی بەلەکـەجارو بەشـی دادگـای مەڵبەنـد لـەم دادوەرانە پێك هات هەتا سەرەتای ١٩٨٦ هەر حاکم ئیبراهیم بوو دوایـی دادگا پێك هێنـرا بەم شێوەیە:-

١- حاکم ئیبراهیم بەرپرسی محکەمە (دادگا )

٢- حاکم ئەکرەم فەرەج

٣- حاکم شاهۆ

ئەنـدامانی دادگـا بـوون لەناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٨٦دا حـاکم غـازی سـالار کفـری بـوو بـەحاکم لـە هـەمان دادگـا، لەسـەرەتای سـاڵی ١٩٨٧ محمـد قـەرەداغی پەیوەنـدی کـرد بەشۆڕشـەوە لەسـنوری قـەرەداخ، لـەو کاتـەدا هـەردوو دادوەر ئـەکرەم فـەرەج و شـاهۆ گواسـترانەوە بـۆ بەشـی کۆمەلاَیـەتی تیپـەکان و دوایـی لـەو سنورانەدا نـەمان و دوای ئـەوە جارێکی تر دادگا سازدرایەوە بەم شێوەیە:-

١- حاکم ئیبراهیم حسێن بەرپرسی دادگا.

٢- حاکم غازی سالار.

٣- حاکم محمد قەرەداغی ئەندامانی دادگا.

ئەم سیانە هەتا ئەنفالەکان بەم شێوەیە بوون لەم کاتەی شەڕو بەرگری لـە هێرشـی ئەنفالی (٢،٣)دا لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا بوون، توانیان هەموو بەڵگەنامەکانیان بپارێزن و ڕۆڵـی خۆیـان ببیـنن لـەکاتی ڕۆیـشتن و کـشانەوەشدا هـەر لەگـەڵ هێزەکەشـدا بـوون هـەتا ئێران و ئاوارەیی زۆربەیان مانەوە.*

## گەیشتنەوەی پێشمەرگەکانی مەڵبەندی یەك لەشەڕی سەرکردایەتیەوە:-

لـە ڕۆژانـی ٥ ر١٩٨٨/٤/٦، پێـشمەرگەکانی سـنوری مەڵبەنـدی یـەك کـە لـە شـەڕی سەرکردایەتی (ئەنفالی یـەك) بەسەرپەرشتی کاك قادری حاجی عەلی و کاك شێخ جەعفەر قەرەداخی گەیشتنەوەی سنوری گەرمیان، بەڕێگای دوورو درێژی دەشتی هـەولێرو کۆیـەو ناوشوان و هەمەوەندو جباری و ناو گەرمیان لە گوڵباخەکانەوە بۆ ئاوەسپی و لەدژی فەقێ

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێزان عادل گەرمیانی، عدنانی حمەی مینە، شێخ کەریم چاورەش، مەلا ئەحمەد جەیران.

مستەفاو مەسۆییەکانەوە بۆ هەردوو دێی (دەرەوار)، کە کاك عمر فەتاحی لێ بوو سەرپەرشتی هێزەکانی ماوەی ناو گەرمیانی ئەکرد، کاك ئاوات قارەمانیو کاك محمود سەنگاویو کاك ئازادی سەگرمەو کاك جەمیل هەورامی فەرماندەی تیپی ١٧ی زمناکۆ لەنزیکەوە بەدەوری کاك عمر فتاحدا بوون کاك عدنانیش لەسەر تیپەکەی بوو، یەکەم دەستەی پێشمەرگە کاك نەجم بێسانی بوو گەیشتن، دوایی کاك حەمە قاشتیو کاك سەردار ناوتاقیو ئنجا هەموو هێزەکان بەگشتی، لەم کاتەدا دێهاتەکانی سنوری گەرمیان بەتەواوی شپرزەو سەرگەردان بووبوون، هەموویان خەڵکەکە چووبونە دەرەوەی دێکانیان، هەندێکیشیان بەسەڵتی گەیشتبوونە ناو شارۆچکەی کەلارو شوێنەکانی تر، ڕۆژگارێکی زۆر سەختو نائومێدی بوو لە مێژووی ژیانی سنوری گەرمیانی پشتو پەنای پێشمەرگەو کوورەی بیری کوردایەتی بۆ یەکەم جاربوو لە شۆڕشی نوێخوازدا کە جەماوەری ئەم سنورەو پێشمەرگە بەرەو جیابوونەوە لەیەکتر بڕۆن. دوای چەند ڕۆژێکی کەم لەگەیشتنەوەی هێزی پێشمەرگە یەکسەر بەرەکانی شەڕ جارێکی تر ڕێکخراو دامەزرایەوە، هەر تیپە سنورێکی بەرگری خوێناوی بۆ دیاری کرا، سەرکردایەتی بەگشتی لەبەری دەرەوار بوون کە بەڕێزان: کاك قادری حاجی عەلی لێپرسراوی مەڵبەندو کاك عمر فەتاحو ئاوت قارەمانی، کاك شێخ جەعفەر شێخ مستەفا قەرەداخی بەرپرسانی عەسکەری مەڵبەند بوون، لەهەمان کاتدا بۆ مێژوو کافیە سلێمان خێزانی کاك عمر فەتاح بە ئەوپەڕی ورەوە لەناو هێزی پێشمەرگەدا بوو لەگەڵ خێزانی کاك عمر غەریب بەناوی (ڕەحمەخان)، هەموو ژنانو خێزانیماڵی شەهید حەمە ڕەشو شەهید محمود مامە عەزەو ژنو منداڵو دایکی کاك کەریم چاوڕەش لە تیپەکانی ئەوکاتەی سنوری مەڵبەندی یەك تیپی ٥١ ی گەرمیان، کە بەڕێزان عادل شکور احمد فەرماندەی تیپ و کاك شێخ کەریم چاوڕەش جێگری فەرماندەو مامۆستا جوامێر ڕابەر سیاسیو مامۆستا جەلال جەوهەر لێپرسراوی ڕێکخستن، فەرماندەی کەرتی (شەهید نازمە بچکۆل) و فەرماندەی کەرتی ٢ مام جەلال ئەمین کاکلو فەرماندەی کەرتی ٣ کاك عومەر سەنگاویو فەرماندەی کەرتی ٤ کاك شینەی حەمە ڕەش و فەرماندەی کەرتی ٥ شەهید سەید جەوهەرو فەرماندەی کەرتی ٦ کاك عوسمانی حاجی محمود لەم بەرەیەدا بوون. شەو لە ١٩٨٨/٤/٨ بە تەواوی شەڕ دەستی پێکرد هێرشی ڕژێم لەچەند قۆڵێکەوە لەدوزەوە بەرەو پەلکانەو بەرەو شۆراو، لە نەوجول بەرەو قونپەلك و باشتەپەو لفتیاغا، لە سەرقەڵا بۆ هۆمەر ملۆ چوار شاخ و توکن و عەزیز قادر، لە بناری گل بۆ ئاوایی جلالو تازە شار، لەقۆڵی قادر کەرەمەوە بۆ گەڕاوی، لە سەنگاوەوە بۆ قەیتولو ئاشداخ و هەزارکانی و سەگرمە، لەشەهیدەکانی ئەم تیپە:

شـه‌هید نازمـه بچكۆل فه‌رمانـده‌ی كـه‌رتی ١ بـه‌خۆی و ٢١ پێشمه‌رگه‌، ٨ پێشمه‌رگه‌یان لـه پێشمه‌رگه‌كانی حزبی شیوعی بوون، شه‌هید نازم خه‌ڵكی دێی بەلەگەی داوده بوو، لەگەڵ شه‌هید فاروقی برای‌و شـه‌هیدان احسان كانی قادری‌و خه‌تاب دوزی‌و حه‌مید پاره‌پاره‌و عـادل تـازه شـار، كـه زیـاتر شـه‌ڕه‌كه لـه‌م دێیـه‌دا بـوو، شـه‌هید یاسین و غالـب دوزی ئـه‌م شـه‌هیدانه لـه به‌ره‌نگاریـه‌كی بێوێنـه‌دا بـوون لـه سـه‌نگه‌ره‌كانیاندا هه‌ڵناسن‌و زۆرترینیـان به‌زری پۆشی ڕژێم شه‌هیدكران‌و به‌سه‌ریاندا ڕۆیشتن، هـه‌روه‌ها شـه‌هید قـادر حه‌مـه صـاڵح كه‌ناسرا بوو به حاكم قادر له‌سه‌ر شاخی ئاشداخ له‌گه‌ڵ ٣ پێشمه‌رگه‌ی پشتگیری.*

---

چاوپێكه‌وتن له‌گه‌ڵ به‌ڕێزان قادر حاجی علی، شێخ جه‌عفه‌ر شێخ مسته‌فا، حه‌مه قاشتی.

## هەندێ لە پێکهاتەی لێپرسراوێتی
## تیپەکانی سنوری مەڵبەندی یەك پێش ئەنفال

تیپی ٥٩ی حەمرین کاك هێمنە ڕەش (قەیسەر) فەرماندەی تیپ و کاك شێرزاد، فەرماندەو ماموستا جەلال شێخ کەریم ڕابەر سیاسی و جێگری ماموستا کاکە ڕەش لە ڕێکخستن (بەکر صدیق ئەفەندی کەرکوکی)، لەگەڵ کاك عەلی ئەکبەر خانەقینی فەرماندە کەرتەکانیان بریتی بوون لە: کاك عەسکەر چەمسور خاڵی و جەلال مەسوێی و سیروان دێ ڕەشەیی و کاك ڕزگاری حاجی کایل، سنورەکەیان: هەمەوەندو جەباری و لەیلان و بەشێك لە زەنگەنەو قادرکەرەم، هێرشەکانی ڕژێم لە پشتی سەنگاو بۆ شاخی زەنون و لەسەنگاو بۆ قەیتول و گەڕاوی و لە قادرکەرەم بۆ زەردەی لای قادر کەرەم بۆ بنەکەی قادر کەرەم، لەچەمچەماڵ بۆ خۆێڵێن و ملحەو لە بان مەقان و باخەکەی شێخ محمد، بۆ سەنگاوو گوڵباخەکان، تیپی ٥٣ ی شێروانە کە فەرماندەی تیپ شەهید حەمە ڕەش و ڕابەر سیاسی شەهید سەردار فەقێ محمدو لێپرسراوی ڕێکخستنی تیپ کاك کوردۆ قاسم، فەرماندەی کەرتەکان: عەلی شەهید محمد فەرماندەی کەرتی یەك و (مەلا احمد حەمە صاڵح) (مەلا ئەحمەدی جەیران) فەرماندەی کەرتی ٢ نەجم بۆیسانی فەرماندەی کەرتی ٣، ئیبراهیم ئەحمەد(بلە سوور) فەرماندە کەرتی ٤، لالە مارف (محمد حاجی محمود) فەرماندە کەرتی ٦ شوێنی بەرەکانی شەڕ لەناوچەی زەریـن و تیلەکۆو زەردەکان و زەنگەکەو صۆفی ڕەحیمی نزیکی شێخ تەویل و بەکر بایەف، هێرشەکانی ڕژێم: لەناحیەی تیلەکۆ بەرەو تەپەسەوزو ناوچەی ڕۆغزایی و بەرەو زەردەکان و زەرینلە لەباوەنور بۆ صۆفی ڕەحیم و زەنگەنەو حەمەی قادر، لە شەوی ٨ر١٩٨٨/٤/٩ هێرشەکانی ڕژێم بەهەموو جۆرە چەکەکانیانەوە دەستی پێکرد، بەفڕۆکەی کۆپتەری عەسکەری و بەدەها دەبابەو تۆپبارانی قورس و چەندەها لیوای عەسکەری، فەوجەکانی چەکداری ڕژێم هەتا ١٣ر١٤ /١٩٨٨/٤، لەناو شەهیدەکانی ئەم تیپەدا شەهید شەهابەڕەش دوای فەرمانی کشانەوەی بەناچاری هێزەکان گەڕانەوە بەرەو دێی تۆپەکەو تەپەگەروس و ئینجا دێی دەربەند دەرەوار، لەپێشەوە شەهیدی فەرماندە شەهید حەمەڕەش و کاك کوردۆ، بەدوایدا ئینجا هەموو پێشمەرگەکانی هێزەکە، وە لەبەرەیەکی تری شەڕی بەرگری لە هێرشەکانی ئەنفالی ڕژێم بۆ سەر سنورەکانی گەرمیان لەلایەن هێزەکانی پێشمەرگەی مەڵبەندی یەك و پشتگیری سنورەکە لەشاخی زەردەو گولاندا، لەلایەن ماموستا عەلی عبداللە گەرمیانی

سەرپەرشتی ئەو سنورەی ئەکردو بەرگریەکی چاکی لێکرا، هەر لەهێرشەکانی سەر قەرەداغ لە ئەنفالی ٢ دا، چونکە ئەم شوێنە زۆر مسەیتەربوو بەسەر هەردوو ناوچەکەدا، شەڕو بەرگریەکی زۆری لێکرا، شەهیدو بریندارییان دا، تیپی (٥٥ ی قەرەداخ) لە ئەنفالی گەرمیان، ئەم تیپە لەم کاتەدا ئەم لێپرسراوە عەسکەری‌و سیاسیانە بەرپرسیان بوون کەئەمانە بوون:- فەرماندەی تیپ: شەهید کاک مەلا ئەحمەد گەرمیانی، جێگری تیپ: کاکە حەمە قاشتی، لێپرسراوی ڕێکخستنی شۆڕشگێڕان: مامۆستا عوسمان کانی پانکەیی‌و کادرەکانی: کاک سەردار عەینەك، کاك مەلاسەعید کە ئەنفالکراو لێپرسراوی ڕێکخستنی کۆمەڵە پێشتر کاك ئاسۆی شێخ نوری بوو، کادرەکانی بریتی بوون لەکاك مەلا ئەحمەد دەلوجە، کاك عەلی حسێن، کاك ئازاد فازل نەجم، شەهید ئارامە بچکۆل، شەهید ژیار خانەقینی، لێپرسراوی دارایی‌و ئیدارە: مامۆستا سۆران خانەقینی لێپرسراوی کۆمەلآیەتی: کاك شێخ ئەحمەد شێخ عەبدول بەرزنجی‌و کادرەکانی: وەستا تۆفیق خەراجیانی، مامۆستا عەلی بچکۆل، صەلاحە قەڵەو، پێشمەرگەکانیان: سەربەست عبدالله بەرزنجی، عوسمان حاجی ئەحمەد شوکەیی شارباژێر، فەرماندەی کەرتەکان و جێگرەکانیان شەهید حەمە فەرەج هەورامی‌و غەفور عەریفی حەمە ئەمین، خەلیل سەرکانی‌و شەهید وەستا تاهیرە سوور بەرزنجی‌و دێو حسن، کاوەی وەستا گوورون‌و جمال‌و وەستا جەبارو شەهید فەریقە سوور..

### شەڕو بەرگری لە دژی شێخ تەوێلی گەرمیان کە دوا شەڕی ئەنفالی دووبوو:

شوێنی بەرگری لەهێرشی ئەنفالی گەرمیان بۆ ئەم تیپە دێکانی: بەکر بایەف وەکو بنکەی دواوە بۆ برین پێچ کاك حەسەن‌و کاك شێخ ئەحمەد بۆ کاروباری ئازوخەو نان، وە دژی بێسانەو شێخ تەوێل‌و بەتایبەت شێخ تەویل جێگای تەواوی بەرگری بوو، جۆری دا بەشوێنی پێشمەرگەکانی ئەم تیپە لەزنجیرە بەرزاییەکانی ڕۆژهەلآتی دژی هەردوو دەرەوار لەسەرەوە بۆ خوارەوە، شەهید مەلا ئەحمەد گەرمیانی فەرماندەی تیپ و دوایی شەهید حەمە فەرەج هەورامی‌و غەفور عریفی بۆ نزیك نێوان هەردوو دژی بێسانەو شێخ تەویل لەبەردەم دژی شێخ تەویل‌و بەلای دژی بێسانەدا بەلای سەرویدا شیوێکی قوڵی پان‌و گەورەی تیابوو، بەسەر لێواری شیوەکەوە بۆ دەم دەشتاییەکە سەنگەری چاك هەڵکەنرا، بەجۆری نیوە بازنەیەك بەلێواری سەرەوەی ئەم شیوەدا پێشمەرگە بەسێ بەش چوونە سەنگەر، لەدیوی یەکەمی بەردەم شێخ تەویل‌و ڕووبەرووی تەواوی شەڕەکە: شەهید وەستا تایەر زۆر دلێرانە سەرپەرشتی ئەکرد لەگەڵ (پ. م) محمد خەلیفەو شەهید مەلا

بەکرو مامۆستا یاسین بەرزنجی و شەهید ئاکۆ بچکۆڵ و جەمال و کمال مامە خەلیفە، لەبەشی ناوەڕاستدا پێشمەرگەکانی مام صالّح گۆر ئەسپی پێشمەرگەو فەرماندەی دێرین کە ڕۆژی یەکەم بریندار بوو خۆی، بەڵام چەند پێشمەرگەیەکی زۆر مەردانە لەبەرەکەدا مابوونەوە لەوانە یەکێکیان بەناوی نیوەکوڕو احمد ناوێك کەهەمیشە بەدەنگی بەرز قسەی بە چەکدارەکانی ڕژێم ئەدا. لەبەشی سێیەمی شێوەکە: مامۆستا سۆران خانەقینی، کاك مەلا ئەحمەد دەلوجە، مامۆستا عوسمان کانی پانکەیی (نووسەر) مامۆستا عەلی بچکۆڵ، سەلاحە قەڵەوی کۆمەڵایەتی، خەلیل سەرکانی وەکو فەرماندەی کەرت و لە ڕۆژانی دوایشدا کاکە حەمە قاشتی وەکو جێگری تیپ لەم بەرەیەدا بوون، هێزەکانی ڕژێم لە باوەنورەوە بۆ چوارملانی بەرامبەرمان هاتبوون کە بریتی بوون لەچەند لیوایەکی عەسکەری تایبەت و چەند یەکەیەکی عەسکەری و چەندەها دەستەی چەکداری تایبەتی کورد (مفرەزە خاصەی) سلیمانی و زەڕایەن.*

## کۆتایی شەڕی شێخ تەوێلی گەرمیان و کۆتایی هێرشی ئەنفالی (سێ)ی گەمیان:

شەڕ دەستی پێکرد ڕاستەوخۆ بەرەو شێخ تەوێل، هەرکات بجوڵانایە یەکسەر کۆمەڵێك عەسکەری و چەکدار بەچەکێکی بیکەیسی بەرزاییەکانی بەرامبەر بەرزایی شوێنەکانی شەهید مەلا ئەحمەدو شەهید حەمە فەرەجیان ئەگرت بۆ مشغول کردنیان، ئەفسەرێك بەدارو لێدان چەکدارو عەسکەریەکانی ئەدایە بەر، بۆ هێرش کردن و کۆپتەرەکە بەسەریانەوە بەجۆرێکی ئەدیودا بەرەو دێی شێخ تەویل ئەهاتن، کە بەزۆری لای شەهید وەستا تایەرو پێشمەرگەکانی ئەگرتەوە، ئەمانیش هەر نزیك ئەبوونەوە یەکسەری لێیان ئەدان و شێخ تایەر بەدەنگی بەرز وەکو عادەتی خۆی لەشەڕدا هاواری ئەکردو ئەینرکاند بەسەر پێشمەرگەکان و هەڕەشەی لەدوژمن ئەکرد، ورەی ئەدا بەپێشمەرگەکان، بەم جۆرە شەڕێکی خەستبوو، بەهێزێکی زۆری نا بەرامبەری ڕژێم لەژمارەو جۆری چەك هەر لە ١٩٨٨/٤/٧ هەتا بەیانی کات ژمێر ٨ ی بەیانی ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٤ بێئەوەی هێرشکەرانی ڕژێم بتوانن بگەنە دێکە، لەبەرامبەر ئەو ژمارە کەمەی هێزی پێشمەرگە، گەورەترین چەکیشمان ئاربی جی و بی کەی سی و قەناسە بوو زیاتر ئاڕ بی جی یەکە بۆ کۆپتەر بەکارئەهێنرا، کە لەدواییدا گولله ئەماو هەندێ جار بەچەکی قەناصە تەقە لە کۆپتەرەکە ئەکرا ئەویش خلیل سەرکانی و سەردار ناوێکی پێشمەرگە بوو، کۆپتەرەکە ئەوەندە نزم

---

* چاوپێکەوتن لەگەل بەڕێزان خەلیل سەرکانی، نوسەر، وەستا غەفور، مامۆستا سۆران خانەقینی.

بـوو رۆژ لـەدوای ڕۆژ نـزیکتر ئـەبوەوە لـە سـەنگەرەکانمان، بەئاسـانی چـاومان لـە فرۆکەوانەکـەوە بـوو، هـەولی ئـەدا شـوێنی سـەنگەرەکان بەتـەواوی بزانێـت، لـەڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٢ و لـە عەسـردا بـەرەی شـەڕەکە نیمـچە هـێمن بوو، ئێمـە لـەناو سـەنگەرەکاندا بووین، چاوەڕێی هێرش بووین لـەپڕ مـصفەحەیەك هاتەسـەر بەرزایی چوار مـلان و چەند تەقەیـەکی کـردو یـەك گوللـەی لـەناودا تەقیـەوەو دووکـەڵێکی ڕەشـی لێهەڵـسا بـە بەرچاومانەوە، هەموو پێشمەرگەکان لە سەنگەرەکانیان دەرچوون و بەراکردن بەرەو ڕووی ڕۆیشتین، ووتیـان عەسـکەریەکە کشایەوە ئێمەیش چەند کادرێك بەدوایاندا ڕۆیشتین، و هاوارمان لێ ئەکردن کە نەڕۆن ئەکوژرێن و عەسکەریەکە نەڕۆیشتووە، بەڵام پێشمەرگەکان هـەر ڕایـانکرد، کاتێکی تـەماوی و هـەڵم بـوو دوای بارانێك، پێشمەرگەکان ئەوەندە بەپەلە ڕایانکرد، شوێنەکە تەم و مژاوی بوو، گەیشتبوونە نـاو عەسـکەریەکەو ئەوی بەم دیوەدا بوو ڕایان کردبووە ئەودیوی بارەگای لیواکە، پێشمەرگەکانیش هەندێ پەنیرو خواردنیـان هێنـا بـەڵام لـەپڕ دۆشـکەیەك لێیـان هاتـە دەسـت و تەقـەی لێکـردن، گەڕاندنیـەوە بێ‌ئـەوەی کـەس برینـدار ببێـت، وا بـە پەشـۆکاوی تەقـەی لێ کـردن خۆشـبەختانە کـەس برینـداریش نەبوو، بەڵام لەم چەند ڕۆژەی شەڕی سەخت و بەرگریەی تیپـی ٥٥ ی قـەرەداغ و بەتایبـەت ئەمانـەی نزیـك دێی شـێخ تـەویل تـەنیا دوو پێـشمەرگەی تیپەکـەمان برینـداربوون، کـە یەکێکیان شەهید ئاکۆ بچکۆل و ئەوی کەیان حەمـەی خەلیفە بەپارچەی هاوەن لە سمتۆ لووتی دا بوون، من (م.عوسمان نووسـەر) و کاك عەلی حسێن کادر هـەردووکیانمان بەسـەر شان و کۆڵمان لەناو بەرەی شەڕەکەدا دەرکرد، هەرچەند کۆپتەرەکەیش هاتە سەرمان بەناو چـاڵیو ئاوێکـدا گەیانـدەوە دێی بـەکر بایـەف بـۆ تیمـارکردنی لای • حەسـەن، لـەناو پێشمەرگەدا بـەبرین پـێنج ئـەوترا دکتـۆر، ئـەم دکتـۆر حەسـەنە خـۆی و مـەغۆلی بـرای دوو پێشمەرگەی دڵسۆزو لەسـەرخۆ بوون، بـەبێ دەنگـی و هێمنـی ئیشەکانی خۆیـان ئـەنجام ئـەدا، لـەناو هێـزی پێشمەرگەدا مـەغۆل نـاوی (محمـود) بـوو. ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٤ لەبـەرە بەیانی زوودا من لەگەڵ کاك عەلی حسێنی کادر لـە بەکر بایـەف بەهەندێ نان و تەقەمـەنی کەم لە گونیەیەکدا بەگوێ درێژەیێکەوە گەڕاینەوە بۆلای هێزی پێشمەرگەکانمان (تیپـی ٥٥ ی قەرەداخ) لەدێی شێخ تـەویل، کاتێك گەیشتینەوە شوێنی خۆمان بەلای شەهید مەلا ئەحمەد گەرمیانیدا تێپەڕین و چووینەوە، کاك حەمـە قاشتی (جێگری تیپ) هـاتبووە ئەو بەرەیـەو جهـازی ئـەکرد بـۆ شـەهید حەمـە فـەرەج هـەورامی، کـە بـەخۆی و کەرتەکەیـەوە چووبوونە سەر گۆڕستانەکەی دێکە بەلای دێی قەڵاتەپزانی شاتریەکاندا، منیش هـەواڵی (خالدی مام مجید) کە برازام بوو پرسیم، لەگەڵ شەهید حەمە فەرەج هەورامی بوو، بەکاکە

حەمە قاشتیم ووت: کاکە حەمە ئەو شوێنەی کاک حەمە فەرەج شوێنی شەڕنیەو تەنیا تۆپەکانی ڕژێم بەتوندی لەویٚ ئەدات، ئەگەر بمێننەوە هەموویان بەس بەتۆپەکان ئەکوژرێن، لەم قسانەدا بووین کاکە حەمە قاشتی هەر جهازی ئەکرد لەپڕ شەهید حەمە فەرەج هەورامی و پێشمەرگەکانی بەرەو ڕوومان دەرکەوتن و بەزمانی هەورامی جهازی ئەکرد لەگەڵ کاک جەمیل هەورامی دا، ووتم کاکە حەمە ئەوە چیە ووتی باهەر خۆت بزانیت هەموو بەرەکانی شەڕ تەواوبووە تەنیا ئەمەی ئێمە ماوە (تیپی ٥٥ ی قەرەداخ و شەڕی بەرگری شێخ تەویل)، ئێمەیش ئێستا ئەکشێینەوە بۆ دێی دەرەوارەکان لەبناری شاخی قۆپی بوو بەدیوی گەرمیاندا، ووتم باشە با لەسەرخۆ بە پێشمەرگەکان بڵێین و بەوجۆرە نەزانن، ئێمە بەڕێگای شیوێکدا سەرەو ژوور بەرەو دێی دەرەوار ڕۆیشتین، لەولاوە پێشمەرگەکانی بنکەی دواوەمان لەدێی بەکر بایەف ئاگریان بەردا لەبنکەو شتەکان و ئەوانیش بەرەو لای ئێمە هاتن، هەموومان گەیشتینە دێی دەرەواری خواروو، چەند خانویەکی کەمی چۆڵ بوو، ئینجا هەموو هەڵگەڕاین بەرەو دێی دەرەواری گەورە لەبن شاخەکە دێیەکی گەورەو ئاودارو خۆش بوو، هەر هەموو خەڵکەکە ڕۆیشتبوون، لەم دێیە زۆرترین هێزی پێشمەرگە کۆببوەوە، چونکە وەکو کشانەوەیەکی ڕێك و پێك بوو، بەهۆی بێسیم (جهان)ەوە هەموو لێپرسراوو هێزەکانی پێشمەرگە پەیوەندی بە بەرپرسانی مەڵبەندەوە بوون، کە پێشترو لەکاتی شەڕی بەرگریەکاندا لەدێی تیلەکۆی قەلەندەر بوون بەلای دێکانی گۆڕ ئەسپ و تاڵەوانی مامۆیەکاندا، لە بەرپرسانی مەڵبەندو ئەندامانی: کاک قادری حاجی عەلی و کاک عمر فەتاح و کاک ئاوات قارەمانی و کاک شێخ جەعفەر قەرەداخی بەرپرسی عەسکەری و کاک جەمیل هەورامی فەرماندەی تیپی ١٧ ی زمناکۆ لەنزیك ئەمان و کاک محمود سەنگاوی بەکۆمەڵێك پێشمەرگەی متفرقەو پشتگیری ئەو ناوەوە لەنێوان دێی دەرەوارو دێی تیلەکۆی قەلەندەردا هاتوچۆی ئەکردو سەرپەرشتی شەڕەکانی ئەکرد، دێی تیلەکۆی قەلەندەر بەدێی تیلەکۆی شینەشیان ئەووت لەناو هێزی پێشمەرگەدا، چونکە شینە پێشمەرگەیەك بوو بەو ناوەوە.

## ناوی تیپی ١٧ ی زمناکۆ لەکاتی شەڕی بەرگری ئەنفالەکانی ڕژێم دا :

کاک جەمیل هەورامی فەرماندەی تیپ، کاک مەلا ئەحمەد غەریبْ (دسکەرەیی جێگر تیپ) لەم کاتەدا لەشەڕەکانی سەرکردایەتی (ئەنفالی یەك)دا برینداربوو، دوای شەهید مام هێرش کە پێشتر جێگر تیپ بوو، هەروەها شەهید (نامیق عەلی تۆفیق) ئەوبەری فەرماندەی کەرت بوو زۆر بەداخەوە لە شەڕی سەرکردایەتیدا شەهید بوو، شەهید محمود

مامه‌عه‌زه فه‌رمانده‌ی كه‌رت، عه‌لی ڕه‌شید سه‌عید قرگه‌یی فه‌رمانده‌ی كه‌رت، عه‌لی چه‌له‌بی (عه‌لی حاجی عه‌زیز) فه‌رمانده‌ی كه‌رتی ٦، كه‌رتی تیپ شه‌هید ئاوات تریفه‌یی فه‌رمانده‌ی كه‌رت، ئه‌حمه‌د ڕه‌شید ڕه‌مه‌زان گه‌لاڵی به‌رپرسی كاروباری كۆمه‌لایه‌تی، سه‌لاح جمعه خانه‌قینی به‌رپرسی ڕێكخستنی یه‌كێتی شۆڕشگێران، جه‌مال دیموكرات، حه‌مه‌ڕه‌زا ئیبراهیم ڕابه‌ری سیاسی، شه‌هید مه‌ناف هه‌ورامی كادری كۆمه‌لایه‌تی، هه‌روه‌ها له‌كاتی شه‌ڕو هێرشه‌كانی ئه‌نفالی ٢ ی قه‌ره‌داغ و ٣ ی گه‌رمیانـدا چه‌ند كادرێكی سه‌ر به‌ڕێكخستنی شۆڕشگێڕان به‌شداریه‌كی به‌رچاویان كرد له‌كاتی شه‌ڕو به‌رگریه‌كاندا له‌سه‌ر شاخی زه‌رده‌و ئه‌و كادرانه‌یش بریتی بوون له‌:-

١- شه‌هید ئه‌نوه‌ر حه‌مه ئه‌مین قرگه‌یی كه به‌ئه‌نوه‌ری خه‌لیفه خورشید ناسرابوو.

٢- كاك سه‌ردار عبدالله محمود (سه‌ردار عه‌ینه‌ك) برای شه‌هید سالار.

٣- عمر حاجی احمد چه‌وتانی بناری شاخی سورێن.

٤- عوسمان بیه ڕه‌شكه‌یی.

شایه‌نی باسه ئه‌م تیپه زیاتر تایبه‌ت بوو به‌پێشمه‌رگه‌ی سه‌ر به‌ڕێكخستنه‌كانی یه‌كێتی شۆڕشگێڕانی كوردستان‌و ڕۆڵی چاك‌و له‌به‌رچاویان هه‌بوو له‌سنوری مه‌ڵبه‌ندی یه‌كدا، هه‌تا له‌په‌رینه‌وه‌و كشانه‌وه‌ی مه‌ڵبه‌ندی یه‌كدا، دوای ئه‌نفالی ٣ ی گه‌رمیان به‌رپرس‌و كادرو پێشمه‌رگه‌كانی ئه‌م تیپه هه‌میشه له‌پێشه‌وه‌ی هێزه‌كانه‌وه بوون هه‌تا ده‌رباز بوون له‌سنوری قه‌ره‌داغ و په‌رینه‌وه له‌جاده‌ی ئه‌ڵڵایی، له‌وكاته‌دا كشانه‌وه‌ی ته‌وای هێزه‌كانی پێشمه‌رگه‌ی مه‌ڵبه‌ندی یه‌ك له‌به‌ره‌كانی شه‌ڕی به‌رگری ئه‌نفال دا.*

---

* چاوپێكه‌وتن له‌گه‌ل به‌ڕێزان حه‌مه‌ره‌زای كادر. سدیق علی تۆفیق.

## کشانەوەی پێشمەرگە

## لەگەرمیانەوە بۆ بناری قەندیل (مەڵبەندی یەك)

دوای ئەوەی کە هەموو هێزەکانی پێشمەرگەی (تیپەکان) لەبەرەکانی شەڕ کشانەوە، کە زۆرترینمان هاتینە دێکانی دەرەوارەکان لەشوێنێکی بەرزایی دا بوو، لێرەدا کارەسات ئەبینرا، هەر هەموو زەوی‌و ئاسمانی دێکانی گەرمیان یەك پارچە دوکەڵ‌و تەپ‌و تۆز تێکەڵاو بوو، ئاسمانی گرتبوو لەدوکەڵی سووتانی خانوو ماڵی دێکان‌و تەپ‌و تۆزی سەیارەو دەبابەو مصفەحەکانی ڕژێم، هەر مەجموعە یەکەیەکی عەسکەری دیاربوو ڕووی لەچەند دێیەك کردبوو، ئەوی لەئێمە دیاربوو دێکانی کورەمێرەکان‌و مەسۆیەکان‌و بەکر بایەف‌و بێسانەو شێخ تەویل بوون، لەناو هەموو دێکاندا تەنیا ئەم چەند دێیەی سەرەوە کە ئێمەی لێ بووین دەربەند دەرەوارو شێخ تەویل‌و بەکر بایەف عەسکەری نەگەیشبوویە، ئەوانی تر بە بەرچاوی ئێمەوە هێزی عەسکەری ڕژێم وەکو گورگی هار بەرەو ڕوویان ئەڕۆیشتن‌و لە گەیشتنیان بەهەر دێیەك بەپەلە ئاگریان تێ بەرئەداو ئەیان سوتاندو بەرەو دێیەکی تر کە دیاربوو لە ڕۆیشتنیاندا زۆر بەدیاری کراوی وەکو بەرنامەو مەبەست‌و ئەرکی سەرشانیان، ئەوەبوو کە هەموو خانوو ماڵ‌و دێکان بسوتێنن‌و تێکیان بدەن، ئەمە مەبەستی سەرەکی‌و پێویستی ڕژێمی عێراقی بوو لەم هێرشانەی بەناوی ئەنفالدا، خەڵکەکانیش بگرێت‌و زیندە بەچاڵیان بکات بەهەمان ناوی ئەنفالەوە، ئەوی کە ئێمە ئاگامان لێ بوو لەعەسردا عەسکەری ڕژێم وێرابووی بچێتە دێی شێخ تەویل‌و بێسانە، لەبەر ئەو بەرگریە قارەمانانەی پێشمەرگەکانی تیپی ٥٥ ی قەرەداخ ئەنجامیدا بۆ مێژوو، بە هەر حاڵ بەگشتی هەموو سنوری گەرمیان بەهەموو دێکانیەوە لەدەست هێزی پێشمەرگەو سنوری چالاکی مەڵبەندی یەکی پێشمەرگایەتی دەرچوو، بەڵام بەو هێزە زۆرە نابەرامبەرەی ڕژێم، بەو هەموو چەك‌و تەقەمەنی‌و چەکدارەوە، کە لەدواییدا زانیمان بەهەمان هێزەوە گەیەنراواتە فاوی داگیرکراوی شەڕی عێراق ئێرانەوەو گرتوویەتیەوە، هێزەکانی پێشمەرگە هەندێکیان بەلایەکی کەدا کشابوونەوە بەتایبەت تیپی ٥٩ ی حەمرین‌و هەندێکی ٥١ ی گەرمیان و ٥٧ ی سەگرمەو هەندێ شپرزەیی تیابوو، لەکشانەوەکەدا لەبەر ئەوەی بەرەی شەڕەکان یەکجار فراوان بوو، هەر لەسنوری چەمچەماڵ‌و هەمەوەندو قادرکەرەمو دووزو سەرقەڵای کفری‌و سەروی کەلارو باوەنورو شاخی قۆپی قەرەداخدا گرتبووەوە، جگە لەهێزەکانی پێشمەرگە خەڵکە بەشەرەف‌و کوردپەروەرە دێرین‌و خاوەن مێژووینەی خەبات‌و بەخزمەتەکەی گەرمیانی کە هەموو ئەم

شهڕو پهلاماری بهناو ئهنفالهدا لهناو جهرگهی ئهماندابوو، زیاتر زهرهرمهندو ماڵوێران‌و زۆرترین ئهنفال لهم سنوره بریندراه هەژارەدا ڕووی دا، كه خهڵكهكهی بهزۆری‌و بهچاوی ئومێدی مانهوه ههر لهناو هێزی پێشمهرگهدا بوون، ههتا دوا نائومێدی كه بهكارهساتی مردنی خۆیان ئهزانی، زۆرترین پیاوو كوڕهكانیان بهچهكی خۆیانهوه پێشمهرگهی پشتگیری ناو بهرهكانی شهڕی بهرگری بوون، خێزان‌و منداڵهكانیان لهو ههردهو ئهدیوانهدا بوون ههتا دوایی بهسهرگهردانی‌و شپرزهیی ههر كۆمهڵه خێزان‌و ماڵێك بهرهو ڕووی هێزهكانی ڕژێم‌و شوێنهكانی سهرجاده ڕۆیشتن، كه زۆربهیان ڕوویان لهشارۆچكهی كهلار بهپلهی یهكهم‌و چهمچهماڵ بهپلهی دووهم ئهڕۆیشتن، تووشی ئهو كارهساته گهوره زیانبهخشهی ئهنفال بوون، كه تا ئێستا بهههزارهها كهسیان لهچارهنووسی نادیاری ئهنفالی شومدایه، ئێمه وهكو زۆرترین هێزهكانی تیپهكان كه بهپهیوهندی بێسیم (جهان) سهرپهرشتی ئهكراین، ئاگاداركراین بهرهو ههردوو دێی دهرهوار كشاینهوه، لهناو تیپهكاندا تیپی (٥٥)ی قهرهداغ كه لهشهڕی بهرگری دێكانی شێخ تهویل‌و بێسانهو بهكر بایهف بووین زۆر سهركهوتوانه كشاینهوه، كاتێك چووینه دێی دهرهواری خوارووی چۆڵی لهدانیشتوان بهزۆری هێزی پێشمهرگه لهو دێیه بوون، شوێنێكی بهرزبوو ئهیڕوانی بهسهر زۆر لهدێكانی گهرمیاندا كه ههمووی بهرهو وێرانه ئهڕۆیشتن، لهوكاتهدا هێزی پێشمهرگه ماڵئاوایی لهجهماوهرو دێكان ئهكرد، لهپێش نیوهڕۆدا ئاگاداریان كردین كه ههرچهند پێشمهرگهیهك بچنه ناو ماڵه چۆڵهكان‌و بهههرجۆر بووه ئارد پهیدا بكهن‌و ناوساجی بكهن بۆ ٧ حهوت ڕۆژ، چونكه ئهڕۆین به خۆشاردنهوهی ڕۆژو دهرچوونی شهو ههتا ئهو ٧ ڕۆژه ئاوهدانی نابینین، ههندێ ڕۆژیش ئهبێ له دهمهوبهیانیهوه له شوێنێكدا خۆمان بشارینهوهو ههڵنهسین ههتا شهو، وانهبێت دهرناچین كێ ئهتوانێ‌و خۆڕائهگرێت ئهبێ وابكات ئهمهیان پێ‌وتین، بۆ خۆئامادهكردن ههر چهند پێشمهرگهیهك چووینه خانوه چۆڵێكی دێكه بۆ ئاردو ڕۆن دۆزینهوهو گوێ نهدان بهپاك‌و پیسی، ئێمه كۆمهڵێك پێشمهرگهی هاوڕێی یهكتری بووین، لهوانه كاك شێخ ئهحمهد شێخ عهبدول بهرپرسی كۆمهڵایهتی تیپی ٥٥ ی قهرهداغ‌و مامۆستا سۆران خانهقینی بهرپرسی دارایی‌و كاك مهلا ئهحمهد دهلوجهیی كادری ڕێكخستن‌و شههید وهستا تایهر جێگری كهرت‌و چهند پێشمهرگهیهك چووینه خانویهك بۆكردنی ناوساجیهكه، شتێكمان دهست نهكهوت تیابكهین ناچار تهنكیهكی كۆنی ئاومان دۆزیهوه بهقهمهی كلاشینكۆفهكانمان بڕیمانهوهو له بنهكهیدا چهند ناوساجیهكمان كردو دابهشمان كرد بهسهرخۆماندا، ئهبوایه ههركهس بهشی خۆی ههڵگرتایه، ئینجا ئاگاداریان كردین ههموومان پێكهوه بهرهو دهربهندی

دەرەوار ڕۆیشتین، بەڕێزان کاك قادری حاجی عەلی و کاك عومەر فەتاح و کاك ئاوات قارەمانی و کاك شێخ جەعفەرو هەندێ لەسەر تیپەکان، بەتایبەت کاك جەمیل هەورامی لەگەڵماندا بوون سەرپەرشتیان ئەکردین، هەموو هێزی پێشمەرگە لەم قوڵەوە کۆبووینەوە نزیکەی هەزار پێشمەرگە ئەبووین، لەناوماندا بەڕێزان: کافیە سلێمان خێزانی کاك عومەر فەتاح و ڕەحمە خانی خێزانی کاك عومەر غەریب و هەروەها چەند ژنە پێشمەرگەیەك لەناویاندا نازەنین ناوێك خێزانی پێشمەرگەیەکی هەژار بەناوی (سەرتیپ عەلی خدر) بوو کە ئەم ژنە تازە بووك بوو بوخچەیەکی پێبوو کەلوپەلی بوکێنیەکەی تیابوو، هەموومان بەدەربەند دەرەواردا هەڵگەڕاین لەنزیکی نیوەڕۆی (١٩٨٨/٤/١٤) لەناو دەربەندەکەدا چەکداری عەرەبی تیابوو بەناوی لەشکری بەدر خۆیان دامەزراندبوو بەدرێژایی دەربەندەکە بۆ سەرەوە، کاك قادر بە بەرپرسەکەیانی ڕاگەیاند دەربارەی بەجێهێشتنی سنورەکە، لەم کاتەدا زۆر لەپێشمەرگەکانمان پێڵاوەکانمان دڕا بوو، ئەم لەشکری بەدرەیش پێڵاوە کۆنەی لاسیکیان زۆر فڕێ دابوە دەوروپشتیان، هەندێکمان سودمان لێوەرگرت لەوانە خۆم بووم بەدووجاری ناردنی خالدی برازام جووتێ لاسیکی کۆنی بۆ هێنام، هەتا دێی گەرمکی دەشتی کۆیە، زۆر ئازارمان چەشت بەڕێگادا تەنانەت بێ پێڵاوی و خراپی پێڵاو لەپێماندا بوو، هەرچەند ڕەق و ساردبوو، شەوی ١٤ر١٥/ و ڕۆژی ١٥ و شەوی ١٥ر١٦ /١٩٨٨/٤ چووینە ناو قۆپی قەرەداخ لەناو دارسنەو بەرەکاندا بووین، شەو ئاگرمان ئەکردەوە لەبەری ئەخەوتین، ئەگەر بەتانی یان کیسە خەوێکمان بدۆزیایەتەوە لەو بنەبەردانە، یان کیسە چاو شەکرو برنجی بەجێماوی دێکان و ئاردو ڕۆن، لەوانە زیاتر هیچمان پێنەبوو، بوتڵی نایلۆنی شەربەتمان بڕیبوەوە بۆ چاخواردن، لە ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٥ لەنیوەڕۆدا جارێکی تر هەندێ ناوساجیمان کرد، ئێمە شەهید حەمە فەرەج هەورامی بۆی کردین و خزمەتی ئەکردین، دوو کوڕی هەژاری ناتەواومان لەگەڵدا بوو یەکێکیان ناوی محمد بوو خەڵکی دەربەندیخان بوو، پێشتر لەگەڵ برایەکی دا بەناوی نورالدین لەو دێیانە شوانیان کردبوو، ئەوی کەیان ناوی عاصی تاڵاوی گەرمیانی بوو، لەگەڵماندا هەتا ئێران و چەند ساڵێك ئاوارەیی مانەوە، زۆر لەڕژێم ئەترسان بە عاصیمان ئەووت بۆ دێیت، ئەیووت چۆن نەیەم حکومەت پەزەکان (مەڕەکانی)ی بردین چۆن خۆم نابات، ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٥ لە نیوەڕۆدا بەزۆری خەریکی ناوساجی کردن و چالێنان بووین لەناو قوپیەکەدا (قۆپی قەرەداخ) ئاگرمان کردبوەوە، هەندێ دەستەی پێشمەرگە بەسەر بەرزاییەکانی دەوروپشتمانەوە بوو، جگە لە پێشمەرگەی پەردەوازەو ئەم هێزەی ئێمە لەم شوێنەدا خاوەنی هیچ شوێن و جێگایەك نەبووین، لەپڕ کۆپتەرێك هاتە سەرمان زۆر

بەنزمی، بەپەلە ئاگرەکانمان کوژاندەوەو بڵاوەمان کرد، زۆرترساین، بەڵام دیاربوو فڕۆکەکەیش بەڕێکەوت هاتە سەرمان، ئاگای لەهیچ نەبوو، بۆیە هەرزوو ڕۆیشت و ڕزگارمان بوو، ئێوارەی ١٩٨٨/٤/١٦ لەکات ژمێر ٤ ی عەسردا هەموو ئاگادارکراین کە ئەڕۆین، دیاربوو دەستەی بچوکی پێشمەرگەیان ناردبووە خوارەوە بۆ ناو دێکانی قەرەداخ بۆ تاقی کردنەوەی ڕێگاکە، بۆیە هەموومان ڕیزبووین بەدرێژایی ناو قۆپیەکەو هەندێ لەپێشمەرگە بریندارەکان لەوانە کاك بەختیاری کاکە حەمەی مەلا عزت وڵاخیان گرت بوو سواری بووبوون، لە ڕیزەکەدا بەسواری لەناوماندا ئەڕۆیشتن ئەسپێکیان بەردابوو بڕوات، بەڵام بەهەموو هێزی پێشمەرگە لێمان دوور نەئەکەوتەوەو بەدرێژایی ڕیزی پێشمەرگە بەغار لەگەڵمان ئەهات، ئەوەی شایانی هەمیشە لەیادە ئەوەبوو کە ئەو هاوڕێ پێشمەرگانەمان کە بڕیاری مانەوەو پارتیزانیان دابوو لەناو گەرمیان و قەرەداخ کەچەند پێشمەرگەیەك بوون لەناویاندا شەهیدی هاوڕێمان کاك مەلا ئەحمەد گەرمیانی سەرتیپمان بەدرێژایی چەند مەترێك بەیناوبەین لەیەکتریەوە ڕاوەستا بوون لەقەراخی ڕێگاکە خواحافیزیان لێ ئەکردین و ماچیان ئەکردین، ئەمە هەرگیز لەیادمان ناچێت، ئەو دیمەنە پڕ لە خۆشەویستیە پێشمەرگایەتیە کە لەو کاتەدا بێ دیاری چارەنووسی هەردوولامان چاومان ئەبریە یەکترو لەچاوماندا چەندەها بۆچوون ئەبینرا، لەڕاستی دەێ گۆشان ئەبوایە ڕامان بکردایە، چونکە چەکداری ڕژێمی تیابوو بەرەو ئەو ڕێیە تەقەیان ئەکرد، ئێمە بەرەو شاخی سەرکۆو دەربەندی جافەران ئەڕۆیشتین، لەشەودا گەیشتین، بەڵام شەوێکی یەکجار تاریك و لەبەختی پێشمەرگەدا ماوەی زیاتر لە ٣ کات ژمێر بارانێك لێی داکردین زۆر بەخوڕ، بەجۆرێك لەناوەڕاستی شاخەکەدا بووین هەموومان توند یەکتریمان گرت بوو ئینجا چاومان لەیەکەوە نەبوو، ناچار هەتا هەندێ بارانەکە خۆشی کردەوە لەناوەڕاستی شاخەکە ڕاوەستاین، دوایی بەناچاری کەوتینەوە ڕێ، چونکە ئەبوایە لەتاریکیدا جادەی قەرەداخ و بەردەم جافەران بڕین، چونکە عەسکەری لەو ناوەدا بەهێزی هەندەسەوە خەریکی تێکدانی دێکان بوو، بەهەر حاڵ دەمەوبەیان پەڕینەوە بۆ دێکانی هاڵدەرەو مریم بەگ، ئەمە ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٧ زۆر هیلاك و ماندوو تەڕبووین، مزگەوتەکەی دێی مریم بەگ تێکدرا بوو، سەقفەکەی کۆنکرێت بوو کەوتبوە سەر زەوی لەژێرەوە کونێکی تیامابووەوە پیا چووینەوە ناوەوە هەندێ حەسیری تیا مابوو هێنامان بۆ دێکەو لەناو ژوورە چۆڵەکاندا دامان خست و ئاگرمان کردەوە بۆ خۆووشك کردنەوەمان، لەم شەوی هاتنە خوارەوەمان کاك بەهزاد خانەقینی زۆر ماندوو نەخۆش بوو، هەموومان لەخەمیدا بووین، لەناو ئەم دێ چۆڵانەدا تەنیا کاك محمدی برای شەهید لوقمانمان بینی،

بەتەنیا لەناو ئەو دێ چۆڵانەدا ئەگەڕا، زۆر دڵی بەبینینی پێشمەرگە کرایەوە، سەردانی هەموومانی کردو باسی ئەو ناوەی بۆ کردین، لە نزیکی نیوەڕۆ گوێمان لەتەقە بوو لای دێی جافەران و سەیرمان کرد عەسکەریە بە هێزێکی تایبەتەوە بۆ تێکدان و وێرانکردنی دێکان ئەچوون، بەرەو لای ئێمەوە ئەهاتن، لەهەمان کاتدا فڕۆکەیەکی کۆپتەر هاتە ئاسمانی سەرمان، بەناچاری هەموو هێزەکانمان بەناو دارە کالپتۆزەکانی ئەو ناوەدا بەرەو دێی قازانقایە ڕۆیشتین، ئەم دێیە هەموو کەل و پەل و شتەکانیان لەناو ماڵەکان و خانووەکاندا مابوون، تەنیا خەڵکەکانی ڕۆیشتبوون، دیاربوو بەسەڵتی هەڵاتبوون، نیوەڕۆ هەرچەند پێشمەرگەیەك چووینە ماڵە چۆڵێکی دێی قازانقایە، لەو خواردەمەنیەو شەکرو چایانە کە جێ‌مابوون لەماڵەکاندا سوودمان وەرگرت، لەگەڵ ئەو دیمەنە ناخۆشەی ئەو هەموو دێهاتە جوانەدا کە بەبێ خاوەن و تەنیا قەبارەی خانوو ڕەزو باخەکانیان مابوونەوە لەدەشتایی و بناری شاخەکانیدا، ئەوانیش چاوەڕێی گەیشتنی دەستەو تاقمی هەندەسەی عەسکەری ڕژێم بوون، کەی بەخۆیان و ئامێرە تێکدەرەکانیانەوە بیانگەنێ و وێرانیان بکەن، پێشمەرگەیش بۆ چەند کاتژمێرێکی کەم مابوو لە ماڵئاوایی کردن لەیەکتر بۆ چارەنووسێکی نادیار، پێشمەرگەو دێهات و دیمەنی جوانی کوردستان لەوکاتەدا تەنیا غەم بوو، لەهەمووی پەژارەتر سەرگەردانی و شپرزەیی و خۆبەدەستەوەدانی جەماوەری دێهات نشینەکانی ئەم سنورانە بوو، کە بەرەو لای ئەو ڕژێمەی کە بەهیچ شێوەیەك باوەڕیان پێی نەبوو، هەمیشە خۆیان لای ئەپاراست، لەدوای کشانەوەی هێزەکانی پێشمەرگە لەناو گەرمیانەوە بۆ ناو دێ چۆڵەکانی سنوری قەرەداغ، لەم کاتەدا کاك عومەر غەریب کە کادرێکی بەرپرسی دارایی بوو لەگەڵ پێشمەرگەکانی کە ئەو کاتە بریتی بوون لە: مام ڕەوفی برای و کاك حەمە لەتیف دەربەندیخانی و کاك خالد ماوەتی ئەکەونە بەردەم چەند چەکدارێکی ڕژێمەوەو دوای شەڕو بەرگری پێشمەرگەکان بریندار ئەبن، بەتایبەتی کاك حەمە لەتیف و مام ڕەئوف بەخراپی لەبەر ئەوە ناچار ئەمێننەوە لەسنورەکەداو ئەگەڕێنەوە بۆ سەر قۆپیەکان، و پەیوەندی ئەکەنەوە بەدەستە پارتیزانەکان کە مابوونەوە، لەوانە دەستەکەی شەهیدی فەرماندە کاك محمودی مامە عەزەو، زۆر هاوکاریان ئەکەن، هەتا ماوەیەك لەلایەن ڕێکخستنەکانی ناو شارەوە دەربازیان ئەکەن، ئەیانگەیەننە بناری قەندیل بۆ ناو هێزی پێشمەرگە، کە بەڕاستی لەو کاتە پڕ لە مەینەتیەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و گەلی کورد کە تەنیا هێزی پێشمەرگە بوو پشت و پەنای، ئەمانیش کەوتبوونە بەرشاڵاوی ڕەشی دڕاندانەی هێزەکانی ڕژێمی بەعسەوە بەناوی ئەنفالەکانی شومەوە، بەڵام بۆ مێژوو لەم کاتە سەختەدا ڕێکخستنەکانی ناوەوەو

کۆمەڵێك چەکداری بەشەرەف و هەست بەمەسئولیەتی کوردایەتی بە ئەوپەڕی هیمەتەوە هاتن بەدەم هێزی پێشمەرگەوە، لە چنگی پیاوەکانی ڕژێم و هێرشە بەدناوەکانی (ئەنفال) یان ڕزگارکردن، بە بەرنامەیەکی زۆر بوێرانە ئەیانگەیاندنە دێکانی بناری قەندیل، کە ئەوکاتە هێزە کشاوەکانی پێشمەرگەی مەڵبەندەکانی گەیشتبویە بەتایبەتی هێزەکانی مەڵبەندی یەك و دوو، لەو دێیانەی بناری قەندیل، زیاتر لەچەند مانگێك حەوانەوە، لەوێش هاوکاری تەواو مەردانەکران، لەلایەن چەکدارەکانی ئەو سنورانەی قەڵادزێ و ڕانیەو چوارقوڕنەو سەنگەرسەرو هەموو کۆمەڵگاکان و تەنانەت ژن و منداڵ و خێزانەکانی پێشمەرگەیان بەسەیارەی خۆیانەوە ئەگەیاندە پێشمەرگە لەم سنوری دێیانە سوورەدێ، قرناقا، پشت ئاشان، کاسکان، ئاشقولکەو ئینزێ و لێوژێ..

## بەردەوامی کشانەوەی هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندی یەك:

بەڵام لەم چەند ڕۆژەدا هەرهەموو بەناچاری بەرەو لای نائومێدی و چارەنووسی ڕەش ڕۆیشتن، پێشمەرگە لە دێی قازانقایە لە ١٩٨٨/٤/١٧، لە کات ژمێر ٣٠ر٤ ی دوا نیوەڕۆژدا کۆبوونەوەیەکیان پێکرا بەمەبەستی دەرباز بوون، هەموو هێزەکە کرا بەدوو بەشەوە، ئەویش بەشێکی کەمی بەسەرپەرشتی بەڕێز کاك شێخ جەعفەر قەرەداخی بەلایەکی لای خاوێ و بۆ سنورەکانی سەرووی بازیان ڕۆیشتن، بەشە زۆرەکەی مەڵبەندیش بەسەرپەرشتی بەڕێزان کاك قادری حاجی عەلی و کاك عومەر فەتاح و کۆمەڵێك بەرپرسی عەسکەری وەکو کاك ئاوات قارەمانی و کاك جەمیل هەورامی بەرەو دێی (تەنگی سەری) دوا هەوارگەی شەهیدی سەرکردە کاکە ئارام بەڕێ کەوتین، بەڕێزو پێیان ڕاگەیاندین کەس لانەداو بەجێنەمێنێ، ئەمشەو ئەبێ لە جادەی ئەڵڵایی بپەڕینەوە، بەڕێگای قوڕوو ئاوو وشکانی دێکانی تەنگی سەروو و رمزیار، لەناو ڕیزەکانی پێشمەرگەدا چەند ژنێك دیاربوو هەمان ڕۆیشتن و ورەو هەستی پێشمەرگەیان هەبوو، زۆر دڵمان پێیان خۆش بوو، لەو ڕۆژگارە ناهەموارەدا بەو جۆرە خۆڕاگر بوون، لەوانە :کافیە سلێمان خێزانی کاك عومەر فەتاح و ڕەحمە خانی خێزانی کاك عومەر غەریب و ژنێکی هەژاری تازە بوکیش بەناوی نازەنین خان خێزانی پێشمەرگەیەك بوو بەناوی (سەرتیپ عەلی خدر) خەڵکی دێی عەلیاوای قەرەداخ بوون، لە تیپی ١٧ی زمناکۆ بوو، ئەم نازەنینە تازە بووکە تەنانەت کەلوپەل و جلە بوکێنیەکەی پێبوو، لە بوخچەیەکیدا بەکۆڵیەوە بوو هەتا چەند شوێنێك دڵی نەئەهات بە جێی بێڵێ، دوایی ناچار فڕێیدا کەلوپەلەکانی و خۆی زۆر ئازایانە هەتا ئێران و سنوری مەریوان لەگەڵمان هات، بەو جۆرە پێشمەرگە بەڕێز ئەڕۆیشت لەدێی تەنگی سەرەوە بەڕێکەوت، زۆر لەنزیکی یەکتر، برادەرانی بەرپرسی

مەڵبەندو هەندێ كادری عەسكەری سەرپەرشتی ئەكرد، ووشەی ڕاوەستە بەجێما، هەندێ جار لەدواوە بەسووكی ئەوترا بیگەیەنە بەوی پێش خۆت هەتا پێشەوە هەمووی ڕائەوەستا، كاتێك ئەزانی لەپشتەوە پێشمەرگە خۆی ئەدا بەیەكدا، ئەیان ووت ئەوە ئەو پێشمەرگەیە بەڕێوە خەوی لێ كەوتووە، بەهەر حاڵ ڕۆیشتن بەردەوام بوو، سەر لەئێوارە مانگە شەو بوو، لەتیشكی مانگەشەو ئەیدا لە شوشەی پەنجەرەی دێهاتە چۆڵەكان ئەبرسكایەوە، وا ئەزانرا كە خەڵكی تیایەو ئەوە چرایە ڕووناكی ئەدات، بەلام جگە لەسەگ‌و پشیلەو كەروێشك هیچی تیا نەبوو، تەنانەت سەگەكانیش زۆر بێ‌دەنگ بوون نەئەوەڕین، لەهەندێ شوێنی ڕێگاكەداو لەنێوان دێكاندا پێشمەرگە ئەكەوتە قوڕەوە دیاربوو بۆ مەرمزە كرابوو، پێڵاوەكانیان جێ‌ئەما، نەئەبوو خۆی خەریك بكردایە پێوەی، ئەبوایە بڕۆیشتایە هەتا بەجێ نەمێنێ..

### پەڕینەوە لە جادەی سەرەكی ئەڵلایی:

پێشمەرگە ئەچەقی لەقوڕەكەدا چەند كەسێك پێڵاوەكەی بەجێما، ناچار پشتێنەكەی ئەبەست بەقاچییەوە، بەو جۆرە هەتا گەیشتینە دێكانی دەشتی كۆیە، لەدێی مخورست‌و گەرمك چەند كوڕێكی گەنج بە پاسكیل ئەڕۆیشتن لە شارۆچكەی تەقتەق پێڵاوی ئەدیداسیان هێنا بەچەند جارێك، دەسكەوتێكی زۆر چاك بوو، هێزی ڕیزبووی پێشمەرگەی مەڵبەندی یەك لە شەوی ۱۷ر۱۸/٤/۱۹۸۸ لە كات ژمێر ۳۰ر۲ بۆ ۳ ی شەو گەیشتە نزیك جادەی ئەڵلایی، بەچەند كیلۆمەترێك لەسەرووی دێ كۆنەكەی ئەڵلاییەوە هەموو هێزی پێشمەرگەی ماندوو تەڕ كە بۆ ماوەی نزیكەی یەك مانگ بوو لەشەڕو ڕۆیشتن دا بوو، هەر لەئەنفالی یەكی سەركردایەتی‌و دووی قەرەداغ و سێی گەرمیان، چەند ڕۆژی سەرقۆپی‌و ڕۆیشتنی بەڕێوە بۆ دەربازبوون، لەم دەمەو بەیانیەدا هەوایەكی زۆر ساردی ئەهات بەڕوودا، لەگەڵ ئەم هەموو ماندووبوون و برسیەتیەدا هەندێ لەپێشمەرگە كەوتە سەر زەویە تەڕو قوڕاویەكە داو خەوی لێ‌ئەكەوت، هەتا ئەوكاتەی پێشمەرگە گەیشتە سەرجادە قیرەكەو كەمینەكەی جێگیركرد، بەمەبەستی دڵنیا بوون لە پەڕینەوەی هێزەكەی پێشمەرگە بۆ ئەو دیوو جادەكە، شاخە بەرزو دارستانە غاباتەكەی پشت ئەڵلایی، لە سەروشمانەوە لەسەر جادەكە سەیتەرەیەكی لێ بوو بەیەك كڵۆپی گەورەی بلاجكتۆر ئەو ناوەی ڕوون كردبووە، بەیناو بەینیش حەرەسەكەیان فیشەكێكی ئەتەقاند بەئاسماندا، بەكوێرانەو هەندێ جار بەسەر هێزەكەدا بەنزمی ئەڕۆیشت، دوای ئەو ماوەیە پێشمەرگە ئاكادار كرا بەپەڕینەوەو لەجادەكە بۆ ئەوبەر، كە تەلبەنی دركاوی سیاجی غاباتەكە بوو، كاك عومەر فەتاح هەندێ تەلەكەی بڕی بۆ ئاسانی ڕۆیشتنی

پێشمەرگە بەشێوێکی نەدیودا، هەندێکیش بەسەر شاخەکەدا ڕۆیشتن، تێکرا لەپشت دێی زایردا لەڕێی ناوەڕاستی شاخەکەدا هەمووی یەکی گرت، وورده وورده ئەگەیشت هەندێکی قاچی ئاوسابوو، سەیر لەوەدا بوو لەکاتی پەڕینەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ بەری ڕۆژئاوای ئەڵلایی لەسەر شاخەکەی پشتی دێ تێکدراوەکە، چەند ڕەبایەیەکی چەکداری خەفیفەی لێبوون، دنیایش تەواو ڕوناك بوەوە، بەڵام ئەو چەکدارانە زۆر مەردانە هاوکاری پێشمەرگەیان کرد هەتا هەندێ پێڵاوی خۆیان بۆ هێنان، بەڕێیان کردن، یەکێکیان زۆر بەسۆزەوە بەو بەیانیە هۆرەی جافی ئەکرد، لەپشت زایرا، ماوەی چەند کات ژمێرێك پێشمەرگە مایەوە، ئەوەی چای پێ بوو لێینا بەو چایەی کە لەکیسی بچوکدا بوو (سیلان و بابل) لەبن بەردەکان ئەدۆزرایەوە، پێشمەرگە ئەیخستە کوڵە پشتەکەیەوەو بە بوتڵی نایلۆنی شەربەتیش ئەبرایەوە وەکو پیاڵە بەکاری ئەهێناو بە ناوساجی سەرقۆپیەکەوە کەپێمان بوو، خۆشحاڵ ئەو پێشمەرگە بوو کەچاو نان‌و ناوساجی پێبێت لەم ساتەدا.

### گەیشتن بە دێکانی چەمی ڕێزان:

پێشمەرگەی وا هەبوو کەخۆی چای پێ نەبوو داوای یەك قووم چای ئەکرد، ئەیووت بابەو تیکە ناوساجیەوە بیخۆم، پێشمەرگە لێرەدا هەندێ پشووی دا، چەند کات ژمێرێك خەوتن لەبن ئەو بەردی شاخەدا، لەدوای نیوەڕۆوە جارێکی تر ڕیزبوون و بەرەو دێی گولیجە، ئینجا لەشەودا لەدێی گەبەی چۆڵ لەئاوەدانی تەنیا خانوەکان مابوونەوە بەساغی، هەرچەند پێشمەرگەیەك چوونە ماڵێکی چۆڵ، هەندێ حەسیر لە مزگەوتەکەدا بوو پێشمەرگە بەکاریهێنا لەماڵەکاندا، ژوورەکان سۆپای داری تیا بوو زۆرباش بوو بۆ خۆ ووشك کردنەوەی جل‌و بەرگی پێشمەرگە، کە چەندەها شەو تەڕبوبو، سەیر لەوەدا بوو هەرکات پێشمەرگە بەڕێ ئەکەوت یەکسەر بارانێکی زۆر ئەباری، بەسەر پێشمەرگەدا بەجۆرێك لە تەڕبوون دەرچوو بوو، لەگەڵ ئەوەی کە کەس هیچ کەل‌و پەل‌و جلێکی کەی پێنەبوو، جگە لەوەی کە یەك ئاوەدانی لەڕێگادا نەبوو، لەو هەموو ڕێگایە تەنیا لەدێی گولیجە دایکێك‌و دوو کوڕی سەربازی هەلاتوومان بینی مابوونەوە چاوەڕێی ڕێگا چارەیەك بوون دەربازبن، هێزی پێشمەرگەیش بێ شوێنی حەوانەوەو بێنان‌و بێ دڵنیایی لەگیان، تەنیا ئومێدو ورەی خۆڕاگری و هەست بە لێپرسینەوە بەرامبەر ئەم ڕۆژگارە مێژوویە، هەستی شۆڕشگێڕی لەگیانی پێشمەرگەدا زۆرباش‌و بەرزبوو، یەك پێشمەرگە لەیەکتری نەئەترسا، هەر هەموو وەکو برایەکی ڕاستەقینەی هاوسەنگەر وابوو، ڕەچاوی هەست‌و ماندووبوونی یەکتریان ئەکرد، و هاوکاریەکی باش لەنێوان پێشمەرگەدا بوو، بەهیچ جۆرێك‌و تاکە وشەیەکی ورە بەردان و خۆ تەسلیم کردنەوە نەئەکەوتە نێوان

پێشمەرگەوە، بە ژمارەیەکی چەند کەسێك لەڕێگا گەڕانەوەو خۆیان دواخست ئەوانیش ئەوەندە بەشەرمەوەو بەنهێنی هەتا کەس نەزانێ بەوجۆرە ئەگەڕایەوە بۆ ناو شارەکان، یان خۆشاردنەوە یان تەسلیم بوون بەچەکداری ڕژێم، ئەوانیش یەك هەواڵی پێشمەرگەیان نەدرکاند بۆ دەزگاکانی ڕژێم، زۆریش لەو پێشمەرگانەیش کە خۆیان کردبوو بەناو شارەکانداو دوایی ڕێگایان دۆزیبووەوە یان بەهاوکاری چەکدارەکانی ناوشار خۆیان گەیاندەوە هێزی پێشمەرگە لەبناری قەندیل، لە ڕۆژەکانی ١٨ر١٩/٤/١٩٨٨ هێزی پێشمەرگە بەهەمان ڕێگا لەدوای دێی گەبە کە بەرەو گەورەدێ، دوایی دێکانی چەمی ڕێزان، دێی کەڵەشێرەی کەڵەپیاوی کورد مام کوێخا نەریمانی خاوەن خزمەت و دیوەخانی پێشمەرگە، لەنێوان هەردوو دێی گولیجەو گەبەدا لەعەسردا کاتێك هێزی پێشمەرگە ئەڕۆیشتن بەرەو دێی گەبە لە خوارەوە لەکۆمەڵگاکانی پیرەمەگرون و کرژە گوێمان لەتەقەی ئاڕ بی جی بوو ئەکرا بەئاسماندا، وامان ئەزانی کە فڕۆکەی ئێرانە تەقەی لێ ئەکرێت، بەڵام لەشەودا بەهەواڵی ڕادیۆ زانیمان ڕژێمی عێراق شارۆچکەی فاوی خوارووی عێراقی گرتووەتەوە، کە ماوەیەك بوو بەدەست هێزی ئێرانەوە بوو، لەم کاتەوە هێزەکانی ڕژێمی عێراق بەهۆی هاوکاری چەك و تەقەمەنی زۆری دەوڵەتیەوە بەرەو هەڵسانەوە بوو، توانی شوێنەکانی خۆیان بگرنەوە، لە هێرشە گەورەکەی ئێران نەترسێ، لەنێوان ڕۆژانی ١٩/٤/١٩٨٨ هەتا ڕۆژی (١٩٨٨/٥/٣) پێش لێدانی ڕژێم بەکیمیاوی لە دێی گۆپتە، بەو سنورە کە ئەو ماوەیە نزیکەی دوو هەفتە هێزەکانی پێشمەرگەی مەڵبەندی یەك کە زۆر ماندوو بوون بەئاسانی لەم دێهاتانەی ئەم سنورەی هەردوو بەری زێی دوکان پشوویان دا، خزمەتکران، لەم کاتەدا بارودۆخی ناوچەکە زۆر ئارام بوو، دیاربوو ڕژێم لەخۆسازدانەوەی هێزەکانی بوو، بۆ داڕشتنی نەخشەی بەرنامەی پەلاماری ئەم سنورە، بەڵام جوتیارەکانی ئەم دێیانە زۆر لەسەرخۆو بەئومێدەوە بەتەواوی سەرقاڵی کاروباری جوتیاری و کشتوکاڵی خۆیان بوون، هەر لە بەیانیەوە بەتراکتۆرو بەسواری وڵاخ و بەپێ بەکۆمەڵ هەر خێزانە لەماڵ و دێکانەوە دەرئەچوون بەرەو کێڵگەکانی خۆیان، هەتا ئێوارە ئەهاتنەوە ناو ماڵ و دێکان، لەخزمەتی پێشمەرگەدا بوون، لەسەرەتادا زیاتر لە دێکانی: گۆپتەپە، عەسکەر، کانی هەنجیر، گلنا غاج، سۆرتکەو حەیدەر بەگ و دێکانی سەرچەمی ڕێزان و ڕۆژهەڵاتی زێ، دوای چەند ڕۆژێك هێزەکانی مەڵبەندی یەك بەزۆری بە کەڵەکی بچووکی خەڵکی دێکە کەهەر کەس بە نیو دیناری ئەوکاتە بوو پەڕینەوە بۆ ئەوبەری زێکە، بەری ڕۆژئاواو سنوری دەشتی کۆیە، لەدێکانی: کانی بی، ساتو قەلا، مەلا زیاد، گەرمك، مخورست، لەناو تیپەکانی هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندی یەك تیپەکانی ٢٥

ی خاڵ خالان بەفەرماندەی کاك ڕابەر سەید ئیبراهیم و تیپی ٢٣ ی سورداش‌و چەند کەرت‌و دەستەیەك لە تیپەکانی ٢١ی کەرکوك و ناوشوان و ٢٧ ی شارباژێرو سلێمانی و پیرەمەگرون و سۆشیالست و هەندێکی دەشتی کۆیەو مەڵبەندی دوو لەم سنورەدا بوون، لە هەردوو بەری زێکە لەکاتی جەولەی پێشمەرگە بەناو دێکاندا زۆرجار ئەچوونە سەر زێکەو هەندێ پێشمەرگە مەلەی ئەکرد، بەداخەوە لە ڕۆژی (١٩٨٨/٤/٢٣) لەنزیك دێی ساتو قەڵا پێشمەرگەیەك بەناوی (ستار محمد ڕەسول) دێوانەیی قەرەداخ لەناوی زێکەدا خنکا، لەبەر ساردی ئاوەکە، هەرچەند مەلەوانیش بوو، دوای ئەوەی لەلایەن مەلەوانی خەڵکی دێکەوە لاشەی دەرهێنرایەوەو لە دێی سات‌و قەڵا نێژرا، لەم کاتەدا کارەساتێکی ناخۆش بوو، پێشمەرگەی تیپی ١٧ ی زمناکۆ بوو بەم جۆرە پێشمەرگە لەم سنورەداو لەو ماوەیە بەئاسانی جەولەی ئەکرد بەناو دێکاندا، هەواڵیان ئەنارد بۆ کەس‌و کاریان‌و ئەوانیش سەردانیان ئەکردن، لە ڕێگاکانی کۆیەو کەرکوك و تەقتەقەوەو خەڵکی زۆر هاوکاریان ئەکردن، بەردەوامیش پێشمەرگەی بەجێماو خێزان لەسنورەکانی گەرمیان‌و جەباریەوە ئەگەیشتن، بەتایبەتی خێزان‌و منداڵ‌و کەسوکاری پێشمەرگە بەشێوەی پچڕ پچڕ، پەرتەوازە لەسنورەکانی گەرمیان‌و قەرەداغ و ناو شارەکانەوە ئەگەیشتن، لەگەڵ دەستەو پێشمەرگە متفرقە کە لە هێزو تیپەکانیان دابڕابوون، لەم کاتە پڕ لەمەینەتیەی هێزی پێشمەرگەدا بۆ مێژوو بەڕاستی ڕۆڵی پڕ لەهیمەت‌و پاڵەوانانەی شەهیدی فەرماندە شەهید حەمەڕەش مامە شێخ کەریم، لەدەربازکردن‌و ڕێنمایی کردن‌و پەڕاندنەوەی هێزی پێشمەرگەو خێزان‌و ئەوانەی لەدەستی ڕژێم ڕایان ئەکرد بۆ چەندەها شەو لەجادەی ئەڵڵایی‌و چەمچەماڵ‌و شوێنەکانی کەوە ڕزگاری ئەکردن، هەر ئەو شەوەیش بەو هەموو ماندووبوون و بێ خواردن‌و خەوەدا ئەگەڕایەوە سنوری گەرمیان، ئەگەڕا بەشوێن دەستەو خێزان و پێشمەرگەی تردا، لەو خێزانانە کە بینیمان بەدرێژایی ئەو ڕێگایە هەتا بناری قەندیل، نزیکەی (١٠) دە خێزانێکی سنوری جەباری بەولاخی گوێ دریژ هەندێ کەلوپەل‌و منداڵەکانیان خستبووە سەری‌و تەنانەت پیاوەکان‌و ژنەکانیان بەپێ ڕێیان ئەکرد، بەو هەموو شوێنە سەختانەدا دەستیان بەمنداڵەکانیانەوە گرتبوو لەڕێگا قسەیان ئەکردو بەدەم‌و چاویانەوە دڵیان خۆش بوو، تەنیا لەبەر ئەوەی لەدەستی ڕژێم ڕزگاریان ئەبوو، بۆ شوێن و چارەنووسی نادیاری ناو ئێران ئەڕۆیشتن، هەندێ جاریش پێکەنین و قسەی خۆشیان لەگەڵ یەکتری ئەکرد، ئەمە نیشانەی خۆشی‌و پێویستی (ئازادی) بۆ ژیانی مرۆڤ کە لەناو ژیانی سەختیشدا مرۆڤ هەست بەوجۆرە خۆشحاڵیە ئەکات، کە تەنیا دەسکەوتەکەی ئەوەیە لەچنگی ڕەشی ڕژێمە سەر دەستەکەی ڕزگاری ببێت، کاتێك بگاتە

ئەو ئامانجەی کە ئەو ڕژێمە بێبەزەییانە کرداری لەگەڵ ئەکات، چارەنووسیش بەدڵنیاییەوە کوشتن و برینی نامرۆڤانەیە بۆیە هەندێ جار هەڵاتن لەدەست داگیرکەران خۆشحاڵی دەربڕینە لەژیاندا..

## ئەنفالی (٤)ی دەشتی کۆیە و لێدانی کیمیاوی لەدێی گۆپتەپە

هەتا ڕۆژەکانی کۆتایی مانگی ١٩٨٨/٤ و چەند ڕۆژێکی کەم لە مانگی (٥) جەماوەری سنوری دێهاتەکانی دەشتی کۆیەو ئەم بەرو ئەوبەری زێ لەسەرخۆو هێمن ئەژیان، جوتیارەکانی بەگشتی سەرقاڵی ئیشی کشتوکاڵی خۆیان و ڕاوەماسی بوون، لەزێکەدا هێزەکانی پێشمەرگەیش لەجەولەی نێوان دێهاتەکاندا بوون، لەم کاتەدا بەرپرسی یەکەم کاك شێخ جەعفەر شێخ مستەفا قەرەداخی بوو کەبەرپرسی عەسکەری و سیاسی و دیاری لەگەڵ زۆربەی سەرتیپەکان و کادرەکان، هەرکادرە بەپێی بەرپرسێتی ئیشەکەی سەرپەرشتی تیپ یان دەزگاکەی خۆی بوو، ڕژێمی عێراقیش لەلای خۆیەوە لەهەموو سنورەکانی ژێر دەسەڵاتیەوە لە ئامادەکردنی هێزو توانای عەسکەری و چەکدارو هەموو جۆرە چەکەکانی بوو، بۆ پەلامارو هێرش بردنە سەر ئەم سنورە، بەمەبەستی وێرانکردنی دێهاتەکانی و ڕاپێچی خەڵکەکەی بۆ کۆمەڵگا زۆرەملێکان هەروەکو پیشەی نامرۆڤانەی هەمیشەیی ڕژێم لەسەرەتای هەر دەست پێکردنی شاڵاوی ئەنفالێکدا، بەڕۆژێك یان شەوێك ئەبوایە بەچەکی کیمیاوی لەو سنورەی بدایە بەتایبەت لەخەڵکی هەژاری دێکان، بێ دەست پاراستن لەمناڵی ساواو ژن و پیرو پەککەوتە، لەم کاتەدا مانگی ڕەمەزان بوو، خەڵکی هەژاری دێهاتەکان هەمووی بەڕۆژوو بوون، چاوەڕێی بەربانگ بوون، لە ڕۆژی (١٩٨٨/٥/٣) داو لەکات ژمێر (٥ر٤٥) دەقیقە لەپڕ شەش فرۆکەی ڕژێم لەجۆری سیخۆ هاتنە سەر ئاسمانی ئەم سنورە، بەتایبەت دێی (گۆپتەپە)، لەماوەیەکی زۆر کەمی سوڕانەوەیاندا بەئاسمانداو دوای ئەوەی ئاڕاستەی جوڵەی باکەیان وەرگرت، زۆر بێبەزەییانە ڕق و کینەی خۆیان بەلێدانی ژەهری کیمیاوی هەڵڕشت بەسەر دانیشتوانی ئەم دێیەدا (دێی گۆپتەپە)ی عەسکەری سەرزێ، هەر لەبەری زێکەوە بە کیمیاوی لێیدا هەتا سەرقەڵاکەو ناو دێکەی بەزۆری گرتەوە، لەبەر ئەوەی سەر لەئێوارە بوون و مانگی ڕەمەزان بوو، لەدوای ئیشکردن هەموویان گەڕابوونەوە ناو دێکە، لەئەنجامی لێدانی کیمیاویەکە هەر ئەو شەوە (١٢٠) کەس لە ژن و مناڵی ساواو پیر شەهید بوون، دەها بریندارو کوێربوون، ئەوانیش لە دەرەوەی دێکە بوون، بەبریندارەکانەوە هەر هەموو ئەو شەوە سەرگەردان بوون، کەل و پەل و سامان و ماڵەکانیان

بەجێهێشت، هەندێکیان لەو چاڵی و چۆڵیەی نزیك خاڵ خاڵان و شوێنە نادیاریەکان خۆیان شاردەوە، تا دوایی ئەوانیش دەستگیرکران، کاتێك هێرشی ئەنفال بەعەسکەری و چەکدارەوە گەیشتنە سەریان هەموویان بردن و کەوتنە نادیاری چارەنووسی شومی ئەنفالەوە، گەنجەکانیان بێسەروشوێن کران و پیرو منداڵەکانیشیان گەیاندنە زیندانی بیابانی نوگرەسەلمانی خوارووی عێراق، ئەوی دەرچوو لەمردن دوای نزیکەی ساڵێك بەنائومێدی رۆڵەکانیان و شوێنەکانیان گەڕانەوە کۆمەڵگا زۆرەملێکان، سەیر لەوەدا بوو لەکاتی لێدانی کیمیاویەکە لەناو دێی گۆپتەپە منداڵێکی ساوا دایکی لەپاڵیا شەهیدبوو بوو، ئەم منداڵە مابوو کە ناوی (هەوار قادر نامیق) کچ، لەدواییدا چەکدارە کوردەکان رزگاریان کردبوو گەیاندبوویانە باپیرەی لە چەمچەماڵ، لەملاشەوە هێزەکانی پێشمەرگە هەر ئەو شەوەی ۳ر٤/٥/١٩٨٨ لەو سنورەدا ئەکەوێتە ئامادەباشی و سەنگەرگرتن بۆ بەرگری لەهێرشی بەیانی، (٤/٥) لە هەموو شوێنەکانی هەردوو بەری زێکە بەمەبەستی رزگارکردنی دانیشتوانی دێکان هەر لەبەرزایی و دێی ناصر ئاغاو تەکەڵتو سەنگەر لێ ئەدەن، بۆ بەیانی لەهەموو سنورەکانی کۆیەو تەقتەق و کەرکوك و چەمچەماڵ و ئاغجەلەر سنورەکانی دوکان بۆ چەمی رێزان هێزەکانی پیادەی عەسکەری و چەکدار لە زەویەوە بەپاڵپشتی تۆپی دورهاوێژ لە ئاسمانیشەوە بەجۆرەها فڕۆکەی جەنگی و بارهەڵگر لەکات ژمێر ۸ هەشتی بەیانی (٤/٥/١٩٨٨) هێرشی بەربلاوی رژێمی عێراق بەناوی ئەنفالی چوارەوە دەست پێئەکات، یەکێ لە کۆپتەرەکان بە بلندگۆ بەردەوام بە کوردی بانگ لە پێشمەرگە ئەکات کە خۆیان بدەن بەدەستەوە، بەردەوامیش هێرشی رژێم نزیك لە سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگە ئەبنەوە، لەملاشەوە دانیشتوانی دێکان هەر هەموو لەدێکان دەرئەچن و لە شوێنە چاڵ و ناوباخ و کشتوکاڵ و ئەدیوەکاندا خۆیان شاردبووەوە، شەڕ لەکات ژمێر ۸ ی بەیانیەوە بەو بەربلاویە دەستی پێکرد، بەتایبەت زۆر سەخت بوو لەسەر سنوری بەرزایی و دێی ناصر ئاغاو تەکەلتوو کە پێشمەرگەکانی تیپی ۱۷ی زمناکۆو هەندێکی تیپی ٥٥ ی قەرەداخی پێوە بوو، زۆر مەردانە بەرگریان ئەکرد لەکاتێکدا بەفڕۆکە لە ئاسمانیشەوە لێیان ئەدان، ئەم سنورە لەلایەن کاك جەمیل هەورامی فەرماندەی تیپی (۱۷)ەوە سەرپەرشتی ئەکراو شەڕو بەرگریەکە زۆر سەخت بوو، لەئەنجامدا لەنزیکی نیوەڕۆ (۹) نۆ پێشمەرگەی قارەمان لەم سەنگەرانەدا شەهید بوون، کە (۸) هەشتیان پێشمەرگەی تیپی ۱۷ی زمناکۆ بوون، یەکێکیان پێشمەرگەی تیپی ٥٥ ی قەرەداخ بوو، کە زۆر بەداخیشەوە لاشەکانیشیان بەجێماو لەناو سەنگەرەکانیاندا بە چەکەکانی فڕۆکەکان چەندجار لێدران، ئەم پێشمەرگە شەهیدانەیش کە لەم سنورانەدا

لەبەرگری هێرشی ئەنفالی ٤ دا لە ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٤ لەپێش نیوەڕۆدا شەهید بوون ئەم قارەمانانەن:-

١- شەهید ئەنوەر حەمە ئەمین قرگەیی ناسراو بە(ئەنوەری خەلیفە خورشید) لە ساڵی ١٩٦٢ لەسەید سادقی شارەزوور لەدایك بووەو پێشمەرگەی ساڵی ١٩٨٤ بوو ڕابەر سیاسی تیپ بوو، لەساڵی ١٩٧٩ شدا صدیقی برای شەهیدبووە بە پێشمەرگایەتی، كادری شۆڕشگێران بوو.

٢- عبدالقادر حاجی سەعید، ناسراو بە مامە قالە قرگەیی فەرماندەی كەرت بوو دووەم كورە شەهیدی خێزانەكەی بوو.

٣- شێخ تایەر محمد بەرزنجی ناسراو بەوەستا تایەرە سوور فەرماندەی كەرت لە تیپی ٥٥ ی قەرەداغ و پاڵەوانی شەڕو بەرگری داستانی شێخ تەویلی گەرمیان بوو، زۆر بەداخەوە ئەم فەرماندەیە بەبرینداری دووریشیان خستبووەوەو خستبوویانە سەر وڵاخێك، بەڵام هەر زوو شەهید ئەبێت و دای ئەگرن تەسلیم بەخەڵكی دێكەی ئەكەن، لەویا ناشتبوویان هەتا دوای ڕاپەڕین، تەرمەكەیان هێناوە بۆ مێژوو كاك علی رشید زۆر هاوكاری كردبوو لەكاتی بریندارییەكەیدا.

٤- محمد حاجی غەریب حەمە ئەمین دسكەرەیی شارەزوور پێشمەرگەیەكی زۆر خۆشەویست بوو كە برای مەلا ئەحمەد دسكەرەیی بوو.

٥- مناف عابد بابا هەورامی تەوێڵەیی كادرێكی كارامەی كۆمەڵایەتی تێكۆشەر بوو.

٦- احمد كوردە.

٧- وشیار كەریم سەعید.

٨- ڕێبوار عمر محمد صاڵح ناسراو بەمامۆستا ڕێبوار.

٩- امیر ناسراو بە امیر كەركوكی.

ئەوەمان لەبیرنەچێت كە ڕژێم لەكاتی هێرشەكەدا ناوی زێكەی بەردایەوە هەتا هێزەكانی پێشمەرگە لەیەكتر ببڕێت، بەم جۆرە ئەم نۆ شەهیدەی هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندی یەكی (ی.ن.ك) خۆیان ئەكەن بەقوربانی ڕزگاركردنی جەماوەری سنورەكەو دەربازبوونیان لەم ناوە كەهەتا ڕۆژئاوابوون شەڕەكە درێژە ئەكێشێت، دوای ئەوەی شەودێت (٥/٤ /١٩٨٨) هەموو هێزەكانی پێشمەرگە لەشوێنێك كۆدەبنەوە، بەسەرپەرشتی كاك شێخ جەعفەر وكاك جمیل هەورامی و زۆر لەكادرەكانی و خەڵكی دێكانیش بەپەرتەوازەیی خۆیان دەرباز ئەكەن، لەم شوێنەدا هێزی پێشمەرگەو جەماوەر بۆ كاتێكی نادیارو بەدڵی شكاوەوە یەكتری بەجێ دێڵن، ئەوی كەجێگای زۆر ستەم بوو ئەوەیە كە جەماوەرەكە بۆ بەردەستی ڕژێمی بێبەزەیی بێ چارەنووسی ڕۆیشتن و هێزی

پێشمەرگەیش دوای بەجێ هێشتنی هاورێ شەهیدەکانیان خۆیان ئامادەکرد لەڕێگای تەقتەق کۆیەیان دا بۆ ئەوبەری دەشتی کۆیە هەولێرو دێکانی مەرزان و داربەسەرو پەڕینەوە بۆ سماقولی و بالیسانی سنورەکانی دەوروپشتی مەڵبەندی ۳ ی هەولێر، لەم کاتەدا مامۆستا عەلی عبداللە بەرپرسی تیپی تایبەتی مەڵبەند بوو کە هەمیشە ڕۆڵی مەردانەو شۆڕشگێڕی هەبوو.*

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێزان جەمیل هەورامی، علی رەشید، حمە رەزا.

## پێشمەرگە دابڕاوەکانی بەری چەمی ڕێزان و ڕۆژهەڵاتی زێی دوکان و چۆنیەتی بەرگری و ڕزگاربوونیان

لەبەر ئەوەی ڕژێم لەکاتی هێرشەکایدا بۆسەر ئەم سنورە ئاوی زێکەی لەبەنداوی دوکانەوە بەردابووەوە، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی کە ئەو هێزی پێشمەرگانەی لەبەری ڕۆژهەڵاتی زێکەیەوەدابڕێن لەهێزەکانی ئەوبەرو ناو سنوری دەشتی کۆیە، ئەمانیش لەلایەن هێزەکانی زۆری ڕژێمەوە لەسنوری چەمچەماڵ و ئاغجەلەرو دوکان و چەمی ڕێزانەوە پەلاماریان درا، بەهەمان هێزو توانای ڕژێم، تەنانەت فڕۆکەو کیمیاوی و ڕاجیمەو تۆپی بەردەوام بەرەتڵ لەکۆتەڵەوە ڕژێم ئەیهاویشت، جگە لەوەی کیمیاویەکە کاری کردبووە سەر پێشمەرگە، بەتایبەت ئەوی لەدێی عەسکەردابوو، دوای گۆپتەپە بەجۆرێك کە هەندێك پێشمەرگە دەستی یەکتری ڕائەکێشا، پێشمەرگەو تیپەکانی ئەم سنورەیش بریتی بوون لەچەند بەشێکی مەڵبەندی یەك، بەتایبەت فەرماندەی تیپ کاك عەدنانی حەمەی مینە توانی دوای چەند ڕۆژێك شەڕو بەرگری لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا بگەڕێتەوە سنوری گەرمیان و پەیوەندی بکاتەوە بەو دەستانەی کەمابوونەوە بۆ شێوەی پارتیزانی لەم سنورەدا، توانی ڕۆڵی خۆی ببینێ لەگەڵیاندا هەتا ماوەی ساڵێك ئینجا بگاتەوە سنوری مەڵبەندی یەك لەمەریوان. ئەویش بۆ پشودان و بەرنامەی هاوکاریکردنی دەستە پارتیزانەکان لەوکاتەدا، هەر لەم کاتە ناوەخت و ناهەموارەی پێشمەرگەی هەژاردابوو کە کاك ڕەفعەت عبداللە کەرکوکی مار پێوەیدابوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر خۆڕاگرانەو بەگیانێکی بەرگریانەوە ئامادەبوو شەهیدبێت نەك خۆی بدات بەدەست دوژمنەوە، بەڵام بەشەکانی کەی پێشمەرگە زیاتر مانەوە، تووشی شەڕی زیاتر بوون، لە سنورەکانی دێی عەسکەرو سورقاوشان و چەمی ڕێزان، ئەمانیش بریتی بوون لەتیپەکانی ٢٥ ی خاڵخاڵان بەفەرماندەیی کاك ڕابەر سەید بڕایم و کاك غەریب عەسکەری و تیپەکانی ٣١ی سلێمانی و ٣٧ی شارباژێر، لەگەڵ چەند فەرماندەیەك وەکو کاك عەلی بچکۆل کە بنکەی لەو ناوەدابوو، مامۆستا جەمال حاجی محمد فەرماندەی تیپ و عەبە ڕەق و هاوڕێ کاوەو مامە سەعەو شێخ ستار باساکی و عبدالکریم هەڵەدنی و شێخ فەرهادو عوسمان مایاوایی و دوو خوشکەزای کاك غەریب عەسکەری و کۆمەڵێك پێشمەرگەی ئەم تیپانەو متفرقە، دوای ئەوەی فەرماندەکان کۆبوونەوە بۆ سازدانی خۆیان و داڕشتنی بەرنامەیەکی خۆڕاگری و دەربازبوون، بەهەمان شێوە ورەدان بە

پێشمەرگەکان و بەتایبەتی ڕاوێژ بەکاك غەریب عەسکەری کرا کەزۆر شارەزای ئەم سنورەبوو، لەبەیانی زووی ١٩٨٨/٥/٤ هێرشی ڕژێم بەهەموو جۆرێك لە ٨ ی بەیانیەوە دەستی پێکرد، پێشمەرگەکانیش لەسنورەکانی چەمی ڕێزانەوە دامەزران، هەر لەدەورو بەری دێی شێخان و قەڵای جروندی، لەکۆتایی چەمی ڕێزان هەتا دێی سورقاوشان، هێزەکانی پیادەی ڕژێمیش لەسەری سردو سێکانیان و گەورە دێو چەند شوێنێکی ترەوە دەستیان کرد بەهێرش هێنان بۆ ئەم سنورەو سەر هێزی پێشمەرگەکان بەهەرجۆر پێشمەرگەکان بەرگریەکی باشیان کرد، زۆر سوودیان لەو ئەشکەوت و کونە بەردو شوێنانەی چەمی ڕێزان کرد هەر لەکانی دزان و شوێنەکانی تر لەکاتی هێرشەکەیاندا هێزەکانی عەسکەری و چەکدارەکانی ڕژێم دەستیان ئەگەیشتە هەر سامان و ئاژەڵ و مەڕو ماڵاتێکی هاولاتیانی ئەم دێیانە یەکسەر ئەیان پێچایەوەو ئەیان بردن لەدەست خاوەنەکانیان ئەسەندن، خۆیشیان سواری ئیفا ئەکردن بۆ سەربازگەکان و ئەنفالکردنیان، لەو خەڵکە پەرتەوازانەی دێهاتەکان، ئەم پێشمەرگە ئەبەردانە لەهەموو هێزەکانی کوردستان دابڕابوون و هەرچوار دەوریان هێزی ڕژێم بوو، بێ هیچ سەرچاوەیەکی ژیان، ماوەی چەند شەوو ڕۆژێك مانەوە لەم کونە ئەشکەوت و شوێنە نادیارەکانی چەمی ڕێزانی پشت و پەنای هەمیشەیی پێشمەرگەو شۆڕش هەر لە ١٩٨٨/٥/٤ هەتا(١٩٨٨/٦/٢٦)، هەر وەکو هاوڕێی هاوسەنگەری ڕاستەقینەی پشت و پەنای ڕۆژانی سەختی یەکتری، لەم ماوەیەدا دووجار پەڕینەوە لە زەرزیەوە پەڕینەوە بۆ سنوری پیرەمەگرون و شاخی بەرزو ئەشکەوتی گەچکار، کە لەناو بەرزایی شاخەکەدا بوو، لەوێ نزیکەی (٥٠) پەنجا پێشمەرگەیەك لەگەڵ کاك صابر کۆکەیی فەرماندەو کاك نوری عدد جیهازو کۆمەڵێك پێشمەرگەی ٢٢ ی سورداش لەوێ بوون، یەکیان گرتەوە، دوایی بەهیمەتی کاك عبدالکریم هەڵەدنی و کاك سابر کۆکەیی هەندێ خواردەمەنی پەیداکرا، بەهاوکاری کاك شێخ ڕەئوفی سوسێ، کە ئەوکاتە لەبەر جەژن مابوونەوە لەدێکەیاندا، دواتر گەڕانەوەو مانەوە لەسنورەکانی چەمی ڕێزان، ڕۆژانە حەرەسیات و چاودێری خۆیان و شەوانیش هاتنە دەرەوەو گەڕان بەدوای خۆراکی بەجێماودا، هەر جۆر بێت پێی بژین، کە لەم کاتانەدا بەزۆری لەسنورەکانی چەمی ڕێزان بەدەم یەکەوە بوون، هێزەکانی پێشمەرگە لەیەکتر دانەئەبڕان، وە چەند جارێك بەهۆی کاك عبدالکریم هەڵەدنیەوە پەیوەندی کرا بە ڕێکخستن و دڵسۆزەکانی ناو شارو سنورەکانی لای پیرەمەگرون، خواردن و پێڵاو گەیشتبوو پێیان زۆر سودیان لێ وەرگرتبوو، لەوکاتەدا کە بەڕاستی کورد لەکاتی زۆر ناهەمواریشدا هەر دڵسۆزی یەکترەو ڕێکخستنەکانیش پەروەردەی ڕۆژگارە سەختەکان و

هەمیشە بناغـەن بـۆ هێـزی پێـشمەرگە، هـەر لـەم کاتەشـدا بـەهۆی جهازەوە پەیوەنـدیان بەسـەرکردایەتی و مەڵبەنـدی سـێوە کردبـوو، داوایـان لێ کردبـوون کـە هـەرجۆر بـووە بپەڕێنـەوە لەزێکەو بگەنە سنوری مەڵبەندی سێ، ئەمانیش هەر بەهۆی کاك عبدالکریم هەڵەدنیەوە چووپیان پەیداکردو بەهاوکاری کاك فەقێ وشیارو کاك ئاواتی پۆلیس و کاك فەرهادو پێشمەرگەکانی کاك ڕابەرو کاك عەلی بچکۆل، بەچوپەکان کەڵەکێکیان پێك هێنا، هەرچەند لە (١٩٨٨/٦/٢٥) لە ڕۆژدا کاتێك پێشمەرگەکان لەچەمی بۆڵقامیش بەتەنیشت زێکـەوە لـە خۆئامادەکردنـدا بـوون، کـە لـەو شـەوانەدا بـڕۆن چـایان لێ نـابوو، لـەپڕ چـەکدارەکانی ڕژێـم چـووبوونە سـەریان ئـەمانیش خۆیـان شـاردبوەوە هـەتا شـەو، بـەڵام چـەکدارە کوردەکـان بەدوایانـدا نەڕۆیـشتبوون و هاوکـاری دانـانی خواردەمەنیـشیان کردبـوون، دیـارە کـورد دڵـی هـەر بەیـەکتری ئەسـوتێ لەهـەر بوارێکـدا خـۆی ببینێتـەوە، پێشمەرگەی کۆنیشیان تیا بووە، دیاربوو ئەو دوو شیوو چەمەی کەهەمووی زەل و قامیش بوو لەبەردەم دێی بۆلقامیش شوێنێکی زۆر لەبارو چاك بووە لەوکاتـەدا بۆ دەربازکردنی هێـزی پێـشمەرگە، خۆحەشـاردان تیایانـدا هـەتا شـەو بەتایبـەت بـانگی پێـشمەرگەکانیان کردبوو بۆ چاخواردن پێکەوە، دوایی لەشەودا هەتا کاتژمێر ١١ی شەو کەڵەك ئامادەکراو هەموو پەڕینەوە بەری کۆیە، بەهۆی کاك ڕابەرو پێشمەرگەکانی تیپـی ٢٥ ی خاڵخالانـەوە کـەزۆر شـارەزای ئـەو نـاوەبوون، لەبـەیانی ڕۆژی ١٩٨٨/٦/٢٦ گەیـشتنە شـیوێکی خـوار شـاری کۆیـە، هـەتا ئێـوارەو دوای تاریـك هـاتن لـەنێوان کۆیـەو هەیبـەت سوڵتاندا لـەجادە پەڕینـەوە بۆ دیـوی دێی جـەلی بۆ ڕۆژی ١٩٨٨/٦/٢٧ هێـزی پێـشمەرگە گەیـشتە گونـدی بالیـسان سـنووری مەڵبەنـدی ٣ ی هـەولێر لـەوێ لەلایـەن بـەڕێزان کـاك کۆسـرەت و مـلازم عومەر پێیان گەیشتن، شوێنیان بۆ دیاری کردن لەشـاخی بن حـەریرو بنکـەیان لـە خـەتێ، هـەتا ڕۆژی ١٩٨٨/٨/١٥ ئـەم هێـزە مانـدووە بێ پشوودان لـەم سنورەی مەڵبەنـدی سێدا بوون و بەشداری بەرگری هێرشەکانی ئەم سنورەشیان کرد.. *

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێزان ڕابەر سەید برایم ، مامە سەعە ،

## به ئه‌نفال كردنی دانیشتوانی گه‌رمیان و قه‌ره‌داغ و دێكانی ده‌شتی كۆیه‌و چه‌می ڕێزان دوای هێرشی ئه‌نفال بۆ ناو چه‌كه‌یان

دوایی ئه‌م هێزه له‌لایه‌ن كاك قادری حاجی عه‌لی به‌رپرسی مه‌ڵبه‌ندی یه‌كه‌وه داوا ئه‌كرێ بۆ بناری قه‌ندیل، ئه‌مانیش له دێی گولانه‌وه ئه‌په‌ڕنه‌وه بۆ دێی بۆڵێو له‌وێوه بۆ باڵه‌یان‌و ئاشقوڵكه به‌هۆی چه‌كداره‌كانی شه‌هید عه‌لی نه‌بیه‌وه هاوكاری ئه‌كرێن له‌په‌ڕینه‌وه‌یان به‌ناو چه‌كداره‌كانی ئه‌وكاته‌ی ڕژێمدا، هه‌رچه‌ند چه‌كداره‌كانی ئه‌م سنووره‌ی دۆڵی شه‌هیدانی سنووره‌كانی حاجی ئاواو ڕانیه‌و قه‌ڵادزێ هه‌تا سه‌ر جاده‌ی شه‌هیدان‌و ڕه‌بایه‌ی به‌رزایی به‌رامبه‌ر سووره دێ، به‌ڕاستی له‌هاوكاری ته‌واوو لێ براوانه‌ی هێزی پێشمه‌رگه‌دابوون، به‌تایبه‌ت له‌م كاته زۆر پێویسته‌دا كه‌هه‌موو هێزی پێشمه‌رگه ڕاپێچی سنووره‌كانی بناری قه‌ندیل كران به‌هۆی هێرشه سه‌خت‌و دژواره یه‌ك له‌دوای یه‌كه‌كانی ئه‌نفالی ڕژێمدا بۆ سه‌ر سنووری دێهاته‌كانی هێزی پێشمه‌رگه‌ی كوردستان به‌هه‌ر جۆر هێزی پێشمه‌رگه ئه‌گاته بناری قه‌ندیل‌و دێی ئاشقوڵكه، له‌لایه‌ن كاك قادری حاجی عه‌لی‌و كاك شێخ دارای حه‌فیدو كاك حه‌مه تۆفیق شوێنیان بۆ دیاری ئه‌كرێت له‌(باساوێن)ی نێوان ئاشقولكه‌و قه‌ڵاتوكاندا، كه شوێنێكی زۆر دارستان بووه، له‌م كاته‌دا له‌لایه‌ن سه‌ركردایه‌تیه‌وه زانیاری ته‌واو هه‌بوو كه ڕژێم له‌هه‌وڵی كۆكردنه‌وه‌ی هێزو په‌لاماری ئه‌م سنووره‌ی بناری قه‌ندیل‌و سنووره‌كانی مه‌ڵبه‌ندی ٣ ی هه‌ولێر، به‌مه‌به‌ستی دڵنیاكردن له‌م ڕێگا په‌ڕینه‌وه به‌هێزی پێشمه‌رگه بۆ بناری قه‌ندیل‌و ده‌ربازبوون له‌شالاوی ڕژێم، له‌م كاته‌دا سه‌ركردایه‌تی (ی.ن.ك)* ئه‌م سنووره‌و ڕێگاكانی بناری قه‌ندیلی قایم كرد، بۆ پشتیوانی‌و به‌رگری له‌و هێزانه‌ی مابوون، له‌سنووره‌كانی مه‌ڵبه‌ندی ٣ ی هه‌ولێردا، كه له‌م كاته‌دا هێزه‌كانی پێشمه‌رگه هه‌ر هه‌موویان كشابوونه‌وه، ئه‌م سنورانه‌و تێكڕای سنووره‌كانی گه‌رمیان، قه‌ره‌داغ، دۆڵی جافه‌تی، شارباژێرو ده‌شتی كۆیه، ناوشوان، به‌شێك له‌ده‌شتی هه‌ولێر، كه‌وتبوونه ژێر ده‌سه‌ڵاتی دڕنده‌یی‌و بێبه‌زه‌ییانه‌ی هێزه‌كانی ڕژێم، كه به‌هه‌موو توانایه‌ك كه‌وتبوونه وێزه‌ی تێكدانی دێهاته‌كان‌و بردنی ماڵ‌و سامانی جه‌ماوه‌ره‌كه، هه‌زارو بێده‌سه‌ڵاتیه‌كه‌ی‌و خۆیشیانیان هه‌ر هه‌موو به‌كۆمه‌ڵ ئه‌خسته‌نه ئیڤاو سه‌یاره‌ی سه‌ربازیه‌كانیانه‌وه بۆ سه‌ربازگه‌كانیان، له قۆره‌تووی ئه‌وبه‌ری سیروان (به‌ری خانه‌قین)، به‌تایبه‌ت ئه‌وانی گه‌رمیان‌و قه‌ره‌داغ‌و بۆ بارگای ئه‌منی سلێمان، به‌شێكی بۆ باره‌گای ئه‌منی سلێمانی‌و چه‌مچه‌ماڵ‌و خه‌ڵكانی هه‌ژارو سنووره‌كانی كۆیه‌و

چــەمی ڕێــزانیش بــۆ ســەربازگەی سوســێ و چەمــچەماڵ و کۆیــەو تەقتــەق، دوایــی کۆکردنەوەیان هەموو ئەم کوردە هەزارە لەمناڵی ساواو گەنج و پیرو پەککەوتە بۆ قاعەی وشـك و بـێ ئاوەکـانی (تـۆپزاوای) لای کـەرکوك و دوبـز، لێرەشـەوە هـەموو گەنجـەکانیان لـەکوڕو کـچ جیـا ئەکردنـەوە، دوای چـەند ڕۆژێـك ڕوتیـان ئەکردنـەوە تـەنیا جلـەکانی ژێرەوەیان لە فانیلەو دەرپێیەك ئەهێلا، لە تاریکی شەودا بەسەیارەی گەورەی داخراو بەحەرەسیاتی توندەوە ئەیان گەیاندنە بیابانەکانی ڕۆژئاوای عێراق لەنزیك سنورەکانی ئەردەن و سعودیە (عەرعەر)، بەشۆفڵ چاڵی گەورەو شێوەی خەندەقیان بۆ هەڵئەکەندن ئینجا هـەموویانیان بەزینـدویّتی ئەخسـتە نـاو چـاڵەکەوە لەهـەموو لایەکـەوە بەچـەك گوللەبارانیان ئەکردن، دوای چەند هەفتەیەك لێدانیان ئینجا بەهەمان شۆفڵەکان خۆڵیان ئەکرد بەسـەریاندا کـەزۆری بەزینـدویّتی لـەژێر ئەو خۆڵـە پەستوەدا بەبرینـداری مـردوون بەکۆمـەڵ دوور لـەخاك و نیـشتیمان و کەسـوکاریان، بـەم جـۆرە ئـەم ڕژێمـەی صـەدامی دەسەلاتداری عێراق چەندەها گۆڕی بەکۆمەڵی نادیاری بۆ چەندەها لاوو گەنج کوڕو کچی لەهەموو شوێنەکانی کوردستانەوە بەناوی هێرشی ئەنفال زیندەبەچاڵ کرد، گەورەترین تاوانی ڕەش دەرهەق بەگەلی کوردی ئەنجام ئەدا، کە هەقە هەموو نەوەیەك لە دوایەکەکانی گەلی کورد بۆ هەزارەها ساڵ لەیاد نەچێتەوە، کە ئەمانە بەکەلەپچەکراوی دوو دوو پێکەوە، ئینجا پیرەکان لەژن و پیاوو منالی ساوا لەخوار تەمەنی دە ساڵەوە، دوای ئەمان بارکراوە لەتۆپزاواوە بۆ تکریت، بەلای بەغداد بۆ شارەکانی حللەو دیوانیەو سەماوەو بۆ چۆلایی زیندانی نوگرەسەلمانی بێ ئاوو بێ ژیان، لەناو چەند قاعەیەکی ووشك و ڕەق و بێ هیچ جۆرە جل و پێویستی ژیـان، بەهـەزارەها پیـاوو ژنـی هـەژارو منـالی سـاوای شیرەخۆر، لەکاتێکدا بەشەوو ڕۆژێك یەك سەمونی ڕەقیان داونەتێ، کە بەلەتە خشت ووردیان کردوە، لەگـەڵ یـەك دۆلکـە ئـاوی گـەرم، کـە بەتـەنکی بۆیـان هێنـاون، کـە بەمـەرجێ لـەم کـاتی کارەسـاتەدا هێـشتا مـانگی ڕەمـەزان بـووە، بەرپرسـی زیندانیەکـە مقـەدەمی عەسـکەری بەناوی احسان، زابـت ئـەمن نـاوی عجـاج احمـد بغـدادی بووە، کـەزۆر دڕنـدەو نامرۆڤانـە ڕفتـاری لەگەڵدا کـردوون، تەنانـەت بـەجلی مـەدەنی دزداشـەوە خـۆی کـردووە بەناویانـدا، هەمیشە بەقسەی ناشرین ڕەفتاری کردووە، ئەمە کابرایـەکی دڕێژی بەخۆوەبوە، هەروەها دوو مفەوەزی بەناوی کازم سماوی و عبدالخالق بغدادی مدینە بیاع، هەردووکیان کورتە بالاو بەخۆوە بوون، لەگەڵ مفەوەز صاحب سماوی سەرسپیەك بووە، ڕەفتاری خراپی ئەم

بەرپرسانەی رژێم و ئازارو ستەمی بێ خواردن و بێ خزمەتی لەم زیندانەی ابو غریبدا بەسەدان کیلۆمەتر دوور لە کوردستان و لەو بیابانە وشکەدا..*

## درێژە بەئەنفال کردنی گەلی کوردو زیندانی نوگرسەلمان

لەزیندا کارەساتی بڵاوبونەوەی نەخۆشی زۆر پیس و مۆریانە وای کرد بوو کە رۆژانە چەندەها کەسیان لێ بمرێت، لەژن و پیاوی پیرو منداڵی ساوا، ئەوەندەشیان رێگا ئەدان کە بەچەند کەسێکەوەو چەند مەترێك لەدووری قەڵای زیندانەکە لەناو لمەکەدا بەئاستەم لمەکەیان لاداوەو ناشتویانن، هەربەجێیان هێشتوە سەگێکی رەش فێربووە یەکسەر هاتوە دەری هێناوەو بردویەتی خواردویەتی، ئەمە بە بەرچاوی هەموو زیندانی و خاوەنەکانیانەوە، ئەمەبوو ژیان و گوزەرانی ئەم زیندانیە هەزارانەی کە هەموویان پیرو ژن و منداڵی ساوابوون لەگەلی کوردی هەژار، کە دوور خرابوونەوە بۆ ناخۆشترین و دوورترین چۆڵەوانی ناو بیابانی خوارووی رۆژئاوای عێراق بەناوی نوگرەسەلمان، کە ژیانی هیچ جۆرە زیندەوەرێکی تیانەبوو لەگەڵ ئەوەشدا بە ئەوپەڕی رەفتاری نامرۆڤانەیان لەگەڵ کردوون لەلایەن پیاوو دەزگاکانی رژێمی عێراقەوە، بێ گوێدانە هیچ دەستورێکی یاسایی و مرۆیی یان دەوڵەتی لەماوەی چەند مانگێکدا لەناو ئەم زیندانیانەدا چەندەها کەسانی دیارو خاوەن دیوەخانی تیابوە چەندەها ژن و خێزان بەمنداڵی ساواوە، ئەمانە هەر هەموویان جگە لەستەم و ناهەمواری ژیانی خۆیان، هەتا هێنراونەتەوە بەهەمان منشئەی داخراوو بەهەمان رێگادا بۆ تۆپزاوای لای کەرکوك، لەوێشەوە بۆ سنورەکانی کۆمەڵگاکان کەس نەیزانیوە چارەنووسی چیەو بۆ کوێ ئەچێت، لەگەڵ ئەوەی چەندەها یادگاری پڕ لە ستەم و کارەساتی بەجێمانی ئێسقانی نادیاری لاشەی بێ گۆڕی خۆشەویست و کەسیان بەجێ هێشتوە، لەملاشەوە کوڕو کچ و پیاوی کەلەبچەکراوو بێ سەرو شوێنی نادیارو بێ چارەنووسیان تائێستا نەبینیوەتەوە، لەگەڵ ئەمانەشدا هەر کە براونەتەوە ناو ئەو کۆمەڵگایانەی کوردستان لەناو دیمەنێکی پڕ لەناهەمواری تردا خۆیان بینیوەتەوە هەبوە کەسی نەماوە ئەگەر خزمێك یان دۆستێکی لەشوێنێکدا بدیاتەوە چوەتە ماڵەکەی خۆ ئەگەر پێشمەرگە بوبێت کەس وکاری ئەوە هەر بەدزیەوەو لەملاو ئەولا ژیاوە، بەخۆشاردنەوە لەو ماڵانەی کەمزۆر بەتوانا بوون حەوایانەتەوە، بەم جۆرە هەتا راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ ئەمە ژیانی جەماوەری گەلی کورد

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێزان مام صالح گۆرئەسپی حاجی میکایل کۆیی و هەژار حاکم غازی، حامید مام رەسول کۆیی.

بووە، لە کۆمەڵگا زۆرەملێکانی کوردستان و شارو شارۆچکەکانی بەردەستی ڕژێمی عێراقی، جگە لەچەسپاندنی بەرنامەو ڕەفتاری ناشرینی ڕۆژانەی خۆیان و چاودێری و لێپرسینەوەی ڕۆژانەیان بێ هۆ لەلایەن ئەڵقە لەگوێ و پیاوەکانی دەزگاکانی ئەمن و ڕێکخراوەکانی حزبی بەعس، بەمەبەستی سوکایەتی پێکردنیان وەهەر لەم کاتانەی هێرشە بەردەوامانەی ئەنفالی ڕژێمی عێراق بۆ سەر سنورەکانی دەشتی کۆیەو دوایی سنورەکانی ناوشوان و شێخ بزەینی، هەمان شاڵاوی دڕاندانەی ڕژێمی بەرکەوت و ئەم سنورانەش پێشمەرگەکانی تیپی ٢١ ی کەرکوکی تیا بوو، بەفەرماندەی تیپ کاک سیروانی کوێخا نەجم و کاک شۆڕش کەرکوکی جێگرەکەی و مامۆستا باپیر بەرپرسی ڕێکخستن و کاک ڕەنجە (محسین) ڕابەر سیاسی و کاک کوردە ڕەحمان کەرکوکی بەرپرسی دەستەی ئەندازیاری و بێ سیم، لەفەرماندەی کەرتەکانی ئەوکاتە شەهید حاجی هەڵمەت، وەستا صابر، حەمەسور دوشیوانی و شەهید ئاواتە دریژو کۆمەڵێك کادرو پێشمەرگەی بەهیمەت و قاڵبووی خەبات و دڵ پڕ لەهەستی کوردایەتی، خەڵکی ناو شاری کەرکوك ڕۆڵ و هیمەتی پێشمەرگەکانی ئەم تیپە لەلایەك دەربازکردن و پەڕاندنەوەی خەڵکەکەبوو لەچنگی هێرشی ڕژێم، لەلایەك شەڕو بەرەنگاری هێرشەکانی ڕژێم بوون، بۆ ئەوەی نەگەنە سەر سنورەکەو خەڵکەکە ئەنفال نەکرێت کە لەوەی گەرمیانەوە بووبووە مەترسیەکی گەورە، ئینجا دوای ماوەیەکی زۆر پێشمەرگەکان بەهەر حاڵێ بوو خۆیان کشانەوە بۆ سنورەکانی مەڵبەندی ٣ ی هەولێر لەدۆڵی بالیسان و ماکۆك و دۆڵی گوڵان، بە چاوساغی دەستەکانی کاك عەزیزی داودو أحمد هەرتەلی، هەندێ لە کەرت و پێشمەرگەکانیش چوونە گوندی گەرەوانی خوارو سنوری ڕەواندزو سەری جوانەگا هەتا ١٩٨٨/٨/٨ و بارەگای تیپیش لە مەلەکان بوو، بەم شێوەیە لەئەنجامی هێرشی نامرۆڤانەی بەناوی ئەنفالەوە ڕژێمی عێراق کۆمەڵێك شوێنی فراوان و ناوچەو دێهات و ناوو کێڵگەو دەشتایی پان و بەرینی کوردستانی وێران و چۆڵ کرد، بەگرتن و کوشتن و ڕاونان بەبۆردومانی کیمیاوی تەنانەت زیندەوەرو پەلەوەرەکانی ئەو سنورەی کیمیاوی هەموویان مردن، کە بەگشتی هەتا ئەم کاتە هەموو ناوچەکانی دۆڵی جافەیەتی و شارباژێرو گەرمیان و قەرەداخ و دەشتی کۆیەو دەشتی کەرکوك، شوان و شێخ بزەینی، دەشتە خوارووەکانی نێوان کۆیەو هەولێر هەموو چۆڵ و وێران بوون تەنانەت سەگ و پشیلەکانیش ئەوی مابوو بەر کیمیاوی نەکەوتبوو ژیانیان نەمابوو لەدێکاندا سەرگەردان بووبوون، لە شەوی ٢٧و١٩٨٨/٧/٢٨ کاتێك دەستەکانی پێشمەرگەی سۆشیالست لەگەڵ مامۆستا شێخ ستار جەباری لەنزیك گوندی ساردکی بەری کۆیە ئەبن، لە بەرزاییەکەوە ئەبینن سەگێك ئەلورێنێ کاتێك ئەم

پێشمه‌رگانه‌ نزیكی ئه‌بنه‌وه‌ به‌په‌له‌ ڕاته‌كات و خۆی ئه‌دات به‌سه‌ر پێڵاوی یه‌كه‌ یه‌كه‌یاندا، ماوه‌ی چه‌ند ڕۆژێك هه‌تا ئه‌و پێشمه‌رگانه‌ له‌و ناوه‌دا ئه‌بن به‌جێیان ناهێڵێت، هه‌تا ئه‌ڕۆن ئه‌میش ڕوو ئه‌كاته‌ دێ چۆڵه‌كه‌ی پێشووی..*

* چاوپێكه‌وتن له‌گه‌ڵ به‌ڕێزان هه‌ژار حاكم غازی ، له‌گه‌ڵ دیداری چه‌ند كه‌سێك كه‌به‌رو زیندانی نوگره‌سه‌لمان براون.

## هێرشەکانی ئەنفالی (٥ و ٦ و ٧)
## بۆ سەر سنورەکان و پێشمەرگەکانی مەڵبەندی ٣ی هەولێر

ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی مەڵبەندی ٣سنورێکی فراوانی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرحساس بوو، ڕژێم جادەو ڕێگای بۆ زۆر شوێنەکانی ناوەو چواردەوری لێدابوو، لەم کاتەدا بەڕێز کاك کۆسرەت بەرپرسی بوو، بارەگای مەڵبەند لەنزیکی خەتێ بوو، کۆمەڵێك کادری بەتوانای عەسکەری و سیاسی هەبوو لەناو مەڵبەندو سەرپەرشتی تیپەکان. لەوانە شەهید حەسەن کوێستانی و مامۆستا چەتۆو شەهیدان ڕێبازو مەلا سلێمان و کاك سەفین، تیپەکانیش بریتی بوون لە: ٨٥ ی دەشتی هەولێر، ٨٧ ی قەرەچوغ، ٩١ ی سەفین، ٩٣ی کۆیە، ٩٩ ی بتوێن، ٤٩ ی سارا، ٧٤ی باڵەك، ١٢ ی سۆران، ١٩ ی کۆرەك، ٥٦ ی گەڵاڵە، ٧٨ ی کارۆخ وتیپی مەڵبەندو دەستەو کەرتە تایبەتیەکان، لەم کاتەشدا زۆر لەتیپەکانی مەڵبەندی یەك و دوو گەیشتبونە ئەم سنورە، شوێنی خۆیان پێ سپێدرابوو، فەرماندەی عەسکەری کاك شێخ جەعفەر قەرەداخی سەرپەرشتی زۆر لەم هێزانەی ئەکرد، لەسنورەکانی گەرەوان، شاخی کرەك بوون، لەم کاتەشدا ورەوری هەندێ دەنگی ووتووێژ کەوتە ناوەوە بەڵام دیار بوو بێ ئاکام بوو، زیاتر بەخۆسازدانی هێزەکانی ڕژێم بوو بەمەبەستی هێرشی بەربڵاو بۆ سەر ئەم سنورە لەهەموو لایەکەوە، بەڵام سەرکردایەتی بەرپرسانی ئەم مەڵبەندە سودیان لەئەزموونی هێرش، ئەنفالەکانی پێشوو بۆ سەر سنورەکانی مەڵبەندی یەك، دوو وەرگرت بوو، لەگەڵ زانیاری کارەساتی چارەنوسی جەماوەری سنورەکانیان، هەربۆیە لەسەرەتای دەست پێکردنی هێرشەکانی ڕژێمدا، ئەم مەڵبەندە کەوتنە خۆسازدان و ئامادەکردنی خۆیان، لەم پەرشو بڵاویەی هێزەکانیان خۆیان ڕزگارکرد، دوای چەند کۆبوونەوەو دراسەو ڕاوێژ لەنێوان هەموو کادرەکانیاندا، هەتا فەرماندەی سیاسی و عەسکەری و تیپەکانیش، لەئەنجامدا بڕیاری کۆکردنەوەی هەموو هێزەکانیاندا، لەچەند شوێنێکی پێویستدا دابەشیان کردن، سەنگەریان پێ گرتن بۆ شەڕو بەرگری لەشاخەکانی: هەورێ، ئەوسود، بنی حریر، کۆرەك و چەند شوێنێکی تر، لەملاشەوە جەماوەری دێهاتەکانی سنورەکە بەپەلە کەوتنە خۆیان، بۆ دەرباز بوون لەچنگی هێزەکانی ڕژێم، پێش هێرشی ئەنفال چوونە دەرەوەی دێکان، ئەمە چەندەمین جاربوو خەڵکی ئەم سنورە دێهاتیان سووتا بێت، جگە لەبۆردومانی ڕۆژانەی تۆپ و فڕۆکەو کیمیاوی و چەندەها شەهید لە کەس و کاریان، بەپێی جۆری جوگرافی

سنورەکەیان و بەرژەوەندی بریاری خۆیان خەڵکی دێکانی وەرتێ و نزیکەکانی قەندیل بەرەو بناری قەندیل بەخۆیان و هەندێ کەلوپەل و ئاژەڵەکانیان ڕۆیشتن، سنورەکانی تریش بەلای ڕژێمدا بەرەو کۆمەڵگا زۆرە ملێکانی بەلای دۆڵە ڕەقەدا بۆ سنوری ڕانیەو حاجیاواو چوار قورنە پەرتەوازە بوون، لەولاشەوە بۆ سنوری حریرو شوێنەکانی تر هەموو خەڵکی دێهاتەکان ڕۆیشتن، هەرچیەکیان بۆ دەرچووبێت لەماڵ و کەلوپەلەکانیان، خانوەکانیان بەچۆڵی مایەوە، لەگەڵ ئەوپەڕی هاوکاری هێزەکانی پێشمەرگە، بەخواردەمەنی و پێویستی ئاژەڵ بەخشین پێیان بە دڵێکی چارەنووسی نادیارەوە، پێشمەرگەو جەماوەر لەیەکتر جیابوونەوە، لەم کاتەدا تەنیا هێزی پێشمەرگە مایەوە بەپێی بەرنامەی خۆی دابەش بووبوو بەسەر شوێنەکانداو بارەگای مەڵبەندو هەڤاڵانی بەرپرس بۆ (ساوسێوکان) چوون، هەتا مانگی ٧ و کۆتایی مانگی ١٩٨٨/٨، بەئەنجام دانی دوو کۆبونەوەی فراوانی تر بۆ ئەوەی بەراوێژی گشتی، چی لەبەرژەوەندی هێزی پێشمەرگەدا بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام هەواڵ و زانیاریان ئەگەیشتێ لەلایەن هێزەکانی ڕژێم بۆ خۆسازدان و هێرش، کە زیاتر هەواڵەکان لەلایەن شەهید کاک ڕەحمان. سەیدە کە ئەوکاتە فەرماندەی تیپی ٧٨ ی کاروخ و مامۆستا ڕێبوار ئیسماعیل بەرپرسی ڕێکخستنی هەردوو تیپی ٧٨ ی کاروخ و ٧٤ باڵەکایەتی بوو، بەڵام هێرشەکەی ڕژێم هەر دوائەخرا، لەدوا بڕیاردا لەڕۆژی ١٩٨٨/٨/٢٨ بڕیاری کشانەوەی هێزەکان درا، لە کات ژمێر یەکی شەودا بەدارشتنی بەرنامەیەکی گونجاو کە زۆرترین هێزەکان بتوانن بێزیان دەربازبن، بەتایبەت لەجادەی خانەقا، کە پێش ئەوەی ڕژێم هێز بگەیەنێتە ئەم شوێنە بۆ بناری قەندیل، بەم جۆرە دوای بڕیاردانی کشانەوە بەبروسکە هەموو هێزەکان ئاگادارکرا بەکشانەوەو هاتن بەرەو شوێنی هەوارگەی (ساوسێوکان) و گەروی مەنجەڵ و وەرتێ، لەهەمان کاتدا کاک شێخ جەعفەر لەکات ژمێر ٥ر١٢ ی شەودا گەیشتە لای هێزەکان لەگەڕەوان و شاخی کۆرەك بەپێی بەرنامەکە هێزەکان لەوەرتێ و پەڕینەوە بناری قەندیل و شاخی کونەکۆتر، لەجادەی خانەقاوە، کە هێزی گەرەوان لەسەریانەوە سەرکەوتن بەرەو وەرتێ و جادەی خانەقا لەبەیانیەوە هەتا ئێوارە گەیشتنە بناری قەندیل، هەموو هێزەکانی پێشمەرگە جگە لەتیپی ٢١ ی کەرکوك کە بەنامەی تایبەت ئاراستەیان کرا کە بچنەوە دۆڵی گوڵان، لە بێرمکە بەرەو زارگەلی بڕۆن لەلایەن هەردوو پێشمەرگەی شارەزا عوسمانە بچکۆل و برایمە کوێر چاوساغیان بۆ بکەن و بیانگەیەننە بناری قەندیل لە زارگەلیەوە، بەم جۆرە هەموو هێزەکانی پێشمەرگەی مەڵبەندی ٣ و زۆر لەتیپەکانی مەڵبەندی دوو یەك و تیپی ٣٥ی کوڕەکاژاو ١١ ی هەورامان و ٢٣ ی سورێن کە لەسنورەکانی ئێرانەوە چووبون

بۆ هاوکاریـان هـەموویان لـەجادەی خانـەقاوە پەڕینـەوە بنـاری قەنـدیل، لـە تیپـی ٣٥ی کوڕەکاژاو پێش چەند هەفتەیەکی پەڕینەوە لەشاخی (تەرخین ٨٨/٧) لەپەلامارێك بۆ سەر چەند ڕەبیەی ڕژێم فەرماندەی کەرت فەرهاد عەلی ناسراو بەفەرهادە درێژ شەهیدبوو، کە لەئەصـڵدا خـەڵکی دێی ژاژڵـەی مـاوەت بـوو، لـەناو هێزەکـانی پێـشمەرگە لـەکاتی پەڕاندنەوەیاندا هەندێ لە پێشمەرگەکان بەهۆی ماندووبونیان نەگەیشتبوون بۆ بەیانی کە ڕۆژیان لێ بوەوە لەلایەن هێزەکانی ڕژێمەوە لەنزیك وەرتێ دەسگیرکرابوون لەوانە هـەردوو پێشمەرگە: مام هێرش و محمد سیاسی، هەندێکی کەشیان لەکاتی پەڕینەوەیاندا لێیان درابوو، هێزەکـانی ڕژێـم بـەردەوام لەخۆسـازدان و ئامادەکردنـدا بـوون بـۆ گرتنـی هـەموو شوێن و ڕێگاکـانی چـواردەوری هێزەکـانی مەڵبەنـدی سـێ، بەمەبەسـتی بڕینـی ڕێگاکـان لێیان، تەوق کردنیان ئینجا هێرش وپەلامار بۆ سەریان، بەهـەموو جۆرە چەکێك، هـەروەکو پیـشەو بەرنامـەی پێـشووی خـۆی، هـەتا بـەکارهێنانی کیمیـاوی کـە هەمیـشە لـەپێش هێرشەکاندا بەکاری ئەهێنا، بۆ تۆقاندنی جەماوەرو هێزی پێشمەرگە، بەڵام سـەرکردایەتی مەڵبەندی ٣ لەم سنورە زۆر دانایانەو بەرپرسانە بەرنامـەکانی داڕێـژراو هێزەکانی بێزیـان کـشانەوە بنـاری قەنـدیل، هـەم جـەماوەری خـەڵکی دێهاتـەکانیش پـێش هێرشـی ڕژێـم ڕێگادران بـەخۆدەرباز بونیان، دوای کشانەوەی هێزەکانی پێشمەرگە لـەم سنورەدا تـەنیا چەند کادرێکی سیاسی و عەسکەری لەگەڵ چەند دەستە پێشمەرگەیەك دیاری کراو، وەکو پـارتیزانی کـارو بەرنامـەی خۆیـان پـێ سـپێردرا لەلایـەن کـاك کۆسـرەتەوە، کـە بەرپرسـی مەڵبەندەکە بوو لەو کادرانەیش کەمانەوە ئەمانەبوون: شەهید حەسـەن کوێستانی، لەگـەڵ شەهید ڕەحمان سەیدەو سەلاح دیلمانی لەسنوری شـاخی کـاروخ و مەلـەکان، بـە نزیکـەی ٣٠ پێشمەرگەوە لەو سنورەدا هەر دەستە بۆ سنوری دیاریکراوی خۆیان، مامۆستا ڕێبوار بەچـەند پێـشمەرگەیەکەوە ئـەرکی شـاردنەوەی چـەند پارچـە چەکێك و مانـەوە بەشـێوەی پارتیزانی و سەرپەرشتی ڕێکخستنە نهێنیەکان و حەڵقەی پەیوەندی لەگەڵ سـەرکردایەتی، ڕەحمان حاجی خدر جێگر تیپی کاروخ لە هەڵمەون بەنهێنی، ژمارەیەك لە سەرەتاشدا کاك بێستون (مامۆستا خـدر) و کـاك ڕێـبین و کـاك وشیارە سـوور، لـەکادرە عەسـکەریەکانیش شـەهید ڕێبـازو مـەلا سـلێمان و جـەلال ئیلینجـاغی و پێـشمەرگەیەك لەگـەڵ هـاشمی جهـاز لەدەشتی هـەولێر لـە ١٩٨٨/٨/٢٧ەوە بەڕێکـەوتن، ئەمانـە زۆربـەیان هـەتا یـەك مـانگ و ٢٠

ڕۆژ مانــه‌وه، به‌ئــه‌ركی خۆیــان هه‌ڵــسان هــه‌تا بــه‌ڕه‌سمی له‌لایــه‌ن ســه‌ركردایه‌تیه‌وه ئاگاداركرانه‌وه به‌گه‌ڕانه‌وه بۆ قاسمه‌ڕه‌ش..*

* چاوپێكه‌وتن له‌گه‌ڵ به‌ڕێز مامۆستا ڕێبوار هه‌ولێری.

## ڕووداو وکارەساتەکانی گەلی کورد لە ساڵی ١٩٨٨ دا

ساڵی ١٩٨٨ لە مێژووی گەلی کوردو بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکەی دا بە ساڵێکی پڕ لەکارەسات و مەینەتی دائەنرێت،،ساڵێکی ڕەشی ماڵوێرانی گەلی کوردەو یەکێکە لەو ساڵانەی کە گەلی کوردو بزووتنەوەکەی زیانێکی زۆر گەورەی لێدرا، لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە، دوای هەرەسی ساڵی ١٩٧٥، تەنیا جیاوازی لەنێوان زیان و ناهەمواری ئەم دوو ساڵەدا ئەوەیە کە لەساڵی ١٩٨٨ دا بڕیاری کۆتایی هێنان بەشۆڕش نەدرا لەلایەن هەموو سەرکردایەتیە بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکانی گەلی کوردەوە بەگشتی و لەسەروو هەموویانەوە سەرکردایەتی شۆڕشی (ی.ن.ك)، زۆر پشوو درێژانە بڕیاری بەردەوامی شۆڕش و خەباتی دا، لەئاستی پارتیزانی و خەباتی سیاسی و دبلۆماسی و زۆر بەتواناو حەکیمانە بەرنامەی بۆ داڕشت، هێزەکانی لە سنوردا سازدرایەوە، لەئەزموونی ماڵوێرانی شۆڕشی پێشوو سوودی وەرگرت، پێشمەرگەو سەرکردەکانیش لەئاستی وورە بەرنەدان و قاڵبووی خەباتی خۆڕاگرانەی ڕۆژگارە سەختەکان بوون، لەسەرەتاوە لەسەر بنەمای باوەڕ بەخۆبوون و لەسەر ئاستی خۆو بەگیان و هەستی خۆڕاگری و بەرگری لەکارەسات و نوچدانەکاندا بوون، خەبات مانای شۆڕشگێڕی خۆی وەرئەگرێت، ئەمانە لەناو دراسەو ئەزمونی خەبات و ڕزگاری گەلان و لەناو ممارسەی گۆڕەپانی خەباتدا پێشمەرگەکانی تیا ڕاهێنرابوون، هەر چەندە کارەساتەکانیش زۆرگران و سەخت بوون، بەتایبەت زۆر دڕندانە ڕژێمی عێراق دەستی ئەوەشاند لەجەماوەرو خەڵکی هاوڵاتی گەلی کورد، بەهەموو چین و توێژەکانیەوە بەگشتی و بەتایبەتی زیانی گەورە بەر جوتیارەکانی خەڵکی دێهاتەکانی کوردستان کەوت، بەسەرو ماڵ و سامانیان، کە ئەمانە پشت و پەناو هاوکاری هێزی پێشمەرگە بوون لەهەموو سات و وەختێکدا، بێ درێغی کردن، وە لەو کارەساتەی دەستی ڕژێم بەردەوامی وێرانکردنی دێهات و سەرچاوەی ژیانیان و لێدانی کیمیاوی و هێرشی بەربڵاوو بەهەموو جۆرە چەکەکانی ڕژێم، لە (٨) هەشت شاڵاوی دڕندانەی بەناوی ئەنفال دا، بۆسەر هەموو سنورە هەژارو جوتیارەکانی کوردستان و بەئەنفال و بێسەرو شوێن کردنی (١٨٢) هەزار لەژن و منداڵ و گەنج و لاوو خەڵکی بێتاوان و زیندانی، دوورخستنەوەی هەزارەها پیرو منالی ساوا بۆ زیندانی بیابانی نوگرەسەلمان، شەهیدکردنی هەزارەها ژن و منال و گەورەو پیر بەچەکی کیمیاوی، کۆکوژی قەدەغەکراوی دەوڵەتی، وێرانکردنی نزیکەی (٤٥٠٠) گوندی خۆش و بەسوودی کوردستان، جگە لە بەتاڵان بردنی سامان و ئاژەڵەکانیان و

سـوتان و وێرانکردنـی ڕەزو بـاخ و کێڵگـەکانیان، وە کردنـی زەوی و شـوێنەکان بـەناوی (أراضي محرمة)، ئەم هەمو کارەسات وماڵوێرانیەی بەسەر گەلی کوردی ژێردەستەدا هێنرا لەلایەن دەسەڵاتدارانی ڕژێمی عێراقەوە هەر هەمووی لەساڵی ١٩٨٨دا بەزۆری ئەنجامدرا هەر لەبەکارهێنانی کیمیاوی بەفڕۆکە بۆ شاری هەڵەبجەی چەند جار شەهید لە ڕۆژانی ١٦ و١٩٨٨/٣/١٧ کە لەشەوو ڕۆژێکدا زیاتر لە پێنج هەزار شەهیدو هەزارەها بریندارو کوێرو کەم ئەندام کردنی دەها کەس، بەگشتی لەهەموو جۆرە تەمەنەکان هەر لەمناڵی ساوای ناو بێشکە هەتا پیرو گەنج لە کوڕو کچ و چۆڵکردنی شارەکە بەگشتی بەهەموو سنورەکانیەوە، هەر لەدێهاتەکان و شارۆچکەکانی سیروان و خورماڵ و بیارەو تەوێڵەو هەورامان هـەر لـەو کارەساتەشـدا شارۆچـکەی سەیدسـادق و کۆمـەڵگای شـانەدەری هـەمووی بـەو بیـانووە وێرانکـراو خەڵکەکـەی سـەرگەردان و ڕاپێـچی کۆمـەڵگاکان کـران، هـەتا سـنوری عەربـەت دێهات و ئاوەدانی نەهێڵرا، وە لـە ١٩٨٨/٥/٧ دەست پـێکردنی ئەنفالی ٥ بۆ سنورەکانی دەشـتی کـەرکوك و ناوشـوان و کۆیـەو هـەولێر، لـە ڕۆژی ١٩٨٨/٥/١٥ دەسـت پـێکردن و خۆسـازدانی ئـەنفالی (٥و٦و٧) لـە سـنورەکانی شـەقلاوەو ڕەوانـدز، لـە ١٩٨٨/٥/٢٠ منع التجول ڕژێم و پشکنین لە شارۆچکەکانی دووزو داقوق بۆ گرتن و زینـدانی کـردن و ئـەنفال کردنـی خەڵکـە هـەژارە هـەڵاتوەکانی سـنورو ناوچـەی دێهاتـەکانی گـەرمیان، هەرچـەند لـە مـانگی ١٩٨٨/٥ نامەیـەك بـەناوی بـەرەی کوردسـتانی ئاڕاسـتەی ریگنـی سـەرۆك کۆمـاری ئـەمریکاو گورباتـشۆفی سـەرۆکی سـۆڤیەتی ئەوکاتـە کـرا، دەربـارەی ڕەفتارەکـانی ڕژێمـی عێراق دەرهەق بەگەلی کوردو کوشتن و بڕینی بەکۆمەڵ، هەروەها لە ١٩٨٨/٧/٧ هـەڤاڵ مام جـەلال بەنوێنـەری وەفـدی بـەرەی کوردسـتانی بەشـداری کـرد لەکۆنفراسـی سوشـیال ئینترناسیونالیـستی فەرەنـسا لـە ١٩٨٨/٧/٣٠ کۆمـەڵێك فڕۆکـە نزیکـەی (١٠) دە بـوون کیمیـاوی بـارانی دۆڵـی سماقولی و گـەرەوانیان کرد چەند شـەهیدو برینـدار لـە ژن و منـاڵی هەژار، لە ١٩٨٨/٨/٢ ڕژێم گوندەکانی (ئاری، سیرو، زەروە)ی ناوچەی هەولێری بۆردمـان کـردو (٦٣) هـاوڵاتی بریـنداربوون کـە زۆربـەیان ژن و منـاڵ بـوو ن، (١٩٨٨/٨/١٩) ڕاگەیاندنی (م. س) ی (ی.ن.ك) سەبارەت بەهێرشەکانی ڕژێم بەناوی ئەنفال بۆ سەر گەلی کورد لـەڕادیۆی دەنگـی کوردستانەوە بڵاوکرایـەوە، خوێندرایـەوە بۆ هـەموو ڕای جیهان و نـاوخۆ، (١٩٨٨/٩/٦) بـەیانی ڕژێمـی عێـراق بەمەبەسـتی بـەناو لێبـوردنی گـشتی بـۆ هاوڵاتیانی کورد کە بگەڕێنەوە ژێردەسەڵاتی ڕژێم، دوای ئـەو هـەموو تاوانـە نامرۆڤانـەی دەرهەق بەگەلی کورد کردی، هێشتا کوردی بەتاوانبار ئەزانی لە (١٩٨٨/٩/٤) یاداشتی هـەڤاڵ مـام جـەلال بۆ ئەنجومـەنی وەزیرانـی دەوڵـەتانی بێلایـەن (عدم الانحیـان)، لـەبارەی

شەڕو لەناوبردنی گەلی کورد لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە، بە بەکارهێنانی هەموو هێزو چەکەکانیەوە هەتا کیمیاوی هەرچەند لە(١٩٨٨/٩/٣) لەناو سەرۆك و دەوڵەتەکانی عەرەبیدا دوای سەرۆك معمر قەزافی لیبیا احمد بن بلەی جەزائیر ئیدانەی عێراقی کرد دەربارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژی گەلی کوردی هەژاری وڵاتەکەی خۆی. لە(١٩٨٨/٩/١٤) دوای ئەوەی هێزەکانی ڕژێمی عێراق لەهێرشەکانی ئەنفالەکانی (٦و٧)دا بۆسەر ناوچەکانی هەولێریان کرد بەهەمان شێوە وێرانکران. هەموو دێهاتو ڕەزو باخەکانی زرارەتیان تێك و وێرانکردو لە (١٩٨٨/٩/٢٨) هەموو گوندەکانی ناوچەی پشدەر بە ڕەزو باخەوە بەهەمان شێوەو لە (١٩٨٨/١٠/١) گوندەکانی:سکتان، کانی توو، سەردۆڵ، کودەو لە (١٠ / ١٠ / ١٩٨٨) کاولکردنی تەواوی شارۆچکەی خەلەکان و دێهاتەکان و لە (١٩٨٨/١٠/١٣) بڕیاری پەروەردەی ڕژێم بەوەرنەگرتنی خوێندکارانی هەڵەبجە لە خوێندنگاکاندا، (١٩٨٨/١٠/١٧) ڕژێم (١٢) هاوڵاتی خەڵکی ئاکۆیانی لە سەربازگەی ڕانیە گوللەبارانکرد وە ٦ سەربازی کوردی لەسەربازگەی قایدە، لە ١٩٨٨/١١/٣ هێرشی بەربڵاوی کیمیاڵی ڕژێم بۆسەر هەموو شوێن و ناوچەکانی، هەولێرو، وێرانکردنی شوێنەکانیان و گەڕان بەشوێن پێشمەرگە پارتیزانەکاندا، لە ١٩٨٨/١٠ کاولکردنی گوندەکانی شێخ وەسانان و بالیسان و پاشماوەی خانوو دێهاتە سنورە سەختەکان دوای نەمانی تەواوی هێزی پێشمەرگە لەم سنورو ناوچەیەدا تەنانەت بڕین و سوتاندنی دارو ڕەزو باخەکانیان و پڕکردنەوەی کانیاوەکان، زەهراوی کردنیان لە ڕۆژانی (١٩-١٩٨٨/٤/٢٠)داو لەکاتێکدا بەسەدەهاو هەزارەها لەژن و منداڵ و پیرەژن و پیاو لەدوای ئەنفالەکانی ڕژێم بۆ سەر سنورەکانی دۆڵی جافایەتی و قەرەداخ، شپرزەیی سنورەکانی گەرمیان بەسەیارەی ئیڤاو جۆرەها سەیارە پڕکرابوون، بەسەربازو پیاوەکانی ڕژێمەوە چواردەور گیرابوون، گەیشتنە ناوەڕاستی چەمچەماڵ، خەڵکی چەمچەماڵ بەگشتی و بەتایبەت خوێندکارو لاوو گەنج زۆر مەردانە هەڵنەسن و ڕانەپەڕن لە هێزەکانی ڕژێم، بەمەبەستی ڕزگارکردنی ژن و منداڵ و دەستگیرکراوەکانی ناو سەیارەکان، تەنانەت لەناو خۆپیشاندەرەکاندا قالە شێتی هەژاریش هەستی ئەجوڵی و پێی قبوڵ ناکرێت ئەو زوڵمە گەورەیە لەگەلەکەی بکرێت، زۆر مەردانە ئەوەندەی تر ڕاپەڕینەکە ئەخرۆشێنێ بەهاوارو دەنگی بەرز، لەگەڵ هەندێ لەچەکدارە کوردەکانی لای ڕژێم هاوکاریان ئەکەن و زۆر لەخێزانەکان ڕزگارئەکەن، لەبەرامبەریشدا ڕژێم بەهێزو فڕۆکەوە پەلاماری جەماوەرە ڕاپەڕیوەکان ئەدات، چەندەها دەستگیرو ئازارو ئەشکەنجە ئەدات و کچێکیش شەهید ئەبێت.

## پاشماوەی هێرشی ئەنفالی حەوت بۆ بناری قەندیل
## دوای ئەنفالی مەڵبەندەکانی (١ و ٢ و ٣)

قەندیل بریتیە لەکۆمەڵێك زنجیرە شاخی بەرزو بەفراوی سارد، بەدرێژایی چەند کیلۆمەترێك لەنێوان هەردوو کوردستانی دابەشکراوی عێراق‌و ئێراندا، ئەوەندە ساردە تەنانەت ژیانی هیچ زیندەوەرێك‌و باڵندەیەکیشی تیانیە، بەفری چەند ساڵەی یەك ئەگرێتەوە بەسەر یەکتردا، لەنزیك چلەی هاویندا چەند ڕێگایەکی ئەکرێتەوە بۆ کاروانی‌و ڕێبوارو ئەوانەی کاسبی لەم سنورانەدا ئەکەن، بەئەسپ‌و هێستری باش، ماوەی زیاتر لە (١٥ بۆ٢٠) کات ژمێر ئینجا ئەتوانرێت لەسنوری ئەم دیوی شاخی قەندیلەوە بگەیتە ئەودیوی دێکانی کوردستانی ئێران ئەویش بەو ڕێگا سەختەی بەرزایی شاخ‌و نزمیەداو هەندێ جار لەسەر بەرزایی شاخەکەوە ئەبێ بە خلیسکەی بەفردا بچیتە خوارەوە، خۆ هەر وڵاخێك قاچی بترازێ لەسەر ڕێگای سەر شاخەکان یەکسەر خۆی ناگرێتەوەو بەرەو چەمی بەفراوی خوارەوە ئەکەوێت، لەدەست خاوەنی دەرئەچێت، بەدرێژایی ڕێگاکەو لە نزماییەکاندا چەمێکی ئاو لەگەڵتا ئەڕواو لە زۆر شوێندا سەری جۆگەکە بەستویەتی، ئەبێ بەسەریدا بپەڕیتەوە کە هەمووی تواوەی بەفری سەر شاخەکانە چوەتە خوارەوەو ئەو ئاوەی دروست کردووە، لەهاویندا کاروانی‌و کاسبە کوردە وڵاخدارەکانی سنورەکانی پیرانشهر (خانە)و سەردەشت هەتا نزیك بانەی کوردستانی ئێران هاتوچۆیان ئەکردو ئاڵ‌و گۆڕی کەلوپەل‌و خۆراك لە چاو شەکرو شتی کەمیان ئەکرد، لەم دیویشدا بناری قەندیلی ڕووبەڕوی دێهاتەکانی کوردستان دوای ناوچەی ئاکۆیان‌و شاخی کونەکۆتر درێژ ئەبێتەوە بۆسەر دۆڵی خانەقای بەرامبەر بەدێی وەرتێ، لەو بەرەوەو دوای کونەکۆتریش بەلای ڕۆژهەڵات‌و دێکانی تەواوی بناری قەندیل، کە دوای چەند جار وێرانکردنی بەدەستی ڕژێم، لەم ساڵانەی دواییدا لەکۆمەڵگا زۆرەملێکانی حاجیاواو ڕانیەو سەنگەسەرەوە هاتبونەوە، جوتیارەکان بەناچاری ژیان چەند دێیەکیان ئاوەدان کردبووەوە، کە ئەوانیش لەسەرەوە پشت ئاشان، قڕ ناقا، کاسکان، سورە دێ، ئاشقولکە، لەولاشەوە بەچەند کیلۆمەترێك قەڵاتوکان ژیانی کەمتر تیا بوو، لەبەر بەردەوامی لێدانی تۆپ‌و هاوەنی ڕەبایەکانی ڕژێم کە زۆر زیانی لەمناڵ‌و خێزان‌و ڕێبواری ئەم ڕێگایەدا کە ئەیانویست دەربازبن بەرەو قاسمەڕەش دوای بڕینی چەند ڕێگاو سەیتەرەیەکی ڕژێم، لەم چەند مەترەی ئەم ڕێگایەدا شەهید ئەبوون، بەهەر جۆر جوتیارەکانی ئەم گوندانە

بەقەناعەتەوە ئەژیان، هەندێ باخ و کێڵگە بچوکەکانیان سازدابوەوە، جگە لەوەی بەزۆری بەکاسبیو دوایی بەئاژەڵ بەخێوکردن ئەژیان، هاوینان زۆربەیان دێکانیان چۆڵ ئەکردو ڕەش دەوار هەڵـدان ئەچـوونە هـەوارەکانی بنـاری قەنـدیل بەمەبەسـتی لەوەڕانـدنی ئاژەڵەکانیان، لە مانگی ١٩٨٨/٤ەوە ئەم سنورە بەدەها خێزانو هـەڵاتوی ژێـر دەسـەڵاتی ڕژێـم ڕووی تێئەکرد هـەر لەخێزانەکانی پێشمەرگەو هاوڵاتیانی ئەو سنورانەی شاڵاوی ئـەنفال گەیـشتبووە سـەری، ئـەوی بگەیـشتایە ئـەم سـنورە مـاوەی پـشوی دڵنیـایی ڕزگـاربوونی ئـەدا لەدەسـەڵاتی ڕژێمـی عێـراق، دوای ماوەیـەك بـەرەو سنورەکانی ئێرانو چارەنووسی ئاوارەیی ڕێگای ئەگرتەبەر، جگە لەڕێی قەڵاتوکان دوو ڕێگای تری هەبوو لە هاویندا ئەکرانـەوە زۆر سـەلامەت بـوون، هەرچـەند سـەختو بـەفراوی بـوون، ئـەوانیش یـەکێکیان لەڕاسـتی ئاشـقوڵکە ڕاسـتەوخۆ بـۆ سـەر شـاخی قەنـدیل، لـەوێوە بـەرەو قاسمەڕەشو کانی زەردی سنوری سەردەشتی ئێران، ڕێگایەکی کە لەهەموویان سەختترو بەفراوی تربوو لەڕاستی دێی قڕناقا بۆ سەر لوتکەی ئەو شاخەی چەند گۆڕێکی پێوەبوو لەوێوە بەرەو شێخ عایشو تایتەدۆ دێی بادیناوای سنوری پیرانشهر (خانە)ی ئێران، لەنێوان مانگی ١٩٨٨/٤ بۆ ناوەڕاستی مانگی ١٩٨٨/٨ بەگشتیو بەتایبەت مانگی ٥و٦ ی ئـەو سـاڵە ئـەم سـنورە بووبـووە ڕێگـای پەڕینـەوەو هـاتنی سـەدەها خێـزان زۆربـەی هەڵەبجەییـەکان لـەدوای لێـدانی کیمیاویەکـە ئـاوارەی ئێـران بـوون، لێـرەوە ئەگەڕانـەوە. لەملاشـەوە تێکـڕای خێزانـەکانی ئـەو دێهاتانـەی سـنوری مەڵبەنـدی ٣ ی هـەولێرو زۆر لەخێزانـەکانی پـشدەر تـاوەکو کۆمـەڵێك چـەکدار بـە خێـزانو کەلوپـەلو ئاژەڵەکانیانـەوە لێرەوە دەرباز ئەبوون، بەرەو سنورەکانی ئێران، جگە لەهـەموو خێـزانو ژنو منالـەکانی پێشمەرگەکە بەهاوکاری چەکدارو خەڵکی ئەم سنورانە ئەگەیشتە ئەم ناوەو ئەیانگەیاندنە دەسـتی خاوەنـەکانیان کەپێـشمەرگەبوون بەسـەیارەو وڵاخ، کـە بەڕاسـتی هاوکاریـەکی مەردانـەو دڵـسۆزانە بـوو لەوکاتـەدا، لـەنێوان ئـەم دێیانـەی بنـاری قەنـدیلو جادەکـەدا چەمێکی ئاوی زۆر لە قەندیلەوە ئەهاتە خوارەوە، بەدوو پردی دارو تەختە بەسەر ئاوەکە دروستیان کردبوو بۆ پەڕینەوەی خەڵکەکەو ئاژەڵو وڵاخەکانیان بەڕۆژو بەشەو، یەکێ لەو پردانە لەنێوان پشت ئاشانو قرناقەدا بوو، ئەوی کەشیان بەرامبەر سورەدێ بۆ بەرزایی پشتی جادەکە لـەم کاتـەدا ڕەبایەیـەکی چـەکداری کوردی سـەر بـە ڕژێمـی پێوەبوو، بـە ڕەبایەی ڕۆنەکە ناسرابوو، لەگەڵ پێشمەرگەدا تێکەڵاو بووبوون، ئەشارەزا نەیئـەزانی کـە ئەوانـە چـەکداری ڕژێمـن، لـە شـەودا هـەتا ئەگەیـشتە سـنورەکانی قـەڵادزەو سەنگەسـەرو ڕانیەو حاجیاواو چوارقوڕنە هەموو چەکدارەکان لەگـەڵ پێشمەرگەدا لـەناو یەکدابوون، بـە

سەیارەو بەولاخ لە یەکتری جیا نەنەکرانەوە، بەڕاستی چەکدارەکانی ئەم سنورانە ڕۆڵی مێژوویان بینی بەویژدانەوە، لەهەمان کاتدا لەسنورەکانی ئەم دێیانەی بناری قەندیل هەر لەئینزێ و لیوژێ هەتا سورەدێ چەند بنکەو بارەگای حزبی دیموکراتی ئێرانی تیابوو زۆر بەچاکی شوێنی باش و جێگایان هەبوو تەنانەت فرۆشگا لە پێویستی خۆراك و شتی تر، ئەمانیش بارەگاکانیان کرابووەوە بۆ خزمەتی پێشمەرگە، بە ئەوپەڕی توانایانەوە هاوکاری پێشمەرگەو خێزانەکانیان ئەکرد، تەنانەت لە هێنانیاندا لەناو دەسەڵاتی ڕژێمەوە لەشارو شارۆچکەکاندا، شوێنی مەشق کردنیشیان هەبوو لەکۆتایی مانگی ١٩٨٨/٤ بۆ ماوەیەك سەرکردایەتی (ی.ن.ك) لەم سنورەداو لەبەردەم دێی سورەدێ شوێنێکی کردەوە بۆ خواردن و چێشت لێنان، ڕۆژانە بۆ ئەو هەموو پێشمەرگانەی ئەگەیشتنە ئەم سنورە نانیان ئەخواردو پشویەکیان ئەدا، لەم ماوەیەشدا کەسوکاری پێشمەرگە ئەگەیشتنە ئەم سنورە بەمەبەستی سەردانی کوڕو کەسە پێشمەرگەکانیان یان گەیاندنی ژن و منداڵ و خێزانی پێشمەرگە، زۆر کەسی بەهیمەت و ئازایش لەوکاتە پێویستەدا هاوکاری پێشمەرگەی کرد لەناو شارو شارۆچکەو کۆمەڵگا زۆرەملێکاندا بەپەنادان و شاردنەوەی ژن و منداڵ و کەسوکاری پێشمەرگە لەناو ماڵەکانی خۆیاندا، لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕژێم بەهەموو پیاوەکانی دەزگاکانی ئەمنەوە بە منع التجول شارەکان ماڵەو ماڵ ئەگەڕان بە شوێنیاندا بۆ گرتنیان، بەڵام زۆر مەردانە هەموویان پارێزران و دواییش بەسەیارەو بەولاخ دەریان کردن و گەیاندنیانە بناری قەندیل بەدەستی پێشمەرگەی خاوەنەکانیان لەڕێگای سلێمانی–دوکان–ڕانیە، سەنگەسەر بۆ سنوری دێکانی ماخو بزنان، لەوێوە بۆ جادەی بەردەم ڕەبایەی ڕۆنەکە لەدۆڵی شەهیدان، ئینجا بەولاخ بۆ سنوری دێکانی بناری قەندیل لەو پیاوو کەسە بەهیمەتانەی لەوکاتەدا لەم جۆرە هاوکاریانەی خێزان و منداڵ و کەسوکاری پێشمەرگەی کردو زۆرماندوو بوون بەدرێژایی ئەو چەند مانگە کاك شێخ جەبار شێخ حەمە نوری ناسراو بە (شێخ جەبارە خڕە) بەرزنجەیی و کاك سەید عبداللە محمودو عمری مامە ڕەشەو چەندانی تر بوون، ئەمانە هەرچەند خۆیشیان زۆر دیاربوون بەرامبەر بەڕژێم بەڵام هەر نەئەترسان هەتا نزیکی ١٩٨٨/٨، زۆربەی ژن و منداڵی پێشمەرگەو ئەو خێزان و کەسانەی ویستیان دەربازبن لەچنگی ڕژێمی عێراق گەیشتنە ئەم سنورەو لێرەوە ئەودیوی سنورەکانی ئێران ئەبوون، دوای ئەوەی بەزۆری پارەی عێراقیەکانیان ئەگۆڕیەوە بەتمەنی ئێرانی، کە لەم کاتە لەنێوان مانگی ٤ بۆ مانگی ١٩٨٨/٨ یەك دیناری عێراقی بەهای (٧٥ بۆ ٦٥) تمەنی ئێرانی بوو، دینار زۆر بەرزبوو، خۆراك و شتیش لە عێراقدا هێشتا زۆر هەرزان بوون، کە زۆر لەخێزانەکان ئەیان کڕی

ئەویش فەردەیەك برنج یان شەکری وردە هەر یەکەیان بەنرخی (٢٥) بیست و پێنج دینار، چای باش کیلۆی بە (٥) دینار لەناوەڕاستی مانگی هەشتەوە خێزان و ژن و منالْ بەزۆری ئەما لەم سنورە هەمووی بەرەو ئێران ڕۆیشتن، بەئاسانی دەوڵەتی ئێران دەرگای مەرزی کردبوەوەو هاوکاری خواردن و هەندێ پێویستی ئەکران، لەلایەن مانگی سوری ئێرانیەوە، وە لەم کاتەدا زۆربەی پێشمەرگەکانی حزبە کوردستانی و نیشتمانی و لەسەرووی هەموویانەوە پێشمەرگەکانی هەرسێ مەڵبەندەکەی (ی.ن.ك) کە زۆرترین و دیارترین هێزی پێشمەرگە بوون، جگە لەچەند دەستە پێشمەرگە پارتیزانەکان ئەوانی تر بەگشتی بەپێشمەرگەو کادری سیاسی و عەسکەری و بەرپرسەکانیانەوە گەیشتنە ئەم سنورەی بناری قەندیل، سەرکردەکان بەزۆری لەشوێنێکی سەروی دێی ئاشقوڵکە دابوون.

## دەستپێکردنی هێرشی ئەنفالی (٧) بۆ بناری قەندیل

ڕژێم لەهەموو لایەکەوە لەخۆسازدان و کۆکردنەوەی هێزەکانی بوو بەمەبەستی داڕشتنی نەخشەو بەرنامەی هێرش و شاڵاوێکی سەخت بۆسەر دوا شوێنەکانی هێزی پێشمەرگەو دەرپەڕاندنیان، بەدوا هێرشی بەناوی ئەنفالی تر بۆ بناری قەندیل دائەنرا، لەبەر ئەوە هێزەکانی پێشمەرگەی هەر سێ مەڵبەندەکان دەستیانکرد بە سەنگەرگرتن لەناو دێ و شاخ و بەرزاییەکانی بناری قەندیل، هەتا سەر کونەکۆتر بەسەرپەرشتی بەڕێزان: کاك ملازم عمر کە هەتا ئەوکاتە بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری هەموو هێزی پێشمەرگەو ئەندامی (م.س)، لەگەڵ کاك کۆسرەت ڕەسول بەرپرسی مەڵبەندی ٣ ی هەولێرو ئەندامی (م.س) بوو هەروەها شەهیدی سەرکردە کاك ئازاد هەورامی کە پێشتر بەرپرسی هێزەکانی سنوری بادینان بوو تازە گەڕابوەوە ئەم سنورە کە زۆر بەداخەوە کاك ئازاد هەورامی سەرکردە لەم دواهێرشەی ڕژێمی عێراقدا بۆ بناری قەندیل بەلێدانی فڕۆکە زۆر بەسەختی بریندار بوو لە(١٩٨٨/٨/٣١)، وە لەڕێگای گەیاندنی بۆ ئێران لە (شێخ عایش) شەهیدبوو ماڵئاوایی لەهاوڕێ و هاوسەنگەرەکانی کردو ئەمانەتی بەوەفاوەیی بەرنامەو خێزانەکەی بەهاوڕێ سەرکردەو پێشمەرگەکانی سپارد، کە ئەم هێرشەی ڕژێم لە بەرەبەیانی ڕۆژی (١٩٨٨/٨/٢٥) وە بەتەواوی دەستی پێکرد، لەهەموو لایەکەوە بەرەو ڕووەوە بۆ سنورەکانی پێشمەرگە لەناو دێی چۆڵی بناری قەندیل و سەر شاخەکان، هێزەکانی ڕژێم بە زۆرترین هێزی عەسکەری و چەکدارو چەندەها پیاوی داموو دەزگاکانیان، هەر لەسەر جادەی دۆڵی شەهیدان و بەرەو قەڵاتوکەو دێکانی سورەدێ و ئاشقوڵکەو پشت ئاشان، لە ئینزێ و لیوژەوە بۆ سەر کونەکۆتر، بەپشتی چەندەها تۆپ و

راجیمـه‌و جۆره‌هـا فڕۆكـه‌ی جـه‌نگی به‌سـه‌ره‌وه زۆر بێبه‌زه‌ییانـه به‌هـه‌موو چـه‌كه‌كانیان به‌رده‌وام ئه‌و ڕۆژانه لـه‌هێزی پێشمه‌رگه‌ی بێپشت و په‌ناو ڕه‌بایه ڕووت و به‌رچاوه‌كانیان داوه، كه ته‌نیا چه‌كی سوك و ئاربی جی و بی كه‌ی سی و كه‌مێك گولله‌و فیشه‌ك له‌ده‌ست هێزی پێشمه‌رگه‌دابووه، له‌وكاتـه‌دا كـه لـه شـه‌ڕو بـه‌رگری سنوره‌كانی پێشوویان پێیان مـابوو، جگـه لـه‌وه‌ی كـه هێـزی پێـشمه‌رگه خـاوه‌نی خوارده‌مه‌نیـه‌كی زۆركـه‌م كـه لـه به‌رده‌ستیاندا بوو‌بێت، به‌تایبه‌ت نان و چا به‌پێی بواری شه‌ڕه‌كه فریا بكه‌وتنایه، ته‌نانـه‌ت خاوه‌نی به‌تانی نه‌بوون، به‌سه‌ر ئه‌و شاخه به‌فراوی و ساردانه‌ی قه‌ندیلدا، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شـدا ماوه‌ی زیاتر له‌دوو هه‌فته هێزی پێشمه‌رگه به‌رگریـه‌كی زۆر بێوێنـه‌ی قاره‌مانانـه‌یان كرد، چه‌نده‌ها هێرشی گه‌وره‌و سه‌ختی ڕژێمیان شكانده‌وه، چـه‌نده‌ها لاشـه‌یان لێ خستن، بـه‌ڵام له‌بـه‌ر بـێ وه‌زعـی هێـزی پێـشمه‌رگه‌و نالـه‌باری ئـه‌م سـنوره دوره‌و هـیلاك و مانـدوێتی پێشمه‌رگه كه به‌درێژایی زیاتر له ٧ مانگ له‌سه‌ر شاخ و بـه‌رگری شـه‌ڕی ٧ حـه‌وت هێـرش به‌ناوی ئـه‌نفالی ناڕه‌وای ڕژێـم بـوون، هـه‌ر له‌سـه‌ركردایه‌تی دۆڵـی جافایه‌تیـه‌وه، لـه‌مانگی (١٩٨٨/٢) هـه‌تا هه‌فته‌یـه‌ك زیـاتر لـه مـانگی(١٩٨٨/٩) لـه‌م سـنوره‌دا به‌خه‌سـتی شـه‌ڕو بـه‌رگری هێزه‌كـانی پێـشمه‌رگه‌ی (ی.ن.ك) به‌رامبـه‌ر به‌هێرشـی هـه‌موو هێزه‌كـانی ڕژێمـی عێـراق بـه‌تۆپ و ڕاجیمــه‌و فڕۆكه‌كانیـشه‌وه، بــه‌و هــه‌موو نه‌خــشه‌و پیلانــی بــه‌كرێ گیراوانه‌یانه‌وه، كه به‌داخه‌وه چه‌ند پێشمه‌رگه‌یه‌كی خاوه‌ن پێشینه‌ی خـه‌باتی زۆری چـه‌ند ساڵه‌و دیـاری لـه‌م كاتـه‌دا لـه‌ناو خـه‌باتی خۆیانـدا كۆتـایی ژیانیـان بـه‌ودوا به‌رنامـه‌ی پێشمه‌رگایه‌تیه‌وه كۆتاییـان‌پـێ هێنـا، لـه‌و كه‌سانه‌یش پێشمه‌رگه‌ی دێرین (جوامێر) كه ناسرابوو به‌جوامێری سه‌رتیپ (واڵی حاجی عبدالقادر براخاس) چوارتاقی نزیك عه‌ربـه‌تی شـاره‌زوورو لـه بنه‌ماڵه‌یـه‌كی زۆر كوردپـه‌روه‌ر بـوو، دوای جوامێریش صـلاح و زایـه‌ر هـه‌ر به‌هـه‌بوونی ده‌سـت لـه‌ناوبران، ئه‌مـه له‌سـه‌ره‌تای ده‌سـت پـێكردنی شـه‌ڕو هێرشـه‌كاندا، هێرشه‌كانی ڕژێمیش هه‌تاسه‌ر به‌رزاییه‌كانی كونه‌كۆتری نه‌گرت نه‌یتوانی پێشڕه‌وی بكات به‌تایبـه‌ت له‌سـنوره‌كانی باڵه‌یانیـشه‌وه ڕژێـم هێرشـی ئـه‌كرد، له‌ملاشـه‌وه چـه‌ند جارێـك هێرشی ڕژێم نه‌گه‌یشته دێكانی سوره‌دێ و ئاشقوڵكه‌و نیوه‌ی شاخه‌كه به‌ڵام پێشمه‌رگه هه‌ر به‌رگری ئه‌كرد، له‌و سه‌ركرده‌و كادره عه‌سكه‌ریانه‌ی له‌م كاتـه‌دا سه‌رپه‌رشـتی بـه‌رگری هێزی پێشمه‌رگه‌یان ئه‌كرد كاك شێخ دارای حه‌فید كه‌پێشتر به‌رپرسـی مه‌ڵبه‌ندی دوو بوو هه‌روه‌ها كاك قادری حاجی عه‌لی به‌رپرسی مه‌ڵبه‌ندی یـه‌ك و ئه‌ندامی (م.س) و كـاك حه‌مـه تۆفیـق ئه‌نـدامی (م.س) و كـاك حامـد حـاجی خالـد فه‌رمانده‌یـه‌كی عه‌سـكه‌ری بـوو، وه لـه‌و پێشمه‌رگه قاره‌مانانه‌ی له‌م به‌رگریه گه‌وره‌یه‌دا له‌سه‌ر شاخ و بناری قه‌ندیل شه‌هید بوون:-

بەختیاری کاکە حەمە کوردستانی تیپی ۳۷ ی شارباژێر لە کانی باساوێن، ئەم پێشمەرگەیە ۳ برای پێشمەرگە بوون، خێزانەکەیان وەکو خوێندنگایەکی کوردایەتی وابوو بەهەموو تەمەنی ژیانیانەوە، بەتایبەت کاکە حەمە کوردستانی لەناو شاری کەرکوکەوە شوێنی کاسبیەکەی ناونابوو کوردستان بۆ بەرهەڵستی دوژمنانی کورد، شەهید پشتیوان فەتاح عبدالکریم کۆزەڕەقەیی ئەم خێزانەیش بەدرێژایی تەمەنیان لەکۆڕی خەباتدا بوون‌و ئەمە چەندەمین شەهیدیان بوو، شەهید عەزیز سیتەکی لەگەڵ مامە سەعەبوو لە ت ۳۷ی شەهید عمر علی ناسراو بە عمر مارکس جێگری کەرت بوو لە تیپی ٥٥ ی قەرەداغ‌و خەڵکی دەربەندیخان بوو. شەهید ئەکرەم ناسراو بە امام فەرماندەی کەرت بوو بەڕاستی پێشمەرگەو فەرماندەیەکی لێهاتوو بوو کە ماوەی چەند مانگێك بوو خێزانەکەی لە سلێمانیەوە گەیشتبوویە ئەوێ لەپێش شەڕەکەدا ڕەوانەی سنوری ناو ئێرانی کردبوو، جگە لەچەندەها شەهیدی پێشمەرگە لەتیپەکانی سنوری هەولێر کە بەزۆری بەسەر شاخی کونەکۆترەوە بوون، تیپی مەڵبەندەکانی کەیش هەر هەموویان خاوەنی زۆر شەهیدی پێشمەرگە بوون، لەدوای ئەنفالی یەکی هێرشی ڕژێم بۆ سەر سەرکردایەتی خاوەنی زۆرترین شەهیدبوو لەم هێرشەی ڕژێم لەئەنفالی ۷ بۆ سەر بناری قەندیل کە زۆر بە داخەوە ناویان نەزانراوە، ئەم هێرشەی ڕژێم‌و بەرگریەی هێزی پێشمەرگە لەم دواسنورەی بناری قەندیلدا، هەتا ڕۆژانی (۱۹۸۸/۹/۱٥) ی خایاند ئینجا سەرکردایەتی لەبەر سەرماو ناتەواوی باری ژیانی پێشمەرگە هێزەکانی کشانەوە بۆ شێخ عایش‌و تاتیدۆ لەوێوە بۆ سنورەکانی ئێران، سازدانەوەی هێزەکان بەوجۆرەی مەڵبەند، لە سێ شوێن‌و سەرسنوری ئێراندا بەو جۆرەی کە بەتایبەت نووسراوە.*

## ئەنفالی سنوری بادینان لە ۱۹۸۸/۸/۲٤ بۆ ۱۹۸۸/۹/۳۱

بادینان: ئەو سنورەیە کە لەنێوان زێی گەورە (پردی قەندیل)و ڕووباری دیجلەو هەتا سنوری سوریەو کوردستانی باشور ئەبەستێتەوە بەکوردستانی باکوری تورکیاوە، پارێزگای سەرەکی لەم سنورەدا شاری دهۆکە کە لەساڵی (۱۹٦۸)ەوە بووە، جگە لەوەی کە بەشێکی زۆری سەر بەپارێزگای موسڵە وەکو: شنگار، شێخان، ئاکرێ، بەعیشقە، بەعزالە، ئەتروش، مریبا، نهلە، بەردەرەش، ئەڵقوش، تلکێف/ لەسنوری پارێزگای دهۆکیش جگە لە قەزای مەرکەزی دهۆك سێ قەزای تری تیایە کە ئەمانەیە:- ۱) قەزای زاخۆ. ۲) قەزای ئامێدی. ۳) قەزای سمێل.

---

چاوپێکەوتن لەگەل بەرێزان حامد حاجی خالید، مامە سەعە ، بەختیار قرگەیی

یەکەم: قەزاکانی ناوەندی دهۆکیش ئەم ناحیانەی هەیە:

١ – ناحیەی زاوێتە. ٢ – ناحیەی دۆسکی.

دووەم: قەزای زاخۆیش ناحیەکانی:

١– سندی ٢– باتوفە ٣– ڕزگاری کە ئیبراهیم خلیلی تیایە

٤– دەرکار عجم ٥– شرانش.

سێیەم: قەزای ئامێدیش ناحیەکانی بریتی یە لە:

١– نێروڕێکان ٢– سرسنگ ٣– کانی ماسی

چوارەم: قەزای سمێلْ ناحیەکانی ئەمانەیە:

١– فایدە ٢ –ئاسیهیْ

لەڕووی ئاینیەوە: زۆربەی ئیسلامی سوننن دوای ئەوانیش ئێزیدیو ئاینی مەسیحیش هەیە، لەم سنورەدا سیاسەتە ڕەگەزپەرستیەکانی دەسەلآتدارانی عێراق بەگشتیو بەتایبەت سەردەمی ڕژێمی بەعسی صەدام زۆر لەسنورەکانی تری کوردستان سەخت تر بوو، لەبەر ئەوەی زۆرترین بەشی سنوری کوردنشینەکان کەوتبوەبەر پارێزگای موسلْ، لەبەر ئەوە هەر هەموو بەشەکانی سیاسەتی ڕژێم لە: دەرکردنو ڕاگواستنو بەعەرەب کردنو بە بەعسی کردنی بەردەوام بوو بەتایبەت دەرکردنو بەعەرەب کردنی شوێنەکانیان، جگە لە سالآنی ١٩٦٣ بەدواوە، لەدوای هەرەسی شۆڕشی پێشوو، بەتەواوی لەسەرەتای هاوینی سالْی ١٩٧٦وە بەزەقی دەستی پێکرد، لەپێش هەموو شوێنەکانەوە سنورەکانی سەر بەپارێزگای موسلْ، کە هەموو دێکانی (دەشتی سلێڤانی) کە لەدرێژەی ڕۆژهەلآتی دیجلەو ڕۆژئاوای سنوری دهۆکە، نزیکەی (١٠٠) سەد دێ بەناحیەی ئاسیهیْو بەشێکی قەزای سمێلْ، کە هەر هەموو دێکانیان تەخت کردنو خەلْکەکانیان پەردەوازەو دەربەدەر کردن، لە شوێن و زەویو زارەکانیشیان عەرەبیان بۆ هێنان، ئەم کۆمەلْگایانەشیان بۆ دروست کردن: باوردێ، باتێل، مەروانە، کێلْکی یەك، کێلْکی دوو، باجدێ، فیشخابور، لەو گوندانەی کە تێکیان دا، هەر لەدێی کاشیوە هەتا دێکانی بناری شاخی بێخێر لەوانە: قادیا، پەراڤ، خەربەنور، مێرگەسوور، پێ بزنیْ، فیشخابور، دێرەبوون، هەڤریسکیْ، بەغلوجەی، باوەردیْ، خراب دێم، چەندەها دێهاتی دیکە، ئەمانە خەلْکەکەیان بەتایبەت کوردە ئیسلامە سونیەکانیان برد بەرەو ناحیەی ڕشیدیەی نزیك موصلْ وە ئەو کوردە ئێزیدیانەی کە لەسنوری دەشتی سلێڤانی بوونو سنوریان لەنێوان عێراقو تورکیاو سوریاوە بوو ڕاگوێزران بۆ سنوری ئێزیدیەنشینەکانی فایدە، ئەو ناوچەی بەسەریاندا دابەشیان کردن هەر گوندە (٤ – ٥) مالْیان بەرکەوت،

ئەمانە بەگشتی بێگوێدانە سەرچاوەی ژیانیان، بێبەری کردنیان لەزەوی و شوێنی باوو باپیرانیان، لەهەمان کاتدا هێنانی عەرەب و نیشتەجێ کردنیان لەشوێن و سەر زەویەکانیان، دروست کردنی خانوو بۆیان بەشێوەی کۆمەڵگاو دێی ئێزیدیەکان زیاتر لە ١٢ گوند بوون.

# ڕاگواستن

ئەم سیاسەتە رەگەزپەرستیەی ڕژێم لەم سنورەدا لە هاوینی ساڵی (١٩٨٧)وە هەروەکو بەشەکانی تر لەنزیکی مانگی ١٩٧٨/٨ بەتەواوی دەستی پێکرد، بەتێکدان‌و ڕاگواستنی هەموو گوندنشینەکانی سنوری عێراق تورکیا بە درێژایی دێکانی سنوری قەزاکانی ئامێدیێ، زاخۆ سەر بەعەشیرەتەکانی:- سندی، گولی، بەرواری، ڕێکانی، نێروەیی، دۆسکی ژووری وە سەر بەناحیەکانی: شرانش، باتوفە، کانی ماسی، نێروەو، ڕێکان، بۆ دێکانی سنوری قەزای ئامێدیێ ئەم کۆمەڵگا زۆرەملێیانەیان (مجمع ) بۆ دروست کرا: شیلادزێ، دێرەلوك، کانیێ، بێگوڤە، قەدشیێ، وە بۆ دێکانی سنوری زاخۆ: بێگوڤە، باتوفێ، بێرسڤێ، هیزاوا، دەرکاری عەجەم، تلکبر.. ئەم دوو دەستە کەمەڵگا زۆرەملێیانە لەسەرووی دهۆکەوە بوون، هەروەها دەستەیە کۆمەڵگەی زۆرەملێ بۆ دێهاتە سنوریەکان لەسنوری قەزای مەرکەزی دهۆك دروست کران کە ئەمانەبوون:- { باگیرات - کۆڕی گاڤان }، ئەمانە لەعەشیرەتی ڕێکانی‌و لە ساڵی ١٩٨٢ ی شەڕی عێراق ئێرانیشدا خەڵکانی باڵەکایەتیان بۆ بردن، هەروەها لە کۆمەڵگای باگیرات دا عەشیرەتی نێروەیی و ڕێکانی تیابوو، هاوینی ساڵی ١٩٨٢ و دیاریکردنی هێڵی سوور (خط الأحمر) لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە، دوای ئەوی ڕژێمی بەعس زۆر لەدێهات‌و سنورە کوردنشینەکانی تێکدا، هەر لەسنورەکانی سەر بە پارێزگای موسڵ‌و دواییش دێهاتە سنوریەکانی سەر بەپارێزگای دهۆك لەنزیك سنوری عێراق تورکیاوە، کوردەکانی دەربەدەر کردن‌و خستنیە کۆمەڵگا زۆرەملێکان، بێ سەرچاوەی ژیانیان، لەم کاتەدا کۆمەڵێ دێهات‌و شوێن مانەوە لەسنوری ئازادکراوی ژێر دەسەلاتی پێشمەرگەدا، شوێنی سەخت بوون، دەسەلاتی پێشمەرگە لە زیادبووندا بوون‌و شەڕی عێراق ئێرانیش گەرم بوو، ڕژێمیش بەمەبەستی بەردەوامی‌و تەواوکردنی بەرنامەی سیاسەتەکەی ئاگاداری هەموو خەڵکی ئەو دێیانەی کرد لەڕێی پیاوەکانی خۆیان، کە هەر کەس لەو گوندانە بمێننەوە لەسەر ئێران حساب ئەکرێن‌و ئەوانیش بێنە کۆمەڵگاکانی ژێر دەسەلاتی ڕژێم ئەوە بەهاونیشتیمانی عێراقی دائەنرێت‌و بۆ ترساندنیان هێڵی سووری داناو بەدیاریکردنی نێوان ئەم دوو سنورەو بڕیاری ئەوەدرا لەلایەن ڕژێمەوە هەرکەس لەو سنورەدا بگیرێت بەتاوانبارو بێگانە دائەنرێت‌و سزای تایبەتی هەیە، زۆریش لەخەڵکانی هەژاری کوردی ئەم دێیانە بوونە قوربانی‌و تیاچوون بەدەست ڕژێم‌و پیاوەکانی لەوکاتەدا، لەهەمان کاتدا ئاگاداریان کردن هەردێ‌و شوێن‌و کەسێك بکەوێتە بەر شاڵاوو هێرشەکان درێغی لێ ناکرێت‌و بێ بەزەییانە ڕەفتاریان لەگەڵ

ئەکرێت.. دوای ئەم ئاگاداریو ترساندنو بڕیارانەی ڕژێم بۆ خەڵکەکانی ژێردەسەڵاتی پێشمەرگە، ئینجا ڕژێم دەستی کرد بەهێرش کردن، ڕۆژانەو بگەیشتایە بەهەر دێیەك ڕاستەوخۆ ئەیسوتاندو تەختی ئەکردن، خەڵکەکەیشی سەرگەردانو پەرتەوازە ئەبوون، بەڵام بەزۆری بەرەو شوێنە ئازادکراوەکان ئەڕۆیشتن، لەدەسەڵاتی ڕژێم هەڵئەهاتن، ئەمانە پێش هێرشی ئەنفالەکانی ڕژێم.

## بەردەوامی هێرشی ڕژێم بەناوی (ئەنفالی ٨) بۆ سنووری بادینان

لەم ماوەیەدا ڕژێم بەهێزێکی ئامادەکراوو پێویستی لەوجۆرە چەکەکانیەوە، بەمەبەستی تێکدانو وێرانکردنی تەواوی هەموو ئەو گوندانەی ماوبووەتەوە، لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدان بوون. بۆ سەرخستنی سیاسەتی ڕاگواستنی بۆ ماوەی نزیکەی مانگێك هێرشی کردە سەر هەموو دێهاتو شوێنەکانی ئەم دەڤەرە، لەو ماوەیەدا هەموو دێکانی تێکداو وێرانی کردنو خەڵکەکەشی ئاوارەو دەربەدەرکردن، دوای کوشتنو بڕینو ئەوی بەردەستی کەوت ئەنفالی کردن، کە بەزۆری گەنجەکان، ئەوانەی کە دەرچوونو ڕزگاربوون بە ژنو منالەوە لەبەردەم هێرشەکەدا بەو ژیانە سەختەو ڕێگا شاخو هەڵەتەدا ئاوارەی سنوری دیاربەکرو سلوپیابوون، بەشێوەی پەناهەندەیی، هەندێکیان خستنە ئۆردوگاوەو زۆریشیان بڵاوەیان کرد بەو دێهاتە سنوریانەی تورکیا، بەهۆی خزمایەتیو دۆستایەتیو ناسیاوی نزیکیانەوە لەیەکتر جێیان بوەوە، بەو ژیانەی مەگەر هەر کورد توانای قبوڵکردنی بکات، ئەویش بەناچاریو لەژیانی ژێر دەسەڵاتی ڕژێمەکەی خۆیان بەباشتر ئەزانن، ئەمانە ئەو خەڵکانەیش کە لەگوندەکان کەوتنە بەردەست شاڵاوو هێرشی ڕژێمو چەکدارەکانیان، کەزیاتر لەگوندەکانی بەری گاراو زێوەی دۆسکی، ئەمانە کە گرتنیان بە زیلو ئیڤای عەسکەری بردنیان بۆ(قەڵای نزارکی) نزیك دهۆكو لێرەدا کردنیان بەدوو بەشەوە: بەشێکیان بۆ حمدانیەی لای موسڵ کەتا ئێستا بێسەرو شوێننو چارەنووسی نادیاری ئەنفالیان هەیە، بەشێکی کەیان بەرەو ئۆردوگای (بحرکە)ی لای هەولێر، ئەو گەنجانەی کە جیایان کردەوەو ئەنفالیان کردن مەزەندە ئەکرێت بە (٥) پێنج هەزار کوردی گەنجی تازە پێگەیشتوو، لەهەمان کاتداو لەم هێرشەی ئەنفالی شوم بۆ سەر ئەم دەڤەرەو لەسنوری ناوچەی (مانگێشك)ی ناحیەی (دۆسکی)و لەگوندی (کورێمە) (٣٧) سیو حەوت کەس لەو دێیەدا بەتەنیا گوللەباران کران، تەنیا یەکێکیان کە لەناو تەرمەکاندا مابوەوە نەمرد بەناوی (قهار کرێمەیی).

## چەکی کیمیاوی و بەکارهێنانی لەم دەڤەرەدا

دەسەڵاتدارێتی ڕژێم لەهەموو پەلامارو شاڵاوو هێرشەکانیدا بەگشتیو لەم هێرشی بەناو (ئەنفال)ی دا بەتایبەتی هیچ درێغی نەئەکرد، لە بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکەکانی بۆ کوشتو بڕو قاتو قڕکردنی کوردی هەژار، تێکدانو وێرانکردنی دێو خانوماڵو شوێنو ڕەزو باخو کشتوکاڵ، هەتا ئاژەڵو باڵندەو زیندەوەرە ماڵیەکانیان، بەتایبەت لەم هێرشانەی ئەنفالەکانیان هەمیشە وەکو بەرنامەیەکی داڕێژراویان ڕۆژی پێش دەست پێکردنی هێرشەکانیان بەچەکی کیمیاوی لەو سنورو دێیانەیان ئەدا بەتۆپو ڕاجیمەی کیمیاویو بەفڕۆکەی سوخۆیو مێك، لەم سنورەشداو لەکات ژمێر ٦ر٣٠ ی بەرەبەیانی ١٩٨٨/٨/٢٤ بە شەش فڕۆکە کەوتنە گیانی ئەم دێیانە بەکیمیاوی کە بەم جۆرە بوو:-

١- لەسنوری (دهۆك) لەناوچەی (دەرگەلا شێخا) کە دێکانی: (برجینی، زیناڤا، زڕهەوە)، لەدێی برجینی ٢ شەهیدو چەند بریندارێك بوون، وە هەرچی زیندەوەری دێکەیە لەباڵندە هەتا چۆلەکەو کەروێشكو سەگو پشیلەی تیابووە کوشتنی، خەڵکەکەشی بەزۆری پێشتر دەرچووبوون..

٢- لەسنوری زاخۆ: لە دێکانی: برکەڤی خواروو، برکەڤێی سەروو، توێکا. لێرەدا بەس لەدێی (توێکا) (١٤) شەهیدو چەند بریندارێك کە زۆربەیان پێشمەرگە بوون.

٣- لەسنوری ئامێدی: لەدێکانی: یەك ماڵە، خرابە، دۆڵی زێوە، کە بنکەی هەموو حزبەکانی تیا بوو: یەکێتی، پارتی، سۆشیالست، حزبی شیوعی.

٤- لە سنوری شێخان: لەناوچەی ئاڤۆکی (چیای گارە) بەلوتە، گوێزێ، یەك ماڵە، شێرانە، لە ئاڤۆکی یەك شەهید هەبوو.

لەدوای تەواوکردنی هێرشی ئەنفالو بەکارهێنانی هەموو چەکەکانی هەتا چەکی کۆکوژو قەدەغەکراوی کیمیاویشی تیا بەکارهێنا، سەرجەم گوندەکان کاولو وێرانکران، بەڕەزو باخەکانیانەوە، خەڵکەکەیش دەربەدەرکران هەر بەشە بەلای ئاوارەیی تورکیاو بەلای مجەمەعەکانی ژێردەسەڵاتی ڕژێم، ئینجا ڕژێم زۆر لەدێ و کۆمەڵگاکانی ساڵانی پێشوتری ژێردەسەڵاتی خۆی جارێکی تر تێکداو تەنیا لەسنوری هەموو بادینانداا ئەم شارو شارۆچکەو هەندێ گوندی ناو کۆمەڵگا زۆرەملێکانو هەندێ لەکۆمەڵگا زۆرەملێکانی بەئارەزووی خۆی هێشتەوە، کە بەتەواویو بەعەقڵی خۆی لە بارترن بۆ

دەست بەسەراگرتنیان، بۆ قۆناغەکانی تری ڕاگواستن، ئەم دێو کۆمەڵگایانەیش ئەمانە بوون :-

١- جگە لەناوەندی شاری دهۆك ئەم دێو کۆمەڵگا زۆرەملێیانەی سنوری دهۆك مابونەوە: باگیراتیە ڕۆژ، باگیراتی نزارکۆمەڵگای باگیرات، کۆمەڵگای کوڕی گاڤاو گوندەکەی ناحیەی زاویتە (ڕویکی)، گوندی حوجاڤا، نزارکێ، ماڵتا سەرو، ماڵتا خواروو، گێڤەرکێ، شندوخە، دێی کەڤلەسن..

٢- لەسنوری قەزای سمێلْ جگە لەمەرکەزی قەزاکە: کۆمەڵگای مەرونە، خانکێ، مسیرکێ، کۆمەڵگای شاریا، فایدە + شێخانیش مابونەوە سەر بەئیدارەی موسڵ بوون.

٣- لە سنوری قەزای ئامێدیش: کۆمەڵگای شیلا دزێ، دێرەلوك، کانێ، ئامێدی، کۆمەڵگای قەدش و دێکەی، سەرسنگ، بادەرەش، سوارەتوکە، ئەمانە بەگشتی لە سەرجادەو خەتی سەرەکی هاتووچۆ بوون..

٤- لەسنوری قەزای زاخۆ: بێکۆڤە، باتوفەو ئوردوگاکەی، بێرسڤێ، هیزاوا، دەرکار عجەو کۆمەڵگاکەی، تلکێڤر، کەئێستا وەکو گەڕەکێکە لە زاخۆ، لە سنورە ئەنفال کراوەکەیشدا کە پێشتر لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا بوو، دوای تەواوکردنی کردار (عملیە) ی ئەنفال و ئەنجامدانی.

مەبەستی سەرەکی ڕژێمی بەعس کە وێران و تێکدانی گوندەکانی کوردو دەربەدەر کردنیان بوو، لەشوێن و جێگای باوو باپیرانیان و سوتاندن و کاولکردنی دارو ڕەزو باخەکانیان، ئینجا هێزی پێشمەرگە بەگشتی سنورەکەیان چۆڵ کرد بەهەموو حزبەکانەوە، دوای ئەو بەرگریەی کە لەتوانایدا بوو، زیانی چەندەها شەهیدو بریندار، سەر لێشێواوی و دابڕان لە ژن و منداڵ و کەسوکاری گوندنشینە هاوسەنگەرەکانیان، دروستبوونی ئەو تراژدیایەی کە لەهەموو سنورەکانی ژێردەسەڵاتی پێشمەرگەدا ڕژێم بەناوی ئەنفالی بەدناوو، بە بەکار هێنانی هەموو چەکەکان بەچەکی کیمیاویشەوە، ئەم کردارە نامرۆڤانە مەگەر هەر بەسەر نەتەوەی کوردی بێ پشت و پەناو بێ سنورو بێ ناوو نیشان هاتبێت، بەدەستی ڕژێمێکی وەکو بەعسی صدامیش ئەنجام درابێت تەنیا ئەو کەسانەی کە لەناو ئەو بازنە دۆزەخیەدا بوون ئەزانن چۆن ڕوویداوە، هێزەکانی پێشمەرگە کە بەزۆری بەرەو سنوری ئێران کشانەوە، زۆر بەکەمی بۆ ناو تورکیا ڕۆیشتن، لەناو هێزەکانی پێشمەرگەدا چەند دەستەیەکی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) کە ژمارەیان (١٤) پێشمەرگە ئەبوو، ئەمانە هەتا (١٩٨٩/١/٦) لەو دەڤەرە مانەوە، لەدوای ئەوکاتە بەرەو سنوری سۆران هاتن، بوون بەسێ بەشەوە: بەشێکیان کە بریتی بوون لە: کاك عبدالقادر

محمد باجلوری و پ.م بدل محمد صالح كه ئه‌وكاته فه‌رمانده‌ی كه‌رت بوو، یوسف محمود ده‌روێش فه‌رمانده‌ی ده‌سته‌بوو گه‌یشتنه ژاراوه‌ی قه‌لادزێ، كه به‌ره‌و سنوری ئێران ده‌رچن، له ١٩٨٩/١/١٦ كه‌وتنه به‌رده‌ستی رژێم و ده‌ستگیركران هه‌تا سالی (١٩٩٥/٥/٨) له زیندانی ئه‌بوغرێب بوون، دوایی ئازادكران به به‌رنامه‌یه‌كی تایبه‌تی ئه‌وكاته، به‌ش و ده‌سته‌ی دووه‌میان: كه بریتی بوون له كاك سه‌لام كاك سه‌عید، كاك د. سعید، كاك د. شوان، ئه‌مانه خۆشبه‌ختانه گه‌یشتنه زه‌لێ و سنوری پێشمه‌رگه‌و رزگاریان بوو، به‌شی سێیه‌میش كه بریتی بوون له: كاك احمد عبدالله محمد، كاك گه‌ردی ئیدریس، كاك دلشاد ادریس، كاك خلیل هه‌ریری، كاك سه‌لیم عه‌لی، كاك محمد صالح، كاك محمد سعید، ئه‌مانه له‌سنوری بادینان نه‌یان توانیبوو ده‌ربچن، هه‌تا ماوه‌یه‌ك هه‌ر له‌و ده‌فه‌ره‌دا مابوونه‌وه، دوایی به‌ناچاری خۆیان خستبوه ناو كۆمه‌لگا زۆره‌ملێكانی ژێر ده‌سه‌لاتی رژێم و ناو شاره‌كان..

به‌م هێرشانه‌ی به‌ناو ئه‌نفال رژێمی به‌عس كاره‌ساتێكی گه‌وره‌ی به‌سه‌ر گه‌لی كوردا هێناو زیانێكی خراپیشی له‌رووی پێشمه‌رگایه‌تیه‌وه به‌هێزی پێشمه‌رگه‌ی گه‌یاند به‌گشتیی به‌تایبه‌تی له‌ده‌ستدانی چه‌نده‌ها پێشمه‌رگه‌و كادرو فه‌رمانده‌ی به‌توانا، له‌وانه شه‌هیدان: (هیوا بارۆیی، فه‌رهاد گۆشانی، مه‌لا سه‌عیدو ئاواتی برای و ره‌ووفه سوور، ئارامه بچكۆل، هه‌مزه كاكه حه‌مه كانی پانكه‌یی، بكر مه‌لا فرج، سیروان بێسانسووری، ئه‌نوه‌رو كه‌مال عه‌ربه‌تی، به‌ختیار زه‌رایه‌نی، هاورێ جه‌وهه‌ر، ،شێخ حسین فقێره، حه‌مه سعید امام قادر، حاكم هاوار گه‌رمیانی و دوو هاورێی وه ده‌یانی دیكه‌ش).[*]

[*] چاوپێكه‌وتن له‌گه‌ل به‌رێزان: عبدالقادر باجلوری، به‌ده‌ل بادینی.

## هێرشی ڕژێم بەناوی ئەنفالی دەستگیر کردنی کادری ڕێکخراوەکانی ناو شارەکانی کوردستان

کاتێك ڕژێمی عێراق بەچەند هێرشێکی سەختی بەناوی ئەنفال زۆرترین هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان و بنکەو بارەگاکانی وەدەرنا، لەهەموو شوێنەکانی کوردستان، بۆ ئەودیوی سنوری ئێران، جگە لەچەند دەستەیەك پێشمەرگە بەناوی پارتی زانەکان، هەر دەستەو ڕەتلێك بەجۆرێك لەسنورەکانی تایبەتی کوردستاندا دابەش بووبوون، ئەم کردارە ماوەی زیاتر لە ساڵێکی پێچوو بوو، ڕژێم زانیاری تەواوی هەبوو لەبوون و جموجۆڵی ئەو دەستە پێشمەرگە پارتیزانانە لەسنورە جیاجیاکانی کوردستانداو بوونی بنەمای ڕێکخستنی نهێنی لەناو شارو شارۆچکەو کۆمەڵگا زۆرەملێکانداو مەترسی تەواوی ڕژێم و دەزگاکانی بەدروست بوونی پەیوەندی و هاوکاری لەنێوان ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشارو پێشمەرگە پارتیزانەکان و بەمەبەستی بڕینی پەیوەندییان و بەرهەڵستی گەشەکردنیان لەپێناوی ئەوەی بەئاسانی دوا بەرنامەی ڕاگواستن و پاکتاوکردنە ڕەگەزییەکەی دژی گەلی کورد بەئەنجام بگەیەنێت، لەناوەڕاستی مانگەکانی ساڵی ١٩٨٩وە کەوتە دانانی نەخشەو کۆکردنەوەی زانیاری و چاودێری کەسانی دیارو کوردپەروەر کە گومانی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانیانی لەسەربوو، بەهۆی هەڵوێستی مەردانەو مل کەچ نەکردنیان بۆ فەرمان و بەرنامەکانی ڕژێم و لە مانگەکانی ١٩٨٩/٩،١٠ دەزگاکانی ئەمنی سلێمانی هەڵمەتی دەستگیرکردن و زیندانی کۆمەڵێك کادری ڕێکخستنی ناو شاری سلێمانی دەست پێکرد لەو کادرانەیش:

١- ماموستا أحمد محمد وەتمان ناسراو بە ماموستا احمدی صەناعە.
٢- ابوبکر محمد صالح کەریم ناسراو بە بەکری دارتاش.
٣- کامل صابر محمد ناسراو بە کاملی خەیات.
٤- مەجید سەلیم.

لە ساڵانی ١٩٨٧ ئەم ڕێکخستنانە گیران و تەنیا ئەمانە (١٥) پانزە ساڵ حوکمیان تەواو کرد:

١- اسفندیار محمد مەجید
٢- ڕێبوار عمر
٣- کامەران عبدالله

٤- نزار جەلال
٥- برهان

لە مانگی ٢٠٠٢/٧ بەربوون، لە ڕۆژی (٢٢ /١/١٩٩٠) لە کاتێکدا شەهید عبدالجبار حاجی ڕەشید مەلا ئیبراهیم و کاك عبدالعزیز عمر بەکاری ڕێکخستن بەرەو بەغدا ئەڕۆیشتن، بەسەیارەی خۆیانەوە، لەچەند ڕۆژو کاتی پێشودا لەژێر چاودێری ئەمنەکانی سلێمانیدا بوون، کاتێك ئەگەنە نێوان ڕێگای تاسلۆجەو ئەڵڵایی ڕێی سلێمانی و بازیان، لەلایەن مەفرەزەی تایبەتی ئەمنی سلێمانیەوە کە پێشتر بۆیان دانابوون بەخۆیان و سەیارەیانەوە دەستگیر ئەکرێن، ڕاستەوخۆ ئەخرێنە زیندانی دەزگای ئەمنی گشتی و ژووری تایبەتی ئەمنی سلێمانی، دوای ئەوەی کۆمەڵێك بەڵگەیان لەسەر ماڵ ئەکەن، ئەمانە بەگشتی دوای ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر دڕندانەو بێ وێنە ب دەستی ئەمنەکانی سلێمانی، بەجۆرەها ئامێری ئەشکەنجەدان و سوکایەتی کردن، لەناو لێکۆڵینەوەیەکی سەرپێییدا، لە دادگای بەناو سەورە بەچەند جۆرێك حوکمیان بەسەرا سەپاندن بەپێی نوسراوی ژمارە (٥٩٧٧) لە ١٠/٢٢ لە بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمانی عدد/ ش ت (٢٠٤٦٩) لە ١٩/١٠/١٩٩٠ ی ٣/ ربیع الاول/ ١٤١٢ هـ وە بەپێی مادەی (١٥٦) ق ٠ع و مصادرەی اموال منقولە وغیر المنقولە جگە لە نووسراوی تایبەت بۆ هەموو ئیدارە پەیوەست بە اموال و ئیشەکانیانەوە، فەرمانی حوکم دانەکەشیان بەم جۆرە بوو:

**١- حوکمی لەسێدارەدان بە هەڵواسین هەتا مردن بۆ هەریەکە لەم زیندانیانە :**

١- شەهید عبدالجبار حاجی ڕەشید مەلا ئیبراهیم بەرپرسی یەکەمی ڕێکخستنەکانی ناوشار.
٢- شەهید مامۆستا احمدی صەناعە.
٣- شەهید بەکری دارتاش.
٤- شەهید محمد ڕەحیم ناسراو بە هاوڕێ شەماڵ.
٥- شەهید عەتا حاجی احمد.

**٢- حوکمی ئەم زیندانیانە بەحوکمی هەتا هەتایی بە پێی ماددەی (١٧٥ر٢) و دەست بەسەراگرتنی سامانیان :**

١- عەزیز مەلا عومەر
٢- مامۆستا احمد صاڵح
٣- مامۆستا محمد مەلا حسێن

٤- مامۆستا شێخ محمدە سوور
٥- شێخ عەبدول
٦- سالار محمد سەعید
٧- مامۆستا عوسمان شێخ عەبدول
٨- کامل صابر
٩- مامۆستا عەزیز محمد
١٠- سامان مەولود
١١- شەهید ڕزگار محمد عبدالله
١٢- مام عەلی صالح بەکرەجۆ
١٣- عەلی محمد شاسوار
١٤- اردەڵان عمر عەلی

٣- حوکمی زینـدانی بـەماوەی (١٠) دە سـاڵ بەسـەر ئـەم زیندانیانـەدا بەدەستبەسـەراگرتنی سامانیان؛

| ز | ناوی زیندانی | | ز | ناوی زیندانی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | حەمە تاهیر محمود شێخ محمد | | ٦ | محمد زاهیر محمد تۆفیق |
| ٢ | کارزان أسماعیل | | ٧ | محسین مەلا حەمە ئەمین |
| ٣ | بەختیار عمر أولی | | ٨ | محمد ڕەسول سەعدی |
| ٤ | تالیب عبدالله سەعید | | ٩ | فەرەیدون دارتاش |
| ٥ | أحمد محمد قادر | | | |

٤- ئەمری بەردانی هەریەکە لەم زیندانیانە:-
١- کامەران عەزیز
٢- مامۆستا جەمال عەزیز

وە لەڕێکخستنەکانی پارێزگـای هـەولێر و لـە (١٩٨٩/١٠/٢٠) ئەمانـە دەسـتگیرو زیندانی کران :-
١- ڕەسول سەعدی ڕەسول ناسراو بە کاك زیاد
٢- نصرالدین أسماعیل ناسراو بە ( سەرکەوت ) حوکمی هەتا هەتایی.
٣- مام شەوکەت
٤- شەهید محمدحسێن

٥- فه‌یصه‌ل محمد حسێن

٦- كاكه زیاد عمر ته‌ها له ١٩٨٩/١٠/٢٤ ده‌ستگیرو زیندانی كرا به هه‌تاهه‌تایی

٧- عوسمانه سوور دزه‌یی له ٩/١٠

٨- د. مه‌جید حه‌مه ئه‌مین به هه‌تاهه‌تایی

٩- مسته‌فا سه‌یدقادر

١٠- نصرالله حوكمی له سێداره‌دان

١١- محمد هه‌مزه رائد ته‌یار به هه‌تاهه‌تایی

١٢- محمد سه‌رسپی

١٣- سه‌رتیپ یه‌حیا مسته‌فا

١٤- پێشمه‌رگه به‌هرام عبدالله مولود خۆریتانی، له‌ساڵی ١٩٨٩ دوای ئه‌وه‌ی به لێبوردنی گشتی هاته‌وه گیراو به‌هه‌تا هه‌تایی حوكم درا، خاوه‌ن ١٨ شه‌هید بوون.

ئه‌مانه‌ی سه‌ره‌وه به‌گشتی له ١٩٩١/١٢/٢١ به گۆڕینه‌وه‌ی ئه‌فسه‌ره‌كان گیراوی راپه‌ڕینی كوردستان ئازادكران، گه‌ڕانه‌وه كوردستانی ئازادكراو، وه له ساڵی ١٩٨٦ كۆمه‌ڵێك گیران له‌هه‌ولێرو له ١٩٨٨ به‌ربوون به‌لێبوردن، كه ئه‌مانه بوون:

١- محسن ابراهیم

٢- نوری محامی

٣- خه‌سره‌و عوسمان

٤- قاسم ابو زید

٥- سعدی عه‌لی

٦- حه‌مه شێخه شه‌لی

٧- مامۆستا محمد مه‌نگوری

وه له‌سنوری ڕانیه ئه‌مانه‌گیران هه‌روه‌ها له‌قه‌لادزێ ((١ – عبدالله سه‌ید قادر ٢- پیرۆت ٣- قادر ڕانیه‌یی ٤- علی وجه‌نگی دووبرا بوون)). وه له‌ڕۆژی (١٩٩٠/١/٢٤) و به به‌رنامه‌یه‌كی داڕێژراوو دوای ده‌ستنیشان كردنی كۆمه‌ڵێك كادری ڕێكخستن له‌شوێنی ئیش و ئیداره‌و ماڵیان له‌لایه‌ن پیاوه‌كانی ده‌زگای ئه‌منی سلێمانیه‌وه، ده‌ست ئه‌كه‌ن به‌گرتن و زیندانی كردنیان ئه‌و كادرانه‌یش بریتی بوون له:-

١- محمد ڕه‌حیم حسن پێنجوێنی له‌كۆمه‌ڵگای زۆره‌ملێی نه‌سری قه‌ره‌گۆڵی شاره‌زوور.

٢- احمد محمد صالح (مامۆستا احمد) دانیشتوی ناوشاری سلێمانی.

٣- محمد مەلا حسێن مامۆستا محمد دانیشتوی ناوشاری سلێمانی.

٤- محمد عبدالکریم کاکە حەمە ناسراو بەمامۆستا شێخ محمدەسوور سۆڵەیی (مدرس).

٥- عبدالرحمن قادر غەفور ناسراو بە شێخ عەبدول

٦- سالار محمد سەعید

٧- عوسمان عەبدول معروف ناسراو بەشێخ عوسمان شێخ عەبدول

٨- عەزیز محمد احمد ناسراو بەمامۆستا شێخ عەزیز

٩- سامان مەولود غەریب

١٠- ڕزگار محمد عبدالله

١١- علی محمد شاسوار

١٢- علی صاڵح سلێمان (مام عەلی) سلێمانی - بەکرەجۆ

١٣- ئەردەڵان عمر عەلی ئەمین

١٤- حەمە تاهیر محمود شێخ محمد

١٥- کارزان اسماعیل احمد

١٦- بەختیار عمر اولی

١٧- تالب عبدالله سعید (تالب مۆریاسی)

١٨- احمد حمد قادر حەمە ڕەش

١٩- محمد زاهیر محمد تۆفیق

٢٠- محسن حەمە ئەمین حەمە عەلی (محسن مەلا حەمە ئەمین هەڵەبجەیی) دووەم جاری بوو.

٢١- محمد ڕەسول سعدی

٢٢- فەرەیدون سەعید جەعفەر (مامۆستا فەرەیدونی دارتاش ( هونەرمەندان)

٢٣- عەتا احمد محمد (عەتای حاجی احمد ئیشی زەنگەرو دانیشتوی گەڕەکی خەبات)

٢٤- احمد محمد قادر حاجی احمد باوکی شەهید عەتا..

٢٥- جەمال عەزیز ئەمین مامۆستا جمال (مدرس)

٢٦- احمد عەلی حەمە ئەمین مامۆستا احمد عەلی

٢٧- کامەران عەزیز کامەرانی مەلا عەزیزی صحاف

٢٨- ناميق اسماعيل كانی سپيكه‌يی ماوه‌ی چه‌ند پێش ئه‌مانه گيرابوو

٢٩ ته‌حسين قادر به‌رزنجی دوای ئه‌مان گيراو له راپه‌ڕينه‌كه‌دا له ئه‌منه سووره‌كه ڕزگاركرا.

وه له‌هه‌مان ئه‌و ساڵه‌ی هێرشی ئه‌نفالی ڕژێمی به‌عس بۆ سه‌ر كادرو ڕێكخستنه‌كانی ناو شارو شارۆچكه‌كانی كوردستان به‌گشتی‌و له‌ڕۆژی (١٩٨٩/١٠/٢٠) ئه‌م كادرو ڕێكخستنانه‌ی خواره‌وه له‌ناو شاری هه‌ولێر ده‌ستگيرو زيندانی كران كه بريتی بوون له:-

١- نصرالدين اسماعيل ناسراو به (سه‌ركه‌وت)

٢- مام شه‌وكه‌ت

٣- شه‌هيد محمد حسێن

٤- فيصل محمد حسێن

٥- كاكه زياد عمر ته‌ها له ڕۆژی ١٩٨٩/١٠/٢٤، ئه‌وكاته به‌رپرسی ڕێكخستنه‌كان بوو ئه‌مانه به‌گشتی حوكمی موئه‌به‌د بوون كه بريتی بوو له‌حوكمی ٢٠ ساڵ و ٦ مانگ وه له ڕۆژانی مانگی ١٩٩٠/١٠ ئه‌م كادرانه ده‌ستگيركران :-

١- مسته‌فا سه‌يد قادر به‌ناوێكی جياوازه‌وه گيرا زۆر خۆڕاگرانه مايه‌وه جگه له كاری ڕێكخستنه‌كان به‌رپرسی ده‌سته‌كانی (سرك) بوو دوای به‌ڕێز كاك ئه‌وشيروان مسته‌فا له‌وكاته‌دا (سرك) به مانای: سوپای ڕزگاری كوردستان، دوای ئه‌نفاله‌كان له‌ناو ڕێكخستنه نهێنيه‌كانی ناوه‌وه‌ی ژێرده‌سه‌ڵاتی ڕژێمی عێراق له‌ئاستی زۆر تواناداا پێكهێنرا.

٢- عوسمان دزه‌يی (عوسمانه سوور)

٣- د. مه‌جيد حه‌مه ئه‌مين جه‌ميل

ئه‌مانيش به‌حوكمی موئه‌به‌د حوكم دران هه‌تا ڕۆژی (١٩٩١/١٢/٢١) به‌گۆڕينه‌وه به‌ربوون، هه‌ر له‌سنووره‌كانی شاری هه‌ولێر چه‌ند كه‌سێكی كه له ڕێكخستنه‌كان ده‌ستگيركران ئه‌وانيش: حوكمی له‌سێداره‌دان دوايی كرا به‌هه‌تا هه‌تايی.

١ – نصرالله

٢ – محسين همزه

٣ – محمد سه‌ر سپی

٤ – سه‌رتيپ يه‌حيا مه‌سيفی

٥ – صباح مه‌سيحی هه‌رمۆته‌يی

٦ – صادق هه‌ولێری

٧- شه‌فيق ئيبراهيم ناسراو به شه‌فيق چاوشين

وه له‌شارۆچكه‌و سنووره‌كانی ڕانيه‌و قه‌ڵادزه ئه‌م كادرو ڕێكخستنانه ده‌ستگيركران‌و حوكمی هه‌تا هه‌تايی دران زۆربه‌يان كه بريتی بوون له:-

١ – عبدالله سەید قادر برای کاك مستەفا سەید قادر قەلادزەیی

٢ – پیرۆت

٣ – قادر ڕانیەیی

٤ – عەلی } دوو برا بوون

٥ – جەنگی

چەندەها زیندانی تر لە ڕێکخستنەکانی ئەم سنورە کە بەداخەوە ناویان نەزانرا وە هەر لەشاری هەولێر کۆمەڵێك لە ڕێکخستنەکان گیران لەلایەن دەزگای ئەمنی ڕژێمەوە لەساڵی ١٩٨٦و لەساڵی ١٩٨٨ بەربوون ئەوانیش ئەم کەسانە بوون:–

١ – محسن ئیبراهیم          ٢ – نوری محامی

٣ – خەسرەو عوسمان          ٤ – قاسم ئەبو زەید

٥ – سەعدی عەلی          ٦ – حمد شێخە شەلی

٧ – مامۆستا محمد مەنگوری

وە لە ڕۆ ژی ( ١٩٨٩/٦/٨) لە ناو شار ی سلێمانی ئەم کادرانە گیران:–

١ – بەکر عبدالرحمن محمد (بەکری زەراعە)

٢ – کمال محمد سەعید (کمال قەرەداخی) لە ١٩٨٩/١٠

٣ – تارق غەفور، حوکمی هەتا هەتایی دران، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٢ بە لێبوردن ئازادکران، لە ساڵی (١٩٨٩) پێشمەرگەیەك بەناوی (بەهرام عبدالله مولود) خوریتانی بەلێبوردن گەڕایەوە لای ڕژێم و خاوەنی نزیکەی (١٨) هەژدە شەهیدی بنەماڵەکەیان بوو، لەبەر ئەوە ڕژێم زیندانی کردو حوکمی هەتا هەتایی دا، هەتا (١٩٩١/١٢/٢١) لەدوای ڕاپەڕینەکەی کوردستان بەگۆڕینەوە ئازادکرا، وە لەشاری دهۆك ئەم کادرو ڕێکخستنانە لەنوری ژاراوەی قەلادزێ دەستگیرو زیندانی کران، کە ئەمانەن:

١ – قادر باجلوری

٢ – بدل محمد صالح بادینی

٣ – یوسف

وە لە شاری کەرکوك ئەم ڕێکخستنانە دەستگیرو زیندانی کران

١ – مام تایەر          ٢ – محمد مەلا حەسەن

٣ – لوقمان          ٤ – حلمی

٥ – سالم          ٦ – عبدالرزاق

هەروەها عاصی خانەقینی هەر لەو سەردەمەدا زیندانی كراوە، لە بەردەم شاڵاوی ڕژێم بۆ گرتن و زیندانی كردنی هاوڵاتیانی كورد لەناو شارو شارۆچكەكاندا بەتایبەت دوای هێرشەكانی ئەنفالەكان بۆ سەر هێزەكانی پێشمەرگە، وێرانكردنی دێهاتەكان و ڕاگواستنی دانیشتوانەكانیان، ڕاپێچ كردنیان بۆ ناو كۆمەڵگا زۆرەملێكان، بیانوو پێگرتنیان بەئارەزووی خۆیان، لەلایەن دەزگا سەركوت كەرەكانیانەوە، لە كاتێكدا هێزی پێشمەرگە دووركەوتبووەوەو مەترسیان بەوجۆرە نەمابوو، بۆیە پیاوەكانی دەزگا ئەمنیەكانی ڕژێم كەوتنە گیانی خەڵكی كوردی هەژار، لەڕۆژانی ساڵی ١٩٨٨ بەتایبەتی زۆیان گرت و زیندانیان كردن لەوانە:-

١- كەمال جەلال ئەمین ناسراو بە (شوانە) لەدایك بووی ١٩٦٤ سلێمانی.

٢- عوسمان حسن قادر ناسراو بە (ئەبەز) لەدایك بووی١٩٦٦ سلێمانی.

٣- كەیوان ئەحمەد قادر ناسراو بە (كاروان) لەدایك بووی ١٩٦٩/٨/١ سلێمانی.

٤- عوسمان ئەحمەد صالح ناسراو بە (پیرە مەگرون) لەدایك بووی ١٩٦٦/٦/١ سلێمانی.

٥- ئاكۆ عەلی ڕەمەزان ناسراو بە (برزو) لەدایك بووی١٩٦٩/١/١٢ سلێمانی.

ئەم هەژارانە دوای ئەشكەنجەیەكی زۆر لەناو زینداندا، بێهیچ دادگایەكی یاسایی، لە ڕۆژی (١٩٨٩/٢/٤) لە یاریگا (ملعب)ی سلێمانی گوللەباران كران و گەیشتنە كاروانی شەهیدان، ئەمە بەشێك بوو لەو هەموو تاوانانەی ڕژێمی داگیركەری كوردستان ڕۆژانە ئەنجامی ئەدا، لەخەڵكی كورد لەهەموو ئاستە تەمەنەكاندا، بەتایبەت زۆر ڕقی لەگەنجەكان بوو، بۆ ئەوەی پاشەڕۆژ پێنەگەن بۆ گەلەكەیان، لەوانە تاوانی گوللەباران كردنی كۆمەڵێك گەنج لەبەردەم قوتابخانەی ڕۆشنبیری سلێمانی، كۆمەڵێك لەخولر گرتوخانەی سلێمانی لە مانگی١٩٨٧/١١ داو بە بەرچاوی دایك و باوك و خەڵكی كوردەوە، پیاوە خۆفرۆشەكانی كوردیش سەیریان ئەكردن و پشتگیری هەنگاوەكانی ڕژێمیان ئەكرد. *

---

* چاوپێكەوتن لەگەڵ بەرێزان علی صالح بەكرەجۆ، شێخ محەمەدە سوور، شێخ عەزیز زیندانی، فەخرەدین هەورامی، عبدالقادر باجلوری، مەلا قادر، بەدەل بادینی.

## بەرەو ژیانی ئاوارەیی خێزان و پێشمەرگە لەناو ئێران و هەندێ ڕەفتاری ڕژێمی عێراق

دوای ئەوەی هەموو هێزەکانی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) لەشەڕی بەرگری ئەنفالی ٨ی ڕژێم بۆ سنورەکانی بناری قەندیل، لەدوای ناوەڕاستی مانگی ١٩٨٨/٩ کشانەوە بۆ سنورەکانی ئێران، لەڕێگاکانی شێخ عایش و تایتدۆی ناو قەندیلەوەو، ماوەیەك لەوەوپێش (م.س)ی (ی.ن.ك) ڕاگەیاندنی خۆی سەبارەت بەهێرشە ناڕەواکانی ئەنفال بڵاوکردەوە لەڕادیۆی دەنگی کوردستانەوە، لەڕۆژی (١٩٨٨/٨/١٩)و هەر لەو ماوەیەشدا بەمانگێك شەڕی عێراق ئێران ڕاوەستا لە (١٩٨٨/٨/٨)دا، سەیر لەوەدابوو ڕژێم لەدوای ئەو هەموو تاوان و ماڵوێرانیەی بەسەر تێکڕای گەلی کوردی هێناو هیچی تیا نەهێشتەوە، لەسەرو ئەم کارەساتانەشدا هێشتا ڕژێم بڕیاری لێبوردنی بەبەیانێك لە ١٩٨٨/٩/٦ بەناوی لێبوردنی گشتی بۆ هاوڵاتیانی کورد دەرکرد، هەروەکو ئەوتریێ: هەتا خاوەن ماڵ دزی گرت، دز خاوەن ماڵی گرت. ئەویش با هەموو ڕۆڵەیەکی کورد بزانێت ئەوە ڕەفتاری هەموو گەل و نەتەوەو دەسەڵاتە چەوسێنەرەکانە بۆ گەل و نەتەوە ژێر دەستەکانیان، لەپاش کوشتن و بڕین ئەبێ داوای لێبوردن بکەیت، لەگەڵ ئەم هەموو بارە ناهەموارو پڕ لە مەینەتیەی جەماوەری گەلی کوردا، کە لەم دوا ساتەی کشانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ دیوی ئێران و سازدانەوەی خۆی لەسنورەکانیدا، لەناوەوەی کوردستانی عێراقیشدا جەماوەری گەلی کورد بێ پشت و پەنای شۆڕش مانەوە، هەر بەشە بەجۆرێك کەوتبوونە بەر دەسەڵاتی بێبەزەییانەو هەڕەشەی ڕژێم و دام و دەزگاکانی، بەتایبەت لەم کاتەداو تا ڕادەیەك دەزگاکانی، ڕژێم ئەو جۆرە مەترسیان ئەماو زەمینەکەیان بۆ لەباربوو بەچەوساندنەوەو ئەنجامدانی بەرنامەی ڕەگەزپەرستانەکەیان بەرامبەر بەو جۆرە دابەش بووەی هاوڵاتی هەژارو بێدەسەڵاتی کورد لەکۆمەڵگا زۆرەملێکان، شارەکان و هەندێ شارۆچکەکان کرابوون، کە هەموو ڕۆژێك و کاتێك لەبەردەم چەقۆی تیژی قەسابخانەکانی دەزگاکانی بێبەزەیی ڕژێمدا بوون، گەلی کورد بەهەموو چینەکان و جۆرەکانی تەمەنیانەوە، لێرەدا هەتا چەکدارە کوردەکان لای ڕژێم بەرەو پشت گوێخستن و بەرەڵایی ڕۆیشتن، چیتر ئیشیان پێیان نەما، کەوتنە گرتن و بیانوو پێگرتنیان، لێرەدا خزمەتکردنی بێگانەو دوژمن ئەنجامی دەرکەوت بەڵام بەداخەوە کە ئەمە یەکەم جار نەبووە.

**پێکهاتەی یەکەی هێزەکانی پێشمەرگە لەناو ئێرانداو لەدوای کۆتایی هێرشەکانی رژێمی عێراق بەناوی ئەنفالەکان:-**

لەکۆتایی مانگی ١٩٨٨/٩ بەدواوەو دوای شەڕەکانی بناری قەندیل، هێزەکانی پێشمەرگەو بارەگاکانیان هەمووی چوونە دیوی ئێران، لەسەر سنورەکان پێکهاتەی نوێیان سازدا، جگە لەچەند دەستەیەکی بچووك لەناو خاکی کوردستاندا مابوونەوە، بەناوی پێشمەرگەی پارتیزانی، کەئەوانیش چەند دەستە پێشمەرگەیەکی کەم بوون، لەشاخ و هەردوو چۆڵەکاندا خۆیان حەشار دابوو، تەنیا بەبێ سیم پەیوەندیان بەسەرکردایەتیەوە ئەکرد، ئەوانی ناو ئێران و لەسنورەکاندا پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) کە ئەوکاتە زۆرترین هێزبوو بەسێ مەڵبەند پێکهاتەی خۆی سازدایەوە کە بەم جۆرەبوو:-

١- **مەڵبەندی یەك:** کە سنورەکانی لەسنوری مەریوان دزلێ بەبارەگاکەیەوە، چەند تیپێك و چەندەها پێشمەرگەی لەسنوری پاوەو سلاسی باوەجانی و جوانڕۆو ڕەوانسەر بوو، ئەم مەڵبەندە بە بەرپرسێتی کاك شێخ عەلی شێخ حەمە صالح تاڵەبانی، ئەندامی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) و سەرکردایەتی یەکێتی شۆڕشگێڕان، هەروەها کاك صەلاح چاوشین ڕابەر سیاسی، ئەندامێتی کاك حامد حاجی خالدو کاك جەمیل هەورامی دوایی کاك شەوکەتی حاجی مشیر کە بەرپرسی مەکتەب ڕێکخستن و سەرپەرشتی تیپەکان و ئیشوکاری یەکێتی لەم سنورەدا بوو، تیپەکانی بریتی بوون لە تیپی ١١ ی هەورامان، تیپی ٣٣ ی سورێن، تیپی ٣٥ ی کورەکاژاو، بنکەی نەوپۆڵیش پێشتر لەم سنورەدابوو بەسەرپەرشتی شەهید عبدالرحمن کاك میرزا حەسەن نەوپۆلی لەساڵی ١٩٨٧ دا. وە لەبەرنامەی دامەزراندنەوەی مەڵبەندەکاندا لەگەڵ دام و دەزگاکانی ئێراندا ئیدارەی پەیوەندی دروست بوو کە لەسنوری مەریوان وەکو نوێنەری مەڵبەندی یەك مامۆستا عوسمان کانی پانکەیی کرا بەبەرپرسی پەیوەندیەکان، لەگەڵ قەرارگای ڕەمەزان، کاك بەهجەت کاکەیی بەبەرپرسی ئیشوکاری ئاوارەکان لەم سنورەدا، هەرچەند دوایش گۆڕانکاری تیاکرا، بەڵام ماوەی ٢ ساڵی خایاند..

٢- **مەڵبەندی دوو:** لەسنوری بانەو لەدێی بلەکێ لەسەر مەرزی ئێران عێراق، نزیکی دێی (چەمەك و سپیار)ی شاربازێردا بەرپرسی یەکەم کاك قادری حاجی علی بوو.

٣- **مەڵبەندی سێ:** لەقاسمە ڕەش لەسنوری مەرزی سەردەشت بەرپرسی یەکەم شەهید حەسەن کوێستانی، هەندێ لەتیپەکان چووبوونە خوارەوە لەزەوی ئازادکراودا، بارەگایان دروست کردبوو، لەهەمان جێگا (قاسمە ڕەش) بارەگای بەڕێزان مام جەلال و ئەندامانی (م.س)ی تیا بوو، لەگەڵ بەڕێز کاك نەوشیروان، ئەوەی شایەنی باسە لەم ماوەی

ئاوارەییدا بەڕێز هێرۆخان زۆرترین کاتەکانی لەم سنورەدا مابوەوە، سەردانی شوێن‌و بارەگاو ماڵەکانی پێشمەرگەی ئەکرد، لە بانەو سەقزو مەریوان‌و شوێنەکانی کەدا، هەر لەم ماوەیەدابوو بیری لەدروست کردنی (یەکێتی ژنانی کوردستان) کردەوە، لە ١٩٨٩/١١/٤، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك گرانبوو لەبەر ئەوەی ژنانی پێشمەرگەکان ئەیان ووت پیاوەکانمان زۆر تەواویان کردوە نۆرەی ئێمەیە، ئەمە لەسەرەتاوە، دوایی ڕاهاتن‌و زۆر پێیانخۆش بوو، لەو ژنانەی زوو بەدەمیەوە چوون کە لەیادم بێت ئەمانە بوون: کافیە سلێمان، گەلاوێژ خێزانی کاك سەیوان، ڕەحمە خان، لەسنوری مەریوانیش ئەڵماس فەرەج‌و وەصفیە خان‌و مەعسومە محمودو گەلاوێژ مام مەجید کانی پانکەیی‌و بەیار ماموستا عوسمان‌و کچێ ژنەکانی خێزانی ماڵی مامە عەزیزی باوکی شەهید محمود بەگشتی، وە لەم سنورەدا د. کەریم بەرپرسی پەیوەندیەکان بوو لەگەڵ ئێرانداو ڕۆڵێکی سەرەکی چاکی هەبوو، تەنانەت ئەگەر بەرپرسێکی یەکێتی بەسەیتەرەیەکی ئێراندا بڕۆیشتایە ئەیانووت بەچەی د٠ کەر یم هەستی، لەسەردەشت ماوەیەك كاك غەریب عەسکەری پێشمەرگەی هەرە دێرین، ئەو ئۆردگاو شوێنە گشتیانەی لەناو ئێراندا کە ئاوارەی کوردی تیابوو لە مانگی ١٩٨٨/٣و دوای کیمیابارانی شاری هەڵەبجەو لەمانگی ١٩٨٨/٢ بۆ کۆتایی مانگی ١٩٨٨/٨ و دوای ئەنفالەکان بەتایبەتی مانگەکانی ٣و١٩٨٨/٥ کە ناوەڕاستی هێرشی ڕژێمی عێراق بوو، بەناوی ئەنفالەوە بەهەزارەها کورد بە خێزانەوەو بەبێ هیچ هۆیەکی ژیان، بێ پێویستی ماڵ، هەر لەسنورەکانی هەڵەبجەی شەهید هەتا سنوری دێکانی کەی شارەزوورو ناوچەی شلێری پێنجوێن‌و شارباژێر بەگشتی‌و قەلادزەو پشدەر هەتا باڵەکایەتی بەگەلاڵەو چۆمان‌و دەشتی هەولێر ڕوویان کردە مەرزەکانی ئێران، هەر لەشنۆو نەغەدەو مەهابادو بۆکان‌و ورمێ‌و ڕاژان‌و پیرانشهرو سەردەشت‌و بانەو مەریوان‌و سنەو کامێران‌و ڕەوانسەرو سلاسی باوەجانی‌و پاوەو چەندەها دێ‌و شارۆچکەی شاری کرماشان، ئاوارەی کوردی عێراقی تیا نیشتەجێبوون بۆ ماوەی سێ ساڵ دەوڵەتی ئیسلامی ئێران سەرپەرشتی‌و هاوکاری ژیانی ئەدان بەکارتی سپی‌و سەوز، ڕێگای هاتووچۆ بەنوسراو بەناوی بەرگە کە قەرارگای ڕەمەزان‌و فەرمانداریەکان (قائیمقامیەت) پێی هەڵسا، جگە لە کۆمەڵێکی زۆری پەناهەندە لە ئۆردوگای تایبەتی دا ئەژیان، لەسەرەتادا چادرو دوایی خانوویان بۆکرا، لیژنەی سەرپەرشتی ئۆردوگا کە سەرپەرشتیان ئەکردن، ئەمانە زۆر ئازاد نەبوون، وەکو ئەوانی دێ‌و شارۆچکەو شارەکان، گرنگترین ئەو ئۆردوگایانە لەناو ئێراندا ئەمانە بوون:-

١- ئۆردوگای پیرشێخ نزیك سەردەشت خەڵکی دۆڵی جافایەتی و شارباژێری تیابوو نزیکەی (٥٠٠) خانوویەك ئەبوو.

٢- ئۆردوگای بێزیلە ٤٠٠ماڵێك ئەبوو.

٣- ئۆردوگای سەراو لەنێوان سەقزو بۆکان دابوو بۆ خەڵکی هەڵەبجەو جافایەتی لەهەزار ماڵ زیاتر ئەبوو.

٤- ئۆردوگای هەنگاباد لای پیرانشهر (خانە) نزیکەی (١٥٠) ماڵ ئەبوو، خەڵکی بادینان و گەڵاڵەو حاجی ئۆمەران و شوێنی کەی تیابوو.

٥- دیڵزێ لەنزیك پیرانشهرو بادیناوا بوو (٢٠٠) ماڵ زیاتر ئەبوو.

٦- ئۆردوگای زێوێ لەنێوان شنۆو نەغەدەبوو بۆ خەڵکی باڵەیان.

٧- ئۆردوگای خوی لەسنوری سەروی کوردستان بوو.

٨- ئۆردوگای بیجار بۆ ماوەیەکی کەم بوو بۆ هەڵەبجەییەکان.

٩- ئۆردوگای دزڵی لەخوارووی دێی دزڵی سنوری مەریوان بوو، نزیکەی(٣٥٠) خانویەك بوو، بەزۆری خەڵکی هەڵەبجەو شارەزوورو سیروان و خورماڵی و هەورامانی تیابوو، ئۆردوگای بارام ئاوا بەلای چەپی ئۆردوگای دزڵیەوە بوو نزیکەی (١٢٠) ماڵێك ئەبوو هەمان خەڵکی ئۆردوگای دزڵی تیا بوو.

١٠- شارۆچکەی کانی دینارو جوجەسازی لەنزیك شاری مەریوان ڕێگای سنەدا بوو، خانووی مەریوانیەکان بۆ کاتی شەڕی عێراق ئێران دروستیان کردبوون، بەکرێ ماڵە پێشمەرگەو ئاوارەی تیابوو، جگە لێرە لەدێکانی نێو لە ژێرو بەرقەڵایش نزیکەی (٢٠٠) ماڵی ئاوارەی خەڵکی دۆڵی جافایەتی و پێنجوێن و هەورامانی تیابوو.

١١- ئۆردوگای سلاسی باوەجانی لە سنوری کرماشان.

١٢- ئۆردوگای قەڵای جوانڕۆ.

١٣- ئۆردوگای سەریاس.

١٤- ئۆردوگای کامیاران لەڕێگای سنە کرماشان کە لەساڵی (١٩٧٤)ەوە بوو، خانوی تیا دروست کرابوو.

١٥- ئۆردوگای ڕەوانسەر.

١٦- ئۆردوگای کەنگاوەر لەسنوری کرماشان.

١٧- ئۆردوگای جەهروم: لە ئوستانی شیراز ئەمە ئۆردوگای ساڵەکانی حەفتاکان بوەو تا ئێستا مابوەوەو خانوی تیا دروست کرابوو.

١٨- ئۆردوگای سەنغوری کولیایی.

١٩- ئۆردوگا لـە شارۆچـکەی کـەرەج نزیـک تـاران کـە بـەزۆری بـارزانی و خێزانـی سەرکردایەتی پارتی تیا بوو هەر لە ساڵی ١٩٧٤ەوە.

٢٠- هەروەها لەسنوری پیرانشەرو سەردەشت چەند شوێن و ئۆردوگای لێ بوو وەکو: لاوین، کارخانەی قەند، نەڵەس، وە لە شنۆ: بەرزان ئاباد وە لـە مهاباد: کوشتارگە، چەند شارو شارۆچکە هەتا دێهاتەکان ئاوارەی کوردی تیا بڵاوەی کردبوو..

## سازدانەوەی یەکەی پێشمەرگایەتی لەناو ئێراندا

بەڵام ئەوەی مایەی دڵخۆشیو ئومێدی باش بوو سەرکردایەتی (ی.ن.ك) لەپێش هەموو حزبەکان بەورەیەکی خۆڕاگرانەوە، بڕیاری پشوودرێژی بەخەباتو کۆڵنەدان لە قۆناغێکی پێویستی ئەم کاتەدا پێکهاتەی هێزەکانی پێشمەرگەو بنکەو بارەگای دەزگاکانی سازدایەوە، شوێنی دیاریکراو لەسەر سنورەکانی ئێران، هەر بەشە بەرەو سنورەکانی خۆیان بەرەو رووی عێراق جێگیربوون، هەر لەسلاسی باوەجانی کرماشانەوە هەتا پاوەو مەریوانو بلەکۆی سنوری بانەو قاسمەڕەش سنوری سەردەشتو خانە هەتا ڕاژانو نەغەدەو شنۆ، بارەگای پێشمەرگەو ئۆردوگای خێزانی پێشمەرگەی تیا نیشتەجێ بوون، جگە لەهاوکاری خواردن، پێویستی مانگی سووری ئێرانی، بەرگەی هاتوچۆی قەرارگای ڕەمەزان، لەهەمان کاتدا سەرکردایەتی مووچەی تایبەتی بە بەرنامەیەکی پێویست مانگانە دیاریکرا بوو، بۆ هەموو هێزەکانی پێشمەرگە، بەپێناسەی تایبەتی مووچەو لەئاستی ژمارەی خێزانو ساڵانەی خزمەتی پێشمەرگایەتی، بەدرێژایی ئەو سێ ساڵەی ئاوارەیی ناو ئێران، هاتوچۆکردنی ئاسانی پێشمەرگە بۆ سەردانی شارەکان، خولی مەشقی سەربازی هەرچەند مانگ جارێك بۆ هێزەکانی پێشمەرگە لەبواری جۆراو جۆری سەربازیدا، لەپاڵ ئەمانەشدا بەردەوامیو خۆڕاگری پێشمەرگە پارتیزانەکانی ناو خاکی کوردستانو شوێنە دوورەکان، مەگەر هەر لەتوانای ئەو پێشمەرگانە هاتبێت لەسنورە چۆڵو بێژیانو بەردەم هێرشی ڕۆژانەو شەوانەی کێومالی ڕژێم، لەگەڵ داڕشتنی بەرنامەی گۆڕینیان هەر شەش مانگ دەستەیەك ئەچوونە جێگاکانیان، ئەوانیش بۆ پشوودانو چارەسەری نەخۆشیو بینینی خێزانەکانیان ئەهاتنە سەرەوە بۆ ناو ئێران، خەباتی سیاسیو دیبلۆماسی لەم کاتانەدا زۆر پەرەی سەند بەتەواوی دەنگی کورد گەیشتە هەموو ولاتانی جیهان لەلایەن سەرکردایەتیو بەتایبەتیش هەڤاڵ مام جەلال ڕۆڵی سەرەکی هەبوون بەتایبەتی دوای لێدانی کیمیاوی لەشاری هەڵەبجە لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە، کەوتنەوەی ئەو کارەساتە گەورەیە، هەڵەبجە بوو بەشەهیدی هەرە گەورەی دنیاو ناوی کوردستان، کێشەی کوردی خستە سەرەوەی فایلەکانی سەرمێزی هەموو ڕێکخراوە نێونەتەوەییو دەوڵەتیو مرۆییەکانی هەموو جیهان، لێبوردنە گشتیەکەیش ڕژێمی عێراق دەری کردبوو بۆ هاولاتیانی ئاوارەی ناو ئێران لەکۆتایی مانگەکانی (١٩٨٨)ەوەو لەسەرەتادا خەڵکە هەلاتوەکانی سنوری هەڵەبجەو شارەزوور دەستیان کرد بەگەڕانەوە، بەماڵەوە بۆ ساڵی دوایی تەسلیم بوونەوە کەوتە ناو هێزی پێشمەرگەو حکومەتی ئێرانیش ڕێگای مەریوان گۆخلانی سنوری شلێر پێنجوێنی دانا بوو..

## دیاردەی تەسلیم بوونەوەی پێشمەرگەو ڕۆیشتن بەرەو هەندەران لەئێرانەوە

بـۆ خـۆ تەسـلیم كردنـەوەی ئاوارەكـانی سـنوری سـەقزو بانـەو مـەریوان و زۆر شوێنەكانی تری ئاوارە، لەسنورەكانی سەردەستیشەوە بۆ سەری قەلادزە، هەتا ئەهات تەسلیم بوونەوە زۆر ئەبوو، بەرەو عێراق دیار بوو هەندێ ڕۆشنایی سەركردایەتی تیا بـوو، بەناڕاستەوخۆ پێیـان بـاش بـوو كـە هەنـدێ خێزانـی پێـشمەرگە بگەڕێنـەوە نـاو جـەماوەری كوردسـتانی عێـراق، لەگـەڵیان تێكـەڵاو ببنـەوە لـە كۆمـەڵگاكان و شـارو شارۆچكەكاندا، تەنانەت تەسلیم بوونەوە گەیشتە هەندێ ئاستی بەرپرسیارێتی، هەتا هەڤاڵ مام جەلال گەڕایەوە لەدەرەوەی وڵات، هەر بەگەیشتنەوەی بۆ ئێران و ناو هێزی پێشمەرگە ڕاستەوخۆ بروسكەی خۆشـی و وورە بـەرزی و خـۆڕاگری پڕ لەئومێدو نـاوو نیشانی بروسكەی بۆ بارەگای مەڵبەندەكان، ئەوەبوو بەبروسكە (خوا لەسوڵتان محمود گـەورەترە) وای كـرد لەهـەموو هێـزی پێـشمەرگەو خـەڵكی ئـاوارە كـە ئـەوەی نووسـراوی تەسلیم بوونەوەی بۆ كرابوو ڕەتی گۆڕی و مایەوە، ئینجا بەرنامەی سەردانێكی زۆر خۆش بۆ هـەموو مەڵبەنـدەكان سازدراو كۆبوونـەوەی بەهـەموو پێشمەرگەی مەڵبەنـدەكانی هـەر مەڵبەنـدە لەسـنوری خـۆی دا كـرد، بـەووتاری هەڵسەنگاندنێكی زۆر ووردبینانـە دراسـەی گۆڕانكاریەكانی ئەو ڕۆژەی جیهان و مافی گەلان و چارەنووسی پڕ لە ئومێدی ڕزگاربوون لەماوەیەكی كەمدا باس كرد، هەر لەو سەردانانەیدا (هەڤاڵ مام جلال) بڕیاری دانی دوو موچەی دا پێكەوە بدرێت بەهەموو هێزەكانی پێشمەرگە، بەم جۆرە هـەڤاڵ مـام جـەلال ڕاو بۆچونێكی تازەو زۆر دڵخۆشكاری كردەوە بەگیانی پێشمەرگەكاندا بەلام دیاردەی چوونە دەرەوە بـۆ وولاتـەكانی ئـەوروپا بەتایبـەت سـویدو ئـەڵمانیاو دانیمـارك و بـەریتانیا لـەناو پێـشمەرگەدا بەسـەڵتی و بـەخێزانی دەسـتی پـێكردبوو لەسـەروو هەموویانـەوە سـەركردایەتیەكان بەخێزانـەوە، پێشمەرگە هـەزارەكان بەشـێكیان لـەڕێگای توركیـاوە بـۆ یۆنان و لەوێوە بۆ هەریەكە لەو وڵاتانەی ئەوروپا، تا ڕادەیەك بەچاكی ئەگەیشتن، زۆریشی تێنەئەچوو، ئەمانـە بەشـارەزای دەلیل و قاچاخی نـاڕەسمی ئەیانگەیاندن، بەشـێكی كـە لـەڕێگای تارانـەوە بـە قاچاخـچی و بـەپارە بۆ زاهدان و لـەوێوە بۆ پاكستان، كە ماوەیـەكی كـەمی ئەویـست، بـەلام ئـەم هەژارانـە ئەكەوتنـە نـاو دۆزەخـی ئـاوارەیی و كارەسـاتی زۆر خراپ، هەتا ئەم چەند ساڵەی دوایی ڕزگاریان بوو بۆ وڵاتەكانی تر، تەنانەت لێیـان كوژرا، بەشـێكی كـە لـەڕێگای فەرمانـداری ئێرانـەوە معامەلـەی لیـزە پاصـی بـۆ ئـەكرا بەفرۆكـە

بەنرخێکی کەمو بەڕەسمی نەگەیشتنە سوریاو لەوێوە دەرنەچوون، ئەمیش سەختی تیابوو تا نەگەیشتن..

هەرچەند لەسوریا تووشی زۆر نارەحەتیو باری گرانی ئەو وولاتە ئەبوون، هەندێکیان چەند وولات ئەچوون، بەڵام هەر ئەگەیشتنە ئەنجام بۆ وڵاتەکانی ئەوروپا، کە بەزۆری بەخێزانیشەوە ئەڕۆیشتن، لەسەرەتایشدا ئەم دیاردەی ڕۆیشتنە دەرەوەی پێشمەرگە بۆ وولاتانی ئەوروپا، لەناو هێزی پێشمەرگەدا بەهەڵاتن دائەنرا، بەڵام دوایی زۆر ئاسایی بوو، هەرکەس خۆی بڕیاری بدایەو هەندێکیش سەرکردایەتی یارمەتیەکی کەمی ئەدایە، بەڵام بۆ ئەندامانی (م.س)یو سەرکردایەتیەکیان بە خێزانەوە بەجوازی تایبەتی وولاتان زۆر بەئاسانی لەتارانەوە ئەڕۆیشتن بە فڕۆکەو ئەگەیشتنە وولاتانی ئەوروپاو هەر هەمووشیان لەوڵاتەکانی ئەوروپا زۆر بەزوویيو بەئاسانی مافی پەنابەریێتی سیاسیان وەرئەگرت، دوای ماوەیەکی کەم خۆیان سەریان ئەدایەوەو ژنو منداڵەکانیان جێگیر ئەکرد، بەتایبەت هەڤاڵانی سەرکردایەتیەکانی هەموو حزبەکان.

# تەبایی و هاوکاری حزبە کوردستانیەکان
# لەژیانی ئاوارەیی ناو ئێراندا

ئەوی لەم کاتەدا لەسنوری ئێران بوو، هەر لە (ی.ن.ك) و (پ.د.ك) و حزبی سۆشیالست و پاسۆك و بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان و لەسالانی دوایشدا پارتی گەلی کاك سامی عبدالرحمن هاتە کایەوە، وەچەند دەستەو پێشمەرگەیەکی حزبی شیوعی لەناو لایەنەکاندا ئەژیان و هاوکاری ئەکران، چاکترین تەبایی و گونجاندن لەنێوان حزبەکاندا هەبوو، ئەوەی کێشەبێت نەبوو، سالانە پێکەوە لە ٣/١٦ ی هەموو سالێك هەتا ٣/٢١ یادی کارەساتی کیمیاوی هەڵەبجەو پێشکەشکردنی جۆرەها شانۆگەری لەشارەکان و لە ئۆردوگاکاندا پێکەوە بێ جیاوازی بەهاوکاری قەرارگای ڕەمەزانی ئێران و هەندێ دام و دەزگا سازئەکرا، زۆر بەچاکی ووتاری بەرەی کوردستانی و هەندێ جار هەموو لایەنەکان لەهەندێ بۆنەدا ئەخوێنرایەوە، لە پرسەکاندا بەجۆرێك هاوبەشیان ئەکرد، وەکو هەموو ئاوارە کەس لێکی نەئەدایەوە پرسەی کێ و کام لایەنە، بێ جیاوازی و وەکو یەك خێزان و هاوڕێی سەنگەر پێشمەرگەکان هاتوچۆی یەکتریان ئەکرد، ئیشەکانیان پێکەوەبوون بەتایبەت لە هاوکاری و کۆمەکەکانی دەرەوە کە چوارجار گەیشت، لەولاتانی ئەوروپا (سوید، نەرویج) ئەوانیش کەلوپەلی لەبەرکردن بوو بۆ منال و گەورە جارێك هەندێ پارە، جارێکیش بەتانی، نوێنەری لایەنەکان وەکو لیژنەیەك زۆر بەچاکی و بێ کێشە دابەشیان ئەکرد، بەفۆرم و وێنەگرتنەوە بۆ بەڵگەی دڵنیایی پڕ ئەکرایەوە، ئەنێررایەوە بۆ ئەو ڕێکخراوە خێرخوازەی ئەو وولاتە، جگە لەڕێکخراوی (کرای)، کە لەسەرەتای چوونە ئێران دروست بوو، لەنوێنەری ئەندامانی سەرکردایەتی لایەنەکان سەرپەرشتی بالا، لەسنورەکانیشدا نوێنەری لایەنەکان، وەکو لق ئیشیان بۆ ئەکرد، لەکاتی هاتنی هاوکاریەکاندا، نوێنەرانی بالا سەرپەرشتیاری ڕێکخراوەکە کە لەنوێنەرانی سەرکردایەتی لایەنەکان پێك هاتبوون، ئەمانەبوون: کاك شێخ عبدالکریم شەدەڵە لەلایەن (ی.ن.ك) بەرپرسی یەکەم، مهندس عبدالرحمن نوێنەری (پ.د.ك)، کاك نەوزاد ڕۆژبەیانی نوێنەری سۆشیالست، کاك وشیار احمد بەگ نوێنەری پاسۆك، کاك جمال ئەشرەف نوێنەری بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان، ئەو پارەو کۆمەکانەیش بەشێوەیەکی زۆر کەم بوو هەرچەند زۆر پێویست بوو لەبەر دەست کورتی خێزان و پێشمەرگەکان.

## پێشمەرگە پارتیزانەکانی دوای هێرشەکانی ئەنفال:

ڕژێمی عێراقی لەمانگی ١٩٨٨/٢ بۆ نزیکی مانگی ١٩٨٨/١٠ و زیاتر لەهەشت هێرشی بەربڵاوی بەناوی (ئەنفال) ئەنجامدا، لەهەموو کوردستاندا، بە بەکارهێنانی هەموو هێزەکانی لەشکری عێراقی، زیاتر لە (٤٠٠) فەوجی هەزار چەکداری کورد بەناوی فەوجە سوکەکان، بەپێی پێویست، سنوری هێرشەکانی بۆ ناوچەکانی کوردستان، بە بەکارهێنانی هەموو تواناو جۆرە چەکەکانی تۆپ‌و ڕاجیمەی دوور هاوێژو کۆپتەرو جۆرەکانی فڕۆکەی جەنگی، بەکارهێنانی کیمیاوی لەسەرەتای هێرشەکانیدا، بەتایبەت‌و لە زۆربەی کاتەکانیدا بێ‌سڵ کردنەوەو دەست پاراستن لە جۆری هاوڵاتیانی کورد لە کوردستانی عێراقدا، جوتیارە دێهات نشینەکان لەم هێرشانەدا ڕاستەوخۆی سەرۆکی ڕژێم (صدام حسێن) سەرپەرشتی کردوەو ئەنجام دەریش لەنزیکەوە هەر لە عەلی حەسەن مەجیدی ئامۆزای صدام هەتا هەموو گەورە لێپرسراوانی سەرکردایەتی سیاسی‌و سەربازی لە ئەنجومەنی بەناو سەرکردایەتی عێراق، قائد فەیلەق‌و فرقەکان لەناو مەیدانی هێرشەکانیدا بوون، نەخشەو بەرنامەی تایبەتی ئەوپەڕی نامرۆڤانەیان داڕشتووە بۆ سەرکەوتنی هێرشەکانیان کە لەناو بردنی تەواوی گەلی کوردەو دادگای مەیدانی سەربازیان داناوە بۆ ئەو سەربازو ئەفسەرو چەکدارانەی کە بەدڵی نەگریسی ئەوان پەلامار نەدات لەناو مەیدانی هێرشەکەدا گوللەبارانیان کردون. بەم هەشت هێرشەی بەناو ئەنفال کەچووە ناو زۆربەی لاپەڕەکان‌و لیستەکانی مێژووی ڕەشی دژ بەگەلی کورد، بۆ هەتا هەتایی کە ناسۆری ئازارو برینەکانی لەجەستەی هەژارو بێ‌ دروشمی ئاڵاو بێ‌ناوو سنورو نیشتیمانی کوردا ڕیشەی داناوە، بەو جۆرەی کە ڕژێمی عێراق ئەنجامی دا لەپێناوی تەواو لەناوبردنی گەلی کوردو ئاسەواری نیشتمانی لە کوردستانی عێراقدا، بە بەکارهێنانی هەموو سامانی خۆی. ڕژێمی عێراق بەسەرۆکایەتی (صدام حسێن)و حزبە بەعسیەکەی لەم هەشت هێرشەی ئەنفالدا توانی هەموو دێهاتەکانی کوردستان تێک‌و وێرانبکات بەڕەزو باخ‌و دارستانیەوە، تەنانەت ئەو چەند کۆمەڵە دێهاتەیش کە ماوەی چەند ساڵێك بەئازادی لەژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەدا بوون، بەم هێرشانە کۆتایی پێهێنان، بەخۆیان‌و سەروەت‌و سامانیانەوە، بەڕێگەدانی بەناو ئەنفالیان بێ‌سەرو شوێنیان کردن، بەتاڵانیان بردن، بەپێچەوانەی هەموو دەستورێکی ئاینی ئیسلامی پیرۆزو پێچەوانەی تەواوی هەموو یاساکانی ئەم جیهانە، لەئەنجامی ئەم هێرشەی ڕژێمدا، لەپاڵ کاولکردنی هەموو بنکەو بارەگاو هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستانی وەدەرنا، ڕاپێچی کرد بەرەو سنورەکانی ئێران بەهەموو حزبە کوردستانی‌و نیشتمانیەکان بەگشتی‌و

بەتایبەت هێزی پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك)، کە سەرەکیترین هێزبوون لەو چوار مەڵبەندەدا چالاکیان ئەکرد بەسنوری بادینانیشەوە، (کە سنوری بادینان لەسنورەکانی پارێزگای دهۆك) زۆربەی هێزی (پ.د.ك)ی تیابوو، لەبەرامبەر بەهەموو هێرشەکانی ڕژێمی بەناو ئەنفالدا پێشمەرگەی مەڵبەندەکان بە ئەوپەڕی گیانی لەخۆبوردنەوە شەڕی بەرگری ئەکرد، لەپێناوی پاراستنی ئەو دێهاتانەو جوتیارە دێنشینەکانی، کە بەئازادی ئەژیان لەسەر زەوی‌و نیشتیمانی خۆیان، دەها شەهیدو قوربانیان دا، بەڵام لەبەر نابەرامبەری هێزو بێتوانایی چەك‌و تەقەمەنی‌و پێویستی خواردن، هۆکانی تەندروستی پێشمەرگەی هەژار، بەو توانایەی خۆی زۆر پاڵەوانانە لەئەستۆو بەرپرسێتی مێژوویی خۆی ئەنجام دا، بەناچاری‌و لەبەردەم شاڵاوەکانی ڕژێم دا، زۆربەی هەرە زۆری هێزەکانی پێشمەرگە کشانەوە بەرەو سنورەکانی ڕۆژئاوای ئێران، بەسنوری کوردستانی چۆڵ‌و ئەنفالکراوی عێراقەوە، بنکەو بارەگایان سازدایەوە لە مانگی ١٩٨٨/١٠ەوە بەسەرپەرشتی سەرکردایەتی (ی.ن.ك)، وە هەر حزبەیش بەپێی پێکهاتەو بڕیاری درێژەدان بەخەبات‌و کۆڵنەدان لەم کاتەدا، تەنیا چەند دەستەیەکی کەمی دیاری لە هێزەکانی پێشمەرگە لەو سنورە چۆڵ‌و جیاجیاکانی کوردستاندا مابونەوە، هەریەکە بەپێی گونجاندن‌و باوەڕو پشت بەستن بەیەکتری، دەستەیەکیان پێکهێناوە لە سنوری مەڵبەندەکانی پێشوو، شوێنە شیاوەکان بۆ ئەوکاتە بەناوی پێشمەرگەی پارتیزانی بەگیانی ئەوپەڕی لەخۆبوردن لەهەموو ژیان بۆ مێژووی کوردایەتی ناویان دەرکرد، کە بەڕاستی لە مێژووی هیچ گەل‌و نەتەوەو بزوتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی دنیادا بەو جۆرەی پێشمەرگەی پارتیزانی گەلی کوردو پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) هەڵنەکەوتوە، خۆڕاگرو پشوودرێژ لەناو ئەو هەموو مەینەتیەدا دروست نەبووە، تەنیا لە پەروەردەو قاڵبووی خەبات‌و گیانی لێبوردن‌و ئاستی هەستی شۆڕشگێڕی لە تۆماری مێژووی دا هاتە مەیدان، لەو پێشمەرگە پارتیزانانەی دوای هێرشەکانی ئەنفال بەدی کراوە لە کوردستانی چۆڵ‌و بێبەری کراوی دەستی ڕژێم، لەبەردەم ڕۆژانەی کێومالی (تەمشیت) ی سەدەها جۆری هێزەکانی ڕژێم، فڕۆکەی بەردەوام‌و بڵاوکردنەوەی سەربازگەو ڕەبایەو ئامێری جهازو گەیاندنی جۆرەها بێ سیمی پێشکەوتوو، بەمانەوەو خۆڕاگری ئەم چەند دەستە پێشمەرگە پارتیزانانەی دوای هێرشەکانی ئەنفال شکستی بە بەرنامە ڕەگەزپەرستیەکەی ڕژێمی عێراقی هێنا بۆ تاقە ڕۆژێك دەستەی پێشمەرگە لە کوردستاندا نەبڕا، تاقە کاتێکیش ترس‌و لەرزو باری نائاسایی لەدڵ‌و گیانی دوژمنانی گەلی کورد بەسەرکردەو هێزەکانیەوە نەڕەویەوە، هەرچەند ڕژێم هەندێ ئاهەنگی خۆ خەڵەتاندنیان بەناوی سەرکەوتنەکانی

ئەنفالەكانیانەوە سازدا لەشارو شارۆچكەو كۆمەڵگاكانی كوردستانی بەردەستیدا، بەزۆر بە تۆقاندن خەڵكەكانیان ڕاپێچ ئەكرد، كە بەناوی سەركەوتنەكانیانەوە هەڕەشەی مەرگی دواساتیان لێ ئەكردن، بەڵام تا ئەمات پێشمەرگەو دەستەكانی پارتیزانی ئاسایی تەرو خۆڕاگرتر ئەبوون، ئەو شوێنانەیش لێی ئەبوون بۆی گەڕانەوە، هەندێ جار چالاكیشیان ئەكرد، پەیوەندیان دروست كرد، لەگەڵ سەركردایەتی و ڕێكخستنە نهێنیەكانی ناو شار، پێویستیەكانیان پێ ئەگەیشت، گۆڕین (بدل) كردن لەنێوان پارتیزانەكان و ئەوانی سنوری ئێران دوای ساڵێك دەستی پێكرد، بۆ زیاتر پشوودرێژی و حەوانەوەو چارەسەری نەخۆشی و بێتوانایی لەشیان، كە ئەوكاتەی لەخوارەوە بوون زۆربەیان تووشی جۆرەها نەخۆشی ئەبوون، دوای ئەوە وەكو دارشتنی بەرنامەیەك لەلایەن سەركردایەتیەوە بەگشتی و بەرپرسی مەڵبەندەكان، هەریەكە لەسنوری خۆی دا سەرپەرشتی ئەكرا، بۆ گۆڕینی پارتیزانەكان هەر ٦ شەش مانگ دەستەیەك بۆ شوێنی دەستەیەك لەخوارەوە كە بگەڕێنەوە ناو هێزەكانی سنورەكانی ئێران بەگشتی هەموو ئەو دەستە پێشمەرگە پارتیزانانەی دوای هێرشی ئەنفالەكان لەكوردستاندا كرا بەچەند جۆرو بەشێكەوە كە بەم جۆرە دەستنیشان ئەكرێت:

یەكەم:- ئەو پێشمەرگەو دەستە پارتیزانانەی لەكاتی كشانەوەی هێزەكانی مەڵبەندەكانیدا، هەر ئەو كاتە مەیدانی و زۆر بەجورئەت و لە خۆبوردن و توانایەوە بڕیاری مانەوەیان دا، كە ئەمانە ڕۆڵێكی زۆر سەرەكی هەبوو لەهێنانەوەی ورەی پێشمەرگایەتی و خۆڕاگری و دانانی بناغە بۆ كارو قۆناغی پارتیزانی، كە ئیتر بوو بە بەرنامەیەكی سەركەوتوو چاولێكردن بۆ گەشەكردن و بەردەوامی ئەم بەرنامە شۆڕشگێڕیە.

دووەم:- ئەو پێشمەرگەو دەستانەی كە لەبەری ڕۆژهەڵاتی زێی دوكانەوە، لەبەر هۆی بەرزبونەوەی ئاوی زێكە بەدەستی ڕژێم و لەهێرشی ئەنفالی ٤ چواری دەشتی كۆیەدا خۆڕاگرانە بڕیاری مانەوەو بەردەوامی شۆڕشیان دا، بەجۆری پارتیزانی و گەڕانەوە بۆ سنوری مەڵبەندەكانی پێشویان پەیوەندیان بەهاوسەنگەرە پارتیزانە پێشوەكانەوە كردەوە، بونەتە مایەی پشت و پەناو خۆشحاڵیان.

سێیەم:- ئەو پێشمەرگەو دەستە پارتیزانانەی كە گەیشتوونەتە بناری قەندیل، سەر سنوری ئێران و بەبڕیاری سەركردایەتی و بەرپرسی مەڵبەندەكانیان، وەكو دارشتنی بەرنامەیەكی درێژەدان بەشۆڕش و خەبات، لەئاستی تواناو لێ هاتووی دڵنیابوون لەخۆیان ناردوویاننەتەوە سنورو شوێنەكانی پێشوویان، پەیوەندیان بەهاوڕێ هاوسەنگەرو

پارتیزانەکانی پێشووی سنورەکانیانەوە کردو زۆر مایەی بەرزکردنەوەی ورەو خۆشیان بووە.

چوارەم:- ئەو پێشمەرگەو دەستە پارتیزانانە کەدوای نزیکەی ساڵێك لەناو سنورەکانی ئێرانەوە هەندێکیان لەناو باوەشی خێزانەکانیانەوە وەکو کارو بەرنامەیەکی شۆڕش و هاوکاری هاوڕێکانی پێشوویان هەست بەلێپرسینەوەی خۆیان ناردوویاننەتە خوارەوە بۆ سنورەکانی پێشویان، بەمەبەستی گۆڕین و پشوودان بە هاوڕێکانیان، بەو حاڵەوە کەچۆن گەیشتونەتە ئەو سنورە دوورانە، بەگیانی باوەڕو هەست بەبینینی ئەرکی سەرشان، هاوکاری بەرزکردنەوە ورەی پێشمەرگایەتی و خۆڕاگری و پشوودرێژی بەرنامەی پارتیزانی لەو قۆناغە زۆر پێویست و حەساس و مێژووییەی شۆڕش و گەلی کوردو بەم بەردەوامیانەی دەستەو پێشمەرگە پارتیزانەکان مانەوەی سەرکردایەتی و سازدانەوەی هێزو بنکەو بارەگاکان، دارشتنەوەی بەرنامەی پێویست لەم قۆناغە پڕ ئەزموونە سەختەی دوای ئەنفالەکان گەلی کوردو شۆڕش و بزوتنەوەکەی سەلماندیان کە ئەمجارە هەرەس لەگۆڕ ئەنێن، لەبەرامبەردا لەئەستۆو گیانی ماندووبون و قوربانی خۆیان درێژە بەشۆڕش و خەبات ئەدەن، وە ئەبێ بگەنە ئەنجام، مەبەستی پێویست و وەفا بۆ گیان و کەسوکاری شەهیدانی هاوڕێ و هاوسەنگەرەکانیان، بەشی یەکەمی ئەو فەرماندەو پێشمەرگە دەستانەی لەهەنگاوی یەکەمو سەرەتایی دا لەسنورەکانی خۆیان بڕیاری مانەوەیان دا، بەدڵنیا بوون لەورەو هەست و توانا و شارەزایی و خۆڕاگری خۆیان، بەمەبەستی درێژەدان بەخەباتی شۆڕش و پێشمەرگایەتی بەجۆری پارتیزانی ئەو کاتەی دوای هێرشی ئەنفالەکان ئەم کادرو فەرماندەو پێشمەرگە پاڵەوانانەی ئەو ڕۆژگارە هەرە سەختەی خەبات ئەمانە بوون، بەپێی شوێن و ناوو بەرپرسێتیان کە هەر سنورە بەناوی (ڕەتڵ) ناو ئەبران، بەرپرسی یەکەمو بەرنامەی دابەش بوون لەشوێنەکانیاندا لەسنورەکانداو جۆرو کاتی پەیوەندی و هاوکاری و ئاگادار لەیەکتر بوون و زانیاریەکان لەلایەن ڕژێم و گەیاندنی ڕۆشنایی و ڕێنماییەکانی سەرکردایەتی و بەرپرسانیان لەمەڵبەندەکانی خۆیان کە پەیوەندی لەشوێن و کاتی تایبەت و دیاری کراویان بەنهێنی زۆر پێویست بۆ دارشتبوون، لەنێوانیاندا بەگشتی و پارتیزانەکانیش ئەمانە بوون:-

ڕەتڵی گەرمیان کە سنوری مەڵبەندی یەکی پێشوو بوو بەسنوری قەرەداغ و شوێنەکانی تریەوە کە لە سەرەتاوە مانەوە ئەمانە بوون:-

١- شەهید حەمە ڕەش گەرمیانی (شێخ محمد شێخ کەریم): لە بنەماڵەیەکی شێخی ئاینی گەورەو دیاری سنورەکە بوو، کادرو فەرماندەیەکی عەسکەری زۆر بەتواناو لێهاتوو

بوو، له‌هه‌موو بواره‌كاندا له‌چالاكی‌و ئیداره‌و خۆشه‌ویستی‌و ڕێزی پێشمه‌رگه، ئه‌ده‌ب‌و ڕه‌وشت به‌رزی، ته‌نانه‌ت له‌ڕێكردن‌و هه‌ڵگرتنی كه‌لوپه‌ل‌و خواردنی پێویست، و ڕێگای سه‌خت‌و دووروودرێژ، جێگای شانازی‌و سه‌رسامی هاوڕێكانی بوو، زۆر ماندوونه‌ناسانه‌و پشوودرێژی كاری ئه‌كرد، دوای به‌شداری له‌شه‌ڕی به‌رگری هێرشی ئه‌نفالی یه‌ك بۆ سه‌ر سه‌ركردایه‌تی، زیاتر له‌یه‌ك مانگ‌و برینی ئه‌و ڕێگا دوورو درێژه‌ی كشانه‌وه‌ی هێزی پێشمه‌رگه، به‌و ڕێگا سه‌خت‌و سه‌رمای ناو به‌فره‌دا، به‌سنوره‌كانی دۆڵی جافایه‌تی، شاربازێڕ بۆ سنوره‌كانی ئێران، گه‌ڕانه‌وه‌یان له‌گه‌ڵ هێزه‌كانی مه‌ڵبه‌ندی یه‌ك له‌گه‌ڵ كاك قادری حاجی عه‌لی‌و كاك شێخ جه‌عفه‌ر به‌بناری قه‌ندیل‌و هه‌ولێرو كۆیه‌و گه‌یشتنه‌وه به‌گه‌رمیاندا، ڕاسته‌وخۆ به‌شداری شه‌ڕی به‌رگری هێرشی ڕژێم له‌ئه‌نفالی ٣ ی گه‌رمیاندا، هه‌ر دوای كشانه‌وه‌ی هێزه‌كانی مه‌ڵبه‌ندی یه‌ك له‌م سنوره، ئه‌م كادره ماندونه‌ناسه ڕاسته‌وخۆ ده‌ستی كرد به‌ده‌ربازكردنی خێزان‌و كه‌سوكاری پێشمه‌رگه‌و ده‌سته‌ی پێشمه‌رگه، له‌سنوره‌كانی گه‌رمیانه‌وه په‌ڕاندنه‌وه‌یان له‌ڕێگای چه‌مچه‌ماڵ كه‌ركوك چه‌مچه‌ماڵ بازیان، به شاره‌زایی‌و لێهاتوویی خۆیه‌وه، شه‌وانه بێ وچاندان چه‌نده‌ها ده‌سته‌ی ئه‌په‌ڕانده‌وه، له‌ولاشه‌وه باوك‌و دایكه پیرۆزن‌و خێزان‌و منداڵه‌كانی خۆیان له‌ناو گه‌رمیاندا مابوونه‌وه، خۆیان حه‌شاردابوو، له‌هه‌مه‌ندی سنوردا له‌وانه نزیك دێی چۆڵی فه‌قێ مسته‌فا، به‌ڵام شه‌هید حه‌مه ڕه‌ش كه‌سوكارو خێزانی شه‌هیدو پێشمه‌رگه‌كانی زیاتر لامه‌به‌ست بوو، هه‌تا باوك‌و دایك‌و كه‌سوكاره‌كه‌ی خۆی، هه‌تا ئه‌وه‌ی ده‌ستی گه‌یشتبێ ڕزگاری كردن، ئینجا هاته‌وه بۆ لای كه‌سوكاره‌كه‌ی خۆی‌و هاوكاری ده‌ربازبوونی بۆ په‌یداكردن، دوای ئه‌م هه‌موو ماندوییه‌ش ڕاسته‌وخۆ به ئه‌وپه‌ڕی شانازیه‌وه بڕیاری مانه‌وه‌و كاری پارتیزانی له‌سنوره‌كه‌دا به‌سه‌رپه‌رشتیارو به‌رپرسی ده‌سته پارتیزانه‌كانی ئه‌م سنوره‌و ڕه‌تڵی گه‌رمیان ده‌ست نیشان كرا، به‌رده‌وام سه‌ردانی هه‌موو ده‌سته‌كانی سنوره‌كه‌و ئه‌نجامدانی به‌رنامه‌كانی دیاریكراوی له‌ناوخۆو به سه‌ركردایه‌تیه‌وه ئه‌كرد، زۆر به‌دڵسۆزی‌و پابه‌ندبوونه‌وه ته‌نانه‌ت جگه له‌سنوره‌كانی ناو قولایی گه‌رمیان، له‌ملاشه‌وه ئه‌گه‌یشته شاخی سه‌گرمه‌و بناری سه‌نگاو شاخی ئاشداخ و سه‌رچه‌می ئاوه‌سپی‌و شوێنی تر، ئه‌و كادرو پێشمه‌رگانه‌ی تایبه‌ت له‌گه‌ڵ خۆی دا بوون ئه‌مانه بوون:

١ – شێخ جه‌لال شێخ كه‌ریم (برای).

٢ – شێخ ئه‌كره‌م شێخ كه‌ریم (برای).

٣ – شێخ به‌هادین شێخ كه‌ریم (برای).

٤ – هونه‌ر شێخ عه‌لی قه‌ره‌وه‌یس

٥ – شەهید خەباتە سوور
٦ – ڕزگار ڕەئوف بێگەرد
٧ – شەهید عومەر خەلیفە نامیق
٨ – مامە شێخ تەها شێخ عبدالکریم کە تەمەنیشی هەبوو
٩ – ئاسۆ مامە شێخ تەها
١٠ – پ. م ڕەسول
١١ – پ.م تەیب
١٢ – پ.م پۆلا
١٣ – شەهید فوئاد ژاڵەیی

دوای ئەوەی چەند مانگێك باوك و دایك و خێزان و منداڵەکانیان لەو چۆڵەوانی و شوێنە ناهەموارەدا لەگەڵیاندا بوون، هەتا ڕێیان بۆ کردنەوەو دەربازیان کردن بۆ سنورەکانی ناو ئێران و ئاوارەیی لە مەریوان..

٢- شەهید محمودی مامە عەزیز (مامە عەزە): خەڵکی ئەوبەری سیروان و دێی سەرتەکی بەمۆ بوون، باوکی کە بە (مامە عەزە) ناسرابوو لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلوولەوە پێشمەرگە بوو، لەم شۆڕشە نوێخوازەی (ی.ن.ك) یشدا بەخۆی و کوڕو کوڕەزاو خێزانیەوە، لەپێش هەشتاکاندا پەیوەندیان کردبوو، شەهید محمود هەرچەند کوڕی دووەمی بوو بەڵام وەکو کادرو فەرماندەیەکی عەسکەری زۆر لێهاتوو بەدیارو سەرکەوتوو بوو، لەبەر کەسێتی و توانای خۆی بەچەندەها خزم و کەس و کاری خەڵکی سنوری دێکانی ئەوبەری سیروان دەورەیان لێ دابوون، پەیوەندیان بەڕیزەکانی پێشمەرگایەتیەوە کردبوو، کادرو فەرماندەی باشیان لێ هەڵ کەوتبوو، چەندەها شەهیدیان بەخشی بوو، لە ئەنجامی زۆر جوڵاندنیان بەچالاکی و دەست وەشاندن لە دام و دەزگاو ڕەبایەو پیاوەکانی ڕژێم، لەهەر جێیەك وەکو هێزێکی لێدەرو تایبەت وابوون، تەنانەت ئەگەیشتنە ئەوبەری سیروان و لەشەوی زستانیشدا بوایە لەچەمی ئاوی ساردی سیروانیان ئەداو دەستی چاکیان ئەوەشاند، بەدەسکەوتی چاکەوە هەر ئەو شەوە ئەگەیشتنەوە سنوری مەڵبەندی یەك، لە دێی عەلیاوای قەرەداخ بەزۆری دائەنیشتن و خۆیشیان لەتیپی ١٧ ی زمناکۆ پێشمەرگە بوون، شەهید محمود ئەوکاتە فەرماندەیەکی لێهاتووی کەرت بوو، لەگەڵ باوکی و حاجی فایەقی برا گەورەی و کاك صدیقی عەلی تۆفیق، محمودی مامە علی، سعید مامە حەسەن، ستار صاڵ، کاك أحمد ئار بی جی و چەندەها پێشمەرگەی تر کە بەڕاستی زۆر بەوەفاو دڵسۆزو لێهاتوو بوون بۆ شۆڕش و کوردو ناوخۆیان، بەگشتی و بەتایبەت بۆ

کاك محمودو کاکە سەلامی کوێخا عەزیز کە ئەویش ئەوبەری بوو کادرێکی عەسکەری زۆر بەتواناو بەرێز بوون، لەگەڵ هەموو براو کەس و کاریاندا، بەڕاستی پێشمەرگەبوون، شەهید محمودی مامە عەزە هەر لەکشانەوەی پێشمەرگەکانی مەڵبەندی یەك، دوای هێرشی ئەنفالی ٣ ی گەرمیان و بەجێ هێشتنی سنورەکەو بێ دوودڵی و ئاسایی، بە ئەوپەری هیمەتەوە بڕیاری مانەوەو درێژەدانی خەباتی دا، وەکو پێشمەرگەو فەرماندەیەکی پارتیزانی لەسنورەکەدا، کە زیاتر لەنێوان دێی حەمەی هەواسی ناو قۆپیەکانی قەرەداخ بەلای شاخی زەردەوەو گوڵان و دێکانی: ئاوەسپی و بەڵخەو دێوانەو هۆمەر قەڵاو تەکیەو بەلەکەجاڕی قەرەداخدا بوون، وە ماوەی چەند مانگێك ژنەکەی (فاتمە حسێن) کە ئامۆزای خۆی بوو بەمناڵەکانی و محمدی برازای لەگەڵیدا بوون، هەتا ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەی کە نەك بەحەرام و تاوانبارێك پێی کردن بەناوی (ئەوکە) ناوێك (عبدالکریم حەمە عەلی) خەڵکی دێی ئاوەسپی ناو قەرەداخ بوو، ماوەی چەند ساڵێك وەکو براو کەسی خۆیان لەماڵەکەی شەهید محمودا ژیابوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە شەوی (٦-١٩٨٨/٦/٧) لە کاتێکدا شەهید محمودو کاك صدیق عەلی تۆفیق و چەند پێشمەرگەیەکیان چوبوونە شوێنێکی کە بەمەبەستی چاودێری سنورەکەن لەو شەوەدا ئەو تاوانبارە ڕاستەوخۆ هەموویانی دابووە بەر دەستڕێژ، بە فێڵی ئەوەی کە پیاوی ڕژێم هاتوەتە سەریان، لەئەنجامدا ئەمانە شەهید ئەکات، کە زۆر بەداخەوە لەم شەوە تاریك و تەنیاو چۆڵ و دوور لەئاوەدانی و خێزان و ژن و مناڵێکی ڕێگای ئازادی و کوردایەتی خەڵتانی خوێن کران، ئەم کارەساتە پڕ لەئازارو مەینەتیە هەروا بەنوسین و باسکردن پێناسەو هەقی خۆی نادرێتێ، ناتوانرێ بچینە ناو وەزع و ئێشی ئازارەکانیانەوە، لەو بێکەسیەیاندا کە ڕاستەوخۆ سیانیان شەهیدبوون بەناوی:

١- قارەمان مامەعەزەی برای شەهید محمود گەنجێکی خوێن گەرمی تازە پێگەیشتوو بوو.

٢- شێرکۆ شەهید محمود کوڕی خۆی لە خێزانی پێشووتری بوو.

٣- حەمە شوان (محمد عبدالکریم محمد) خەڵکی دێی عەلیاوای قەرەداخ وە بریندار بوونی (فاتمە حسێن خێزانی شەهید محمود، محمد حاجی فایەق برازای شەهید محمود، کە ئەمیش لەو کاتەدا لە تەمەنێکی زۆر سەرەتاییدا بوو.

کاتێکیش ئەم تاوانبارە وازی لێ هێنابوون کە دڵنیا بووبوو لەوەی هەموویانی شەهیدکردووە، ئینجا بەپەلە هەر ئەو شەوە(ئەوکەی) تاوانبار خۆی ئەگەیەنێتە دائیرەی ئەمنی ڕژێم لەدەربەندیخان، وا ڕائەگەیەنێ کە کاك محمودی مامەعەزەی کوشتوە، بۆ

بەیانی زوو مەفرەزەی ڕژێم زۆر بەدڵخۆشیو خۆسازدانەوە خۆیان ئەگەیەننە سنورەکە، بۆ بردنەوەی لاشەی شەهید محمود، بەڵام شەهید محمود هەر ئەو شەوە دوای ڕووداوەکە وەکو لەدڵیا بێت شتێك ڕووی داوە زوو ئەگەڕێتەوە، ئەکەوێت بەسەر ئەو کارەساتە ناخۆشەدا، فاتمەی خێزانیو محمدی برازای ڕووداوەکەی بۆ ئەگێڕنەوەن ئەویش لەگەڵ کاك صدیق عەلی تۆفیق زۆر بەهیمەتانەو بێ شپرزەبوونو ورەبەردان بەپەلە لاشەی هەرسێ شەهیدەکان دوور ئەخەنەوە، بەپشتێنو شتی تر شۆریان ئەکەنەوە بۆناو ئەشکەوتێکی نادیار لەناو قۆپیەکاندا، بریندارەکانو منالە وردەکان دوور ئەخەنەوە لەشوێنی کارەساتەکە، کە بەیانی مەفرەزەکەی ڕژێم لەگەڵ ئەوکەی تاوانبار ئەگەنە شوێنەکە کەسی تیا نەماوەو هیچی لێ نیە لەپاداشتی ئەوکەدا ئەکەونە لێدانو تێهەڵدانێکی زۆر باش، تا ماوەیەك ئەیگرن، بەپیلانو فێڵی دائەنێن لێیان، لەگەڵ شەهید محمودی مامەعەزەدا، کە ئەو کارەساتە ناخۆشە جەرگ برەیش کۆڵی پێنەدا، درێژەی بەمانەوەو خەباتی پێشمەرگایەتی پارتیزانی بەدڵی بریندارەوە ژنەکەیو منالەکانیو محمدی برازای بەهاوکاری دۆستو خزمانی ڕزگارکردو گەیاندنیانە ناو سنوری ئێران، بۆلای مامە عەزەی باوکیو حاجی فایەقی برایو نەریمانی برا بچوکیو برای شەهید قارەمان، لەدایكو باوکەوە، ئەو کاتە لەدێی حوجەسازی نزیك شاری مەریوان بوون، لەسنوری شلێری دێی وێنەوە بەخێزانی بەڕێکران، بۆ ناو شارۆچکەی مەریوان، دوایی حوجە سازیو ئاوارەیی، کە دوای ساڵێك شەهید محمودو کاك صدیق گەڕانەوە سەرەوە بۆ سنوری ناو ئێران، لای باوكو براو کەسوکاریان، لە ماوەی مانەوەیشدا جگە لە کادری عەسکەری بەتوانا کاك صدیق عەلی تۆفیق کە هەمیشە پشتو پەناو قەڵایەکی هەرە گەورە بوو بۆ شەهید محمود، بەشەوو ڕۆژ بەبەست لێی دوور نەئەکەوتەوە، چەند پێشمەرگەیەکی کەشیان تا چەند مانگێك لەگەڵدا مانەوە، کەئەوانیش: کەمال و مام بەکر ناوێك بوون، لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٨ دا ڕۆیشتنەوە، دوای ئەویش شەهید محمودی مامەعەزە چەندەها جاری تر لەگەڵ کاك صدیقو کاك حسێنو کاك صەلاح تاڵەبانی ئەم دەستە پێشمەرگە پارتیزانە سەر بەڕێکخستنەکانی شۆڕشگێڕانی ناو (ی.ن.ك) ی ئەوکاتە بوون، شەهید محمودی مامەعەزە بەهاوکاری کاك صدیقی عەلی تۆفیق سەرپەرشتیان ئەکرد تەنانەت ئەوەندە بەتواناو بەسەرکەوتوویی کاروباری پێشمەرگایەتی پارتیزانیان ئەنجام ئەدا لەچونە خوارەوەو سەرکەوتنەوەدا، هەتا جارێك مهیمەیەکی گەورەیان بە (ی.ن.ك) سپارد سەرکردایەتیش لە مجلسی الاعلی، شەهید محمود زۆر بەئەمانەتو

هەست بە لێپرسینەوە گەیاندیەوەو کارەکەی ئەنجام داو، بەهەمان شێوە گەیاندیەوە سنوری کرماشانی ئێران و تەسلیم بە بەرپرسانی کردەوە.

٣- کاک عوسمانی حاجی محمود: کادرێکی عەسکەری وشیارو ڕۆشنبیر بوو، فەرماندەی کەرتی ٦ ی تیپی پەنجاویەکی گەرمیان بوو، لەکشانەوەی هێزەکانی مەڵبەندی یەکدا یەکێك بوو لەو کادرە عەسکەریانەی بەهەموو باوەڕو قەناعەتێکەوە، بە درێژەدان بەخەبات و مانەوە لەسنوری گەرمیاندا، وەکو پێشمەرگەیەکی پارتیزانی ئەو هەلە مێژووییە، زۆر پاڵەوانانەو خۆڕاگرانە بڕیاری مانەوەی دا، سەرکەوتن و ناوو ناوبانگی خۆی لەم کاتە گرنگەی شۆڕش و کوردایەتیدا بەدەست هێنا، لەبەردەم هەموو هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان و یەکێتی و سەرکردایەتیدا تەنانەت بەڕێز مام جەلال، لەهەندێ کاتدا چالاکیشی ئەنجام ئەدا، شوێنەکانی زیاتر لەسنوری ناوچەی کفری و هۆمەر مل و سەرەش و کانی عوبێد، شوێنی حەشارگەشی لەناو هەڵەتەکانی ئەو سنورانە ئەشکەوتی (قەڵومن)ی کەڵهێرو توەکەی محمود قەڵا، چەمی قامیش. جگە لەچەند شوێنێکی سەر ئاوەسپی، شوێنی تر لەنزیك دێکانی خانەکان و لەگەڵ ئەم فەرمانده پارتیزانەدا ئەم کادرو پێشمەرگانە خۆڕاگرانە هەڵوێستی مەردانەیان نواند کە ئەمانەن:-

١- شەهید احمد حاجی ڕەشید هۆمەرملی

٢- شەهید مامە قالە

٣- شەهید کامەرانی مامۆستا هیدایەت

٤- مەلا ڕەحیم مەلا ڕەشیدی سەرقەڵایی

٥- صباح شێخ حەمیدی

٦- صالح فەرتەنە

٧- محمود بی کەی سی (کارگێڕی مەڵبەندی گەرمیان)

٨- جمال شێخ حەمید

٩- عوسمان مەلا جەمیل

١٠- شەهید حەمە کادر (محمد ئیبراهیم حاجی ڕەشید کریم خاسە)ی شێخ سمایلی.

١١- شەهید احمد زەرداوی

١٢- عەلی غایب

١٣- عەلی سوری کفری

١٤- حەمە نوری و شەهیدی برای

١٥- عەلی مامە نورە هۆمەرملی

١٦- شەهید کاکە، ئەمە هەر بەشێوەی پارتیزانی ماوەتەوە تەنانەت پەنجەیەکی برینی لێ هاتووە خۆی بڕیویەتیەوە، دوایی هەتا ڕاپەڕین ئینجا چاك بوەتەوە.

١٧- شەهید عمر حاجی محمود برای کاك عوسمان کە لە ڕاپەڕیندا لەگەڵ باوکی شەهید بوون.

١٨- شەهیدڕەمەزان و جاسمی برای و چەند پێشمەرگەیەکی خەڵکی سنورەکە.

کاك عوسمانی حاجی محمود چەند جاری تریش دوای سەردانی بۆ سنوری ئێران گەڕایەوە سنوری پارتیزانەکەی لەگەرمیان، هەتا ڕاپەڕینیش هەر بەردەوام بوو، دوای ئەوەی بەرنامەی گونجاوو لەباری سازدا لەسنورەکەدا، لەسەر ڕۆشنایی و ڕێنمایی و ئامۆژگاریەکانی سەرکردایەتی بۆ ڕاپەڕین، لەدەست پێکردنی ڕاپەڕینیشدا ڕۆڵی قارەمانانەو سەرکردانەی بینی لەگرتن و وەدەرنانی هێزو دام و دەزگاکانی ڕژێم لەسنورەکانی کفری و کەلارو دووزو شوێنەکانی تر، بەخۆیو باوك و براو خزم و کەسوکاری و دۆستان و خەڵکی ئەو ناوەوە، هەتا حاجی محمودی باوکی و عمری برای لەهێرشی ڕاپەڕینەکاندا شەهیدبوون لەسنوری شاری دووزدا.

٤- شەهید کاك مەلا أحمد محمد تورکە ناسراو بەمەلا ئەحمەدی گەرمیان:- فەرماندەی تیپی ٥٥ ی قەرەداخ بوو کادرێکی سیاسی و عەسکەری لێهاتووی ئەو سنورەبوو زۆر جێگای ئومێدی شۆڕش و جەماوەری گەلی کوردبوو، هەر لەکشانەوەی هێزەکانی مەڵبەندی یەکدا، لەگەڵ هێزەکانیشدا هاتە سەر قۆپی و لە بڕیاری مانەوەدا زۆر ئاسایی بوو لای، بە ئەوپەڕی قەناعەتەوە بڕیاری مانەوەو شوێن چۆڵ نەکردنی سنورەکەی دا، کاتێکیش هەموو هێزی پێشمەرگە لەعەسری ١٩٨٨/٤/١٦ دا هەموو ڕیزبوون، بەسەر شاخی قۆپی قەرەداخدا بەرەو شاخی سەرکۆی جافەران بڕۆن، شەهید کاك مەلا ئەحمەد گەرمیانی و پێشمەرگەکانی ئەوانیش لەسەری ڕێگاکەدا بەڕیز ڕاوەستابوونن بە ئەملاو ئەولا ماچ کردن ماڵئاوایی و بەڕێیان کردین، لەناو چاوی دوا سەرنج بۆ یەکتری دەها یادگارو دوا چارەنووسی لەیەکتری دابڕان، کە زۆر بەداخەوە دابڕانی کۆتایی، چونکە کاك مەلا احمدو شەش پێشمەرگەی دەستەکەی لە ١٩٨٩/٢/١٩ قەڵبەزەکە ڕووخا بەسەریانداو شەهیدبوون، شوێنەکانی ئەم دەستە پارتیزانانە بەتوانایە لەسنورو ناوچەکانی دێ ی فەقێ مستەفا، دێکانی قولیجانی ئەمین قارەمان، ئەمین سەرحەدو خۆ حەشاردانیش لە ڕۆژدا زۆربەی لەئەشکەوتی (کەلوس) یان قەڵوەزی

سەرچەمی مامران و لاهێزو پێشمەرگەی دەستەکەیش بریتی بوون لەم شەهیدو وپێشمەرگانە:

١- شەهید دارا سوور (دارا قادر سەمین) نارینی

٢- شەهید سەلام نارینی

٣- شەهید فەرمان نارینی

٤- محمودی مامە یارە

٥- شەهید حەیدەر مام مەجید

٦- حسام عەلی فەرەج

٧- نەوزاد ئەستێلی قەرەداخی

٨- شەهید سەید محمد محی الدین:- خەڵکی شارۆچکەی کفریە، هەر لەسەرەتای کشانەوەی هێزەکانی مەڵبەندی یەك لەسنوری گەرمیاندا ئەم شەهیدە، وەکو کادرێکی کارامەو بەهیمەت، بڕیاری ئاسایی مانەوەی خۆی دا، بەمەبەستی درێژەدان بەخەبات و شۆڕش، لەقۆناغی پارتیزانیدا لەگەڵ ئەوەی خاوەنی تەمەن بوو، خێزان و منالی زۆر بوو هەر لەئەنفالەکەداو لەناو گەرمیاندا ژن و منالەکانی دەست نیشان ئەکرێت و جیایان ئەکەنەوە لەخەڵکەکە لەدێی کوڵەجۆی گەرمیان، بێسەرو شوێن کران کە لەناویاندا دوو کوڕی تازە پێگەیشتووی هەبوو بەناوی شاخەوان و سامان، لەگەڵ ئەم کۆستە گەورەو ئەو وەزعە پڕ لەستەمەی دوای ئەنفال زۆر خۆڕاگرانەو بەهیمەتەوە کاك سەید محمد ڕۆڵی ئەبینی، مایەی ورەبەرزی هاوڕێکانی بوو شوێن و سنورەکەی لەم کاتی پارتیزانەدا لەگوندی سماق و هەزار کانی، تەپە چەرموو، مارف سەیدە، حەشارگەکەیش هەر لەم سنورانەدا بوو، پێشمەرگەی دەستەکەیشی ئەمانە بوون:-

١- مکرم ڕەشید ٢- حەمە ئەمین شەربەت ٣- عەزیز تاوغی کاکەیی.

ئەم پێشمەرگەیە سەر بە (پ.د.ك) بوو زۆر بەهەڵوێست بو، بێجیاوازی لە وەزعە پڕ مەترسی دارەدا، بە ئەوپەڕی باوەڕەوە هاوکاری ئەکراو ڕێزی لێ ئەگیرا، شەهید سەید محمد لەبەر لێهاتوویی لە ساڵی ١٩٨٩ کرا بە بەرپرسی یەکەی شیروانە، لەدەستەکانی پێشمەرگە پارتیزانەکان، پێش ئەنفال فەرماندەی کەرتی تیپی ٥١ ی گەرمیان بوو، زۆر بەداخەوەئەم کادرە لێهاتووە بەپیلانێکی مخابەراتی ڕژێم لە (١٩٨٩/٨/١٤) دەستگیرکرا، پاڵەوانی لێهاتووی زیندانیش بوو بەو هەموو ئەشکەنجەدانەوە لەلایەن دەزگاکانی ڕژێمەوە، بۆ شوێنی پارتیزانەکان ڕژێم سوودی لێنەبینی، زۆر قین لەدڵانە لەمانگی ١٩٩١/٢ ی پێش ڕاپەڕینی کوردستان لەسێدارەدرا خۆی و خێزان و منالەکانی بەدەستی

پیاوەکانی ڕژێم شەهیدکران، دوور لەتاسەی یەکتریو نەگەیشتن بەئاواتی ڕزگاری گەلە هەژارەکەیان..

٦- کاکەحەمە پاریزۆڵەیی:- (دێی پاریزۆڵە نزیک جادەی گشتی کەلار- دەربەندیخان)، شوێنو سنوری پارتیزانیەکانیان دێکانی: زاوت، ڕۆستەمی شامار، حمەی عبدالکریمە سوور، ئیمام محمد، حەشارگەکانیشیان هەر لەم سنورانەدا بوو، کاکە حەمە پاریزۆڵەیی هەر لەسەرەتاوە بڕیاری مانەوەی دا هەرچەند چارەنووسی خێزانو منداڵەکانی نەئەزانی، بێسەروو شوێن بوون، هەتا ماوەیەک دوای ئەوەی لەگەڵ خۆیدا ماوەیەک مانەوە، زۆر بەستەمی لەو چۆڵانەو بێژیانەدا ناچار بێ چارەنووسیو بەدڵێکی قایمەوە خستنیە بەردەم قەدەر، لەو پێشمەرگانەی لەدەستەکەی دا بوون ئەمانەیە:-

١- حەمە شاوکە
٢- هاوڕێ کامەرانی ئەوبەری
٣- تۆفیق ئەوبەری
٤- ڕەمەزان
٥- مام بەول کە ناوی (بەگ مراد شا مراد خوا مراد) بوو

٧- کاک شێخ کەریم خدر ناسراو بە شێخ کەریم چاوڕەش:- هەر لەسەرەتای کشانەوەی پێشمەرگەکانو تیپەکەی ئەم سنورە بڕیاری مانەوەی خۆیدا. تا نزیکەی دوو مانگ ژنو منداڵو دایکیش لەگەڵدابوو دوای ئەوە دەربازی کردن، بۆ سنورەکانی ئێران، بەو حاڵەی خێزانی پێشمەرگە بەمنداڵی ساواوە لەکاتی شەڕو بەرگری ئەنفال گەرمیاندا مابونەوە بۆ سەر ئەم سنورە، ڕۆڵی چاک و دیاری هەبوو، شوێنەکانی کاک شێخ کەریم لە ناوچەکانی: زەنگەنە، تەکیە کۆنو شاخی سەڵباتو، هەتا سەرچەمی ئاوەسپی، حەشارگەکەشیان لەشاخی زەنبوور بوون، پێشمەرگەکانی دەستەی کاک شێخ کەریم لەم مانەوەی پارتیزانیەدا ئەمانە بوون:-

١- ڕزگار نوری اسماعیل
٢- شەهید یاسینە بچکۆل کەرکوکیو چەندەها جاریش چوەتە خوارەوە.
٣- شەهید برهان سەرسپی کەرکوکی کە ماوەیەک سێ خوشکی عازەبیان لەگەڵدا بوو
٤- مەلا ئەحمەد محمد صاڵح (مەلا ئەحمەد خڕە)
٥- سەید جەعفەر لەتیف محمد برای شەهید سەید جەوهەر
٦- عادل پیرەمۆنی

٧- کاک نازم کەرکوکی

٨- شەهید فازل برای کاک شێخ کەریم خۆی

٩- شەهید حەمەی حاجی حسێن ناسراو بە حەمە ئاخە خەڵکی دێی خێڵی ئاخەی بناری ئاشداخ بوو، بەزۆری ژیانی لەپارتیزانیدا بوو لەگەرمیان.

١٠- شەهید سەید بابا محمد

١١- هۆشیار برای کاک ڕزگار دوای چەند مانگێك تەسلیم بوەوە کە بەداخەوە بێ سەرو شوێن کرا.

# ئەو پێشمەرگانەی کە گەڕاونەتەوە گەرمیان
# دوای ماوەیەکی کەم بۆ سنوری گەرمیان و مەڵبەندی یەك

١- كـاك عـەدنان حەمـەی مینـە:- کـادرێکی عەسکەری وشیاربوو، لـەکاتی هێرشـی ئەنفالـدا فەرمانـدەی تیپـی تایبـەتی مەڵبەنـد بـوو، کـە هـەموو چـەکی قورسـیان لـەلابوو، لەڕاجیمەو سام، لەکاتی کشانەوەی هێزەکانی مەڵبەندی یەك، کاك عەدنانیش بەخۆیو پێشمەرگەی تیپەکەیەوە هەتا سنورەکانی چەمی ڕێزانو دەشتی کۆیە گەیشت، بەڵام وا ڕێکـەوتبوو لـەکاتی هێرشـی ئـەنفالی ٤ ی دەشـتی کۆیـە کـە ڕژێـم کـردی، نـاوی زێکـەی بەردایەوە لەو کاتەدا کاك عەدنانو کۆمەڵێك پێشمەرگە لەبەری ڕۆژهەڵاتی زێکە ئەبن، دوای چـەند ڕۆژ شـەڕو بـەرگری، لەهێرشـەکانی ڕژێـم لـەو بـەرەدا، لەهێزەکـەی مەڵبەنـدا دائـەبڕێت، زۆر مەردانـەو بـەگیانێکی زۆر لـەخۆبووردوییی، بڕیـاری درێـژەدان بەخـەبات ئەگەڕێتەوە سنوری گەرمیان، هاوکاری دەستەو پێشمەرگە پارتیزانەکانی ئەو سنورە هەتا سـاڵی دوایـی، هـەروەکو بەرنامـەو کـادرێکی ئامـادەبوو لـەکاتی پێویـستیدا، بـەخۆیو پێشمەرگەکانیشیەوە گەیشتەوە سنوری گەرمیان، وەکو کادرو فەرماندەیەکی پارتیزانی لەوکاتەدا درێژەی بەخەبات دا، پێشمەرگە پارتیزانەکانی دەستەکەشی ئەمانە بوون:-

١ – حاجی عوسمان کەلاری

٢ – شـەهید برهـانی بـرای کـاك عـەدنان کـە زۆر خۆشەویـست بـوو لای پێشمەرگەبەگشتی و بەتایبەتی لای من (نوسەر)

٣ – سامی کەلاری

٤ – هەیاس

٥ – شوانە حاجی ڕەشید کەلاری

٦ – فەرهاد کەلاری

٧ – مەلا کەریم خەڵکی سەعدیەی سنوری ژێردەسەڵاتی ڕژێم بوو.

٨ – دڵشاد عبدالکریم دڵشادی جهاز

٢- مـام ڕۆسـتەم و کـاك ئـازادی سـەگرمە:- هـەردووکیان دوو کـادرو فەرماندەیـەکی عەسکەری بەتواناو دێرینو دیاری ناو هێزی پیشمەرگەی کوردستان بوون، پێشمەرگەو فەرمانـدەی چـەندەها چالاکیو داسـتانی پێـشمەرگایەتیو ڕووبـەڕوو بوونـەوەو بـەرگری لەهێرشەکانی ڕژێم، پەلاماری دام و دەزگای ڕژێمدا بەشداریان کردووە، کاتێك زۆربەی

هێزەکانی پێشمەرگە ئەگەنە بناری قەندیل و سنورەکانی مەڵبەندی ٣ی هەولێر لەماوینی ١٩٨٨، لەسەر ڕۆشنایی فەرمانی سەرکردایەتی (ی.ن.ك)، بەچاکی ئەزانن بۆ سەرپەرشتی و بەهێزکردنی دەستەو پێشمەرگە پارتیزانەکانی سنورەکانی کەرکوك و گەرمیان و ئەم دوو فەرماندە عەسکەریە بچنەوە خوارەوەو لەسەر تواناو ئامادەیی خۆیان بەسنورەکانی کەرکوکدا ئەگەنە سنوری گەرمیان و پەیوەندی ئەکەن بەهەموو دەستە پێشمەرگە پارتیزانەکانی ئەو سنورە، لەگەڵیاندا چەند پێشمەرگەیەکی دێرین و تایبەتی دەستەی خۆیان ئەبەن لەوانە:-

١- هیوا ڕەش
٢- سیروان گۆگجەیی
٣- مامۆستا عادل
٤- اسماعیل برای مامۆستا عادل
٥- مام غەریب
٦- تەهای برای کاك ئازاد
٧- جەمالی خوشکەزای کاك ئازاد
٨- شەهید هەڵکەوت
٩- شەهید شێرزاد
١٢- کاك سەرکەوت
١١- کاك سامالْ کە بە سامالە شێت ناسرا بوو*

## لێدانی پێشمەرگە پارتیزانەکان بە فرۆکە:

دوای مانەوەیان لەم سنورەو دارشتنی بەرنامە بۆ بەسەرکردنەوەو پەیوەندی بەیەکترەوە، لە ڕۆژی (١١/١٠/١٩٨٨) و لەکات ژمێر ٤٥ ر٧ ی سەر لەبەیانی بە چەند ولآخێکی بارکراوەوە دەرچوو بوون، بەمەبەستی گەیشتن بەو مەوعیدەی لەمێوارەدا دایان نابوو بیگەنێ، وا بەرنامەبوو کە دەرچوونەکە بەدوو بەش بێت، لەچەمی مامرانەوە کە کونی هەنگوینەکە ناوی بوو، لەپشت دێی کەڵوز لوقمان، کاتێك وەجبەی یەکەمیان ئەکەونە ڕێ کە بریتی بوون لە:-

| | |
|---|---|
| ١- مام ڕۆستەم | ٢- کاك ئازادی سەگرمە |
| ٣- شەهید حەمەڕەش | ٤- شەهید شێرکۆ |
| ٥- شەهید هەڵکەوت حەمەئەمین | ٦- کاك تەها |
| ٧- شەهید شێرزاد | |

---

چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێزان کاك کوردۆ، کاك محمود سەنگاوی.

هەر لەکاتی دەرچوونیاندا بەماوەیەکی زۆر کەم دیارە یەکسەر بەو کۆمەڵە زۆرە دەرکەوتوون، لەشوێنە چۆڵو محرەمەدا کە ڕژێم لەسەر هەموو شوێنە بەرزەکان ڕەبایەو پێویستی وسائلی چاودێری داناوەو هەموو هاوکاریەکی پێویست لەلایەن ڕژێمەوە ئامادەو دەست بەکاربووە، لەکاتی پێویستو پەیوەندی دەزگاکانی ڕژێم بەیەکترەوە، هەر بەوجۆرە لە پڕ ٦ شەش فڕۆکە ئەگاتە سەریانو ڕاستەوخۆ دایان ئەگرێتەوە بەهەموو چەکەکانی ناوی، لەو لێدانەدا کاک ئازادی سەگرمە زۆر بەسەختی بریندار ئەبێتو سێ پێشمەرگەیش هەر لەجێدا شەهید ئەبن کە ئەمانە بوون:-

١- شەهید شێرکۆ جدی ٢ - شەهید هەڵکەوت حەمە ئەمین/ عدد جیهاز

٣- شەهید شێرزاد

وەسێ پێشمەرگەیش بریندار ئەبن، لەچاو برینی کاک ئازاددا سوک ئەبێت کە ئەوانیش ئەمانە بوون

١- تەهای برای کاک ئازاد ٢- سەرکەوت ٣- ساماڵە شێت.

هەر لەگەڕانەوەی فڕۆکەکاندا یەکسەر بەشی دووەمی پێشمەرگەکان کە هێشتا دەرنەچووبوون بەپەلە ئەگەنە سەریان کە ئەوانیش بریتی بوون لە: ١- کاک عوسمانی حاجی محمود ٢- مام جەلال ئەمین کاکل ٣- کاک ڕەحیمی جیهاز ٤- کاک بەهادین برای شەهید حەمە ڕەش ٥- کاک مەجید ٦- ڕزگار ڕەئوف بێگەرد، کاتێک ئەم بەشەی پێشمەرگەی دواوە ئەگەنە سەر ڕووداوەکە، ئەبینن زۆر ئازاو مەردانە کاک ئازاد بەبرینداری لە شوێنی لێدانەکە ڕزگارکراوە بۆ ژێر هەندێ ڕووەکی قەرەقاج کە لەو سنورەدا بووە، هەر لەو ماوەیەدا شەش فڕۆکەکە گەیشتوەتە سەریان، بۆ هەمان شوێن، پێشمەرگەکانیش لە کەندرێکی شوێنی نادیاری خۆیان حەشار ئەدەن لەو سنورەی ناوچەی (مامران)، ئەبینن کۆپتەرەکان دوانیان ئەنیشنەوەو دوانی کەیان لەو دەورو پشتە هێز دائەبەزێنن، دوانیان بەئاسمانەوە چاودێری ئەکاتو پارێزگاریان لێ ئەکات چونکە ئەم پێشمەرگانە زۆر ئازایانە بەرهەڵستیان بونەتەوە، بەهەموو جۆرێک بەرگریو تەقەیان لێ کردوون، لەکاتی لێدانەکەی پێشویاندا، ئەمە هەتا نزیکەی ٢٠ دەقیقە لەشوێنی ڕووداوەکە فڕۆکەکان بەو جۆرە بوون، ئینجا هەموویان ڕۆیشتن، بەپەلە پێشمەرگەکان ئەگەنە شوێنی ڕووداوەکە بۆ هەواڵی ئەو سێ هاوڕێیەیان، ئەبینن کە لاشەکانیان دیارنیەو چەند وڵاخێکیشیان کوژراوەو بەهەموو بارەکانیانەوە لەتەقەمەنیو خواردن سوتاندبوویان، هەر لەشوێنی ڕووداوەکەدا ئینجا بەپەلە کاک ئازادیان بە ناقلەیەکی دەستی گەیاندبویانە شوێنێکی حەشارگەی پێشووتریان، کەناوی (کونی سوچەرەکە)

بوو، لەپشت دێی حەمەی عبدالکریم سوور، لەکۆتایی داری خلەو سێ بریندارەکەیش لەو چەمو نادیارانەدا دوور لە کاک ئازاد شوێنیان بۆ دروست ئەکەن، لەهەواڵی ئەم ڕووداوە ناخۆشەدا هەموان دڵتەنگ ئەبن..*

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێزان: عوسمانی حاجی محمود، محمود سەنگاوی، مام ڕۆستەم، عدنان حەمەی مینە،شێخ کەریم چاورەش، صدیق علی تۆفیق حسام علی فەرەج مەلا ئەحمەد گەرمیانی.

# هاوکاری و بەدەمەوەچوونی پێشمەرگەو ڕێکخستنەکانی ناوشار

لەئێوارەدا زۆربەی دەستەو پێشمەرگە پارتیزانەکانی ئەو سنورە دێن، بۆ هەواڵو هانایانەوە لەوانە شەهید محمودی مامە عەزە، کاک صدیق عەلی تۆفیق و کاک مەلا ئەحمەد گەرمیانی و کاک عەدنانی حەمەی مینەو لەو شتانەی کە لەشوێنی ڕووداوەکە بەجێ مابوون، ڕادیۆو جامانەکەی شەهید شێرکۆ جدی، شەهید هەڵکەوت بوو کە شوێنی گوللەیان پێوە دیار بوو، ئینجا هەر هەموو فەرماندەو کادرەکانی پارتیزانی لەهەوڵی پەیداکردنی داوو دەرمان و چارەسەری کاک ئازادو ئەو ۳ پێشمەرگەدا بوون، زۆر زوو بەپەرۆشەوە کەوتنە هەوڵدان، بەتایبەت بۆ کاک ئازاد کە زۆر جێی مەترسی بوو، برینەکانی بەتایبەتی لەو شوێنە چۆڵو گەرماییەدا، بۆ ئەم مەبەستەیەش پەیوەندیان کرد بەکادرەکان ڕێکخستنی ناو شارەوە، لەوانە هەردوو کادری زۆر بەتواناو ڕۆڵەی ڕۆژگاری سەخت، خواڵێ خۆش بوو کاک حەمە ڕەشیدی حاجی شەریف باریکەیی، شارەزووری و کاک حەمە نوری سوور گەرمیانی، ئەوانیش زۆر بەپەرۆش و بەهیمەتەوە دوای چەند ڕۆژێک کاک (شێخ صدیق شێخ عوسمان) بەرزنجەیی بەناوی (د ٠ محمود)ەوە زۆر بە لێبڕاوانەو مەردانە ئامادەیی دەرئەبڕێت، بەهاوکاری پیاوی بەهیمەت و کورد پەروەر مام خەلیفەی کەلار لەڕێگای دەواجنەکەی کاک احمد وەلی بەشەرەف و هاوکاری پێشمەرگە پارتیزانەکان کە ئەم دەواجنەی کردبوو بە مەڵبەندی هاوکاری، پەیوەندی ڕێکخستنە نهێنیەکان و پێشمەرگە پارتیزانەکان بوو، لەم ڕۆژانەدا ڕۆڵێکی مێژوویان هەبوو، لە بزووتنەوەی کوردایەتیدا، کاک صدیق بەرزنجی (د ٠ محمود) بۆ ماوەی نزیکی ۳ هەفتە لەخزمەتی تەداوی و چارەسەری برینی کاک ئازادو ۳ پێشمەرگەکەدا بوو، لەمەترسی ڕزگاری کردن و گەڕایەوە، دوای ئەوەیش هەر بەهیمەت و توانای لێبوردەیی کاک حەمە ڕەشید شارەزووری و کاک حەمە نوری بەهاوکاری کاک صالح حەمەخان دەربەندیخانی توانیان داستانێکی مێژوویی تۆمار بکەن، بەگەیاندنی کاک ئازادی بریندار بەشاری بەغداو چاککردنەوەی بەجۆرێک لەمردن ڕزگاری بکەن، دوای ئەوەیش گەیاندنی بە سنورەکانی ئێران و سەرکردایەتی (ی.ن.ك)، کە لەوێوە ناردنی بۆ دەرەوەی وڵات لەوکاتەدا، بەڕاستی ئەمانە چالاکی و گیان و هەستی شۆڕشگێڕیەی گەلی کورد، شانازی بەخۆیەوە ئەکات، کەخاوەنی ئەم ڕۆڵە بەجەرگ و مەردانەی ڕۆژگاری سەختە بەگشتی و بەتایبەت شۆڕشی

(ی.ن.ك) بەجۆرێك ئەم کردارە ئەنجام دراوە هەندێ جار وەکو خەو ئەبینرا، ئەومندە مەبەست و خۆشحاڵی بوو لەوکاتە پڕ مەترسی دارەدا، فەرماندەیەکی وا بەتواناى وەکو کاك ئازادى سەگرمە ڕزگار بکرێت لە بەردەستی دوژمن و لەهەمان کاتدا ڕزگار بکرێت بەو شێوەیە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەو لەبەرچاو بوو..*

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێزان حمە رەشید باریکەیی، حمە نوری گەرمیانی، هەروەها شێخ صدیق بەرزنجی بەراستکردنەوەی پێشمەرگە پارتیزانەکان.

## ئەو دەستەو فەرماندەو پێشمەرگانەی
## کە لەسنورەکانی ئێرانەوە وەکو پێویست گەڕانەوە بۆ سنورەکانی پێشوویان

١- کاک محمود سەنگاوی و کاک کوردۆ قاسم:- کە هەردووکیان دوو کادری عەسکەری و سیاسی بوون، بەشداری زۆربەی هێرش و بەرگریەکانی ڕژێمی عێراقیان کردوە، لە هێرشەکانی ئەنفالەکانی قەرەداغ و گەرمیان و دەشتی کۆیە، لەگەڵ هێزی پێشمەرگەشدا لەکاتی کشانەوەدا دوای شەڕی بناری قەندیل، ئینجا بۆ سنورەکانی ئێران لەسنوری مەریوان و دزڵی سازدانەوەی مەڵبەندی یەکدا دوای ساڵێك لەداڕشتنەوەی چونە خوارەوەو بەشداری پێشمەرگایەتی پارتیزانی، ئەم دوو فەرماندە بەتواناییە زۆر مەردانە ئامادەیی خۆیان نیشانداو بۆ ماوەیەکی زۆرو سەرکەوتوانە گەیشتنەوە سنوری گەرمیان، بوونە هاوکاری چەند دەستەیەك لە پێشمەرگە پارتیزانەکانی خوارەوە بەمەبەستی حەوانەوەو سەرکەوتنیان بۆ سنورەکانی ئێران و چارەسەرکردنی نەخۆشەکانیان، لەو کادرو پێشمەرگانەی کە لێبڕاوانە لەگەڵیاندا چوونە خوارەوە ئەمانە بوون:-

دوای کاک کوردۆ قاسم و کاک محمود سەنگاوی، کاک حەمە پاریوڵەیی کە ماوەیەکی کەم هاتبووە سنوری ئێران، کاک مقداد بهاءالدین برای شەهید شێخ جمال گەرمیانی، کاک حەمە سیاسی (محمد ڕۆستەم)، کاک سهاد خانەقینی کادرێکی عەسکەری زۆر بەتوانا بوو، کاک محمد فەرەج ، کاک برایم دیسکۆ، کاک هەژاری ئاسایش ئێستا ئەمانە بەسەرپەرشتی کاک کوردۆو کاک محمود سەنگاوی، بەتایبەتی بۆ چەند جارێك چوونەوە سنوری گەرمیان، هەرجارە بۆ شەش مانگ، بەژیانی ئەو پارتیزانە پێشمەرگەیەکی پارتیزانی بەناوی کاکە حەمە ئاخە، لەهەموو ئەو ماوەی سێ ساڵەدا تەنیا ماوەیەکی زۆر کەم چووەتە ناو ئێران، ئەویش بەزۆری سەرکردایەتی بۆ چارەسەری نەخۆشی، هەر زوو گەڕایەوە سنوری گەرمیان، لەگەڵ خۆیشیدا ئەم پێشمەرگانە چوونە گەرمیان: ١- لوقمان عەزیز کە تەمەنێکی زۆر کەمی هەبوو لەوکاتەدا ٢- شەهید نادر گەرمیانی ٣- سەلامی کفری ٤- بەهادینی حاجی محمودی داربەڕوو ٥- ئازادبان سنوقی.

٢- کاک ڕەیس (سامان سعید علی):- پێشمەرگەو کادرێکی زۆر دێرینی کوردایەتی بوو، هەموو تەمەنی لەخزمەتی بزووتنەوە نیشتیمانی و کوردایەتیدا بوو، بێ پشوودان و ماندونەناسانە کاری ئەکرد، بێ هیچ خواستێکی تایبەتی، لە کاتێکیشدا کە سەرکردایەتی (ی.ن.ك) و فەرماندەو کادرەکانی ئەوی پێویست کرا بۆ بەشداری خەباتی پارتیزانی

پێشمه‌رگایه‌تی له‌سنوره چۆڵه‌كانی دوای ئه‌نفاله‌كان، به‌مه‌به‌ستی درێژه‌دان به‌خه‌بات و به‌رده‌وامی و هه‌بوونی په‌یوه‌ندی به‌جه‌ماوه‌ری كوردستان و رێكخستنه نهێنیه‌كان و دڵسۆز و كه‌سایه‌تیه كورد په‌روه‌ره‌كانه‌وه، كاكه ره‌یس وه‌كو كادرێكی زۆر به‌هیمه‌ت له‌و رۆژگاره پێویسته سه‌خته‌ی خه‌باتی گه‌لی كوردماندا، زۆر مه‌ردانه بریاری هاوبه‌شی ئه‌و خه‌باته مێژووییه‌ی كرد، له‌رۆژی (١٩٩٠/٦/٨) له‌سنوری بله‌كۆی بانه مه‌ریوانه‌وه گه‌رایه‌وه به‌ره‌و شارباژێری سنوری كوردستانی عێراق، شوێنه چۆڵه‌كانی سه‌ر ئاوی گه‌وره‌و ته‌نكه بوارو پشتی بزه‌نیان و پوشینی شارباژێر، له‌وێشه‌وه بۆ سنوره‌كانی شاره‌زوورو دێی یه‌خی ماڵی له نزیك له شه‌وی ١٦-١٧ /١٩٩٠/٦ ئه‌گه‌نه سه‌ر ئاوی كارێزه‌كه‌ی دێی شه‌مه‌و وێڵه‌كه‌ی بناری شاره‌زوور شاخی قه‌ره‌داخ‌داو ماوه‌ی ٣ رۆژێك بۆ حه‌وانه‌وه له‌م شوێنانه‌دا ئه‌مێننه‌وه، له‌گه‌ڵ چه‌ند پێشمه‌رگه‌یه‌ك كه هه‌ندێكیان به‌مه‌به‌ستی گه‌یاندنیان به كاك عوسمانی حاجی محمود هاتبوونه خواره‌وه له‌گه‌ڵ كاك ره‌یس به‌گشتی ئه‌مانه بوون:-

١- شه‌هید رفعت سێوسینانی
٢- شه‌هید صدیق عبدالكریم قرگه‌یی
٣- به‌هادین مه‌جید به‌له‌كه‌جاری قه‌ره‌داخ
٤- شه‌هید فه‌ریقه سوور
٥- مام مه‌جید گه‌رمیانی بۆ لای كاك عوسمان گه‌رابوه‌وه
٦- شه‌هید أحمد زه‌رداوی بۆ لای كاك عوسمان گه‌رابوه‌وه
٧- عوسمان گه‌رمیانی بۆ لای كاك عوسمان گه‌رابوه‌وه
٨- ره‌شید توكنی بۆ لای كاك عوسمان گه‌رابوه‌وه
٩- احمده سوور
١٠- عوسمان بیه ره‌شكه‌یی

ئه‌م ده‌سته پێشمه‌رگه هه‌ژاره پارتیزانانه له‌سه‌ر ئاوی ئه‌م كارێزه‌ی دێی شه‌مه‌وێڵه‌كه ئه‌كه‌ونه ناو كاره‌ساتی به‌زه‌هراوی تێكردنی ئاوی كارێزه‌كه، به كیسی نایلۆن، له‌لایه‌ن پیاوه‌كانی ده‌زگاكانی رژێمی عێراقه‌وه، به‌مه‌به‌ستی لێدانی پێشمه‌رگه پارتیزانه‌كان، به‌و جۆره كاره نامرۆڤانه‌یان له‌كاتێكدا كاك ره‌یس له‌گه‌ڵ كاك أحمد زه‌رداوی و شه‌هید صدیق، ئه‌یانه‌وێت پێشمه‌رگه‌كانی لای كاك عوسمان به‌رێكه‌ن به‌ره‌و سه‌رشاخی میریاسی سه‌ر ئه‌كه‌ون، ئه‌بینن سنوری قه‌ره‌داخ له كێوماڵێكی زۆر سه‌ختدایه، رژێم به‌هێزێكی زۆره‌وه له‌و ناوه‌دایه، ناچار ئه‌گه‌رێنه‌وه، له‌پر كاك به‌هادین مه‌جید

ئەکەوێتە هاوارێکی زۆر گەورەو خۆی ئەدات بەزەویدا، دوای ئەمیش کاک صدیق عبدالکریم لێی ئەدات، دوای ماوەیەک یەکسەر شەهید ئەبێت، ئەوانی کەیش بەکاک ڕەیسەوە لێدانی ژەهرەکە دەرئەکەوێت لەسەریان، زۆربەیان پەرێشان ئەکات، بەهەر جۆر لەرێگای هاورێیانی ناو شارەوە ئەبرێنەوەو هەندێکیان بەنهێنی چارەسەر ئەکرێن و ئەگەرێنەوە سنورەکەی خۆیان، بەتایبەت کاک ڕەیس هەر زوو وەکو کادرێکی هەست بەلێپرسراویەتی ئەگەرێتەوە، لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی ماونەتەوەو ئەوانی لای کاک عوسمان حاجی محمود ئەگەنە لای کاک عوسمان و ئەو سنورانەی گەرمیان، زۆر پشوودرێژانەو بەو ئازارەوەو لەوکات و شوێنە بێ خزمەت و بێ ژیان و بێ حەوانەوەدا، هەتا بەشداری ڕاپەرینیش ئەمێننەوە، بەمەرجێك لەکاتی گەڕانیدا بەناو سنورەکانی گەرمیاندا کاک ڕەیسی ماندوی زەهراوی، لە شەوێکدا مارێکیش پێوەی ئەدا، ئینجا بەو هەردوو ئازارەی ئەوکاتە سەختە مەگەر هەر لەتواناو خۆڕاگری کاکە ڕەیس و پێشمەرگەی کوردو یەکێتی دا بوو بێت، لەو پێشمەرگانەی درێژەیان بەمانەوەدا کاک عدالت سێوسێنانی بوو.

٣- کۆمەڵێك پێشمەرگە بەشێوەی دەستەی بچوك:- چەند پێشمەرگەیە لە سنورەکانی مەڵبەندی یەکی مەریوان دزلی و بانە بلکێی مەڵبەندی دووی ئەوکاتەی، سنورەکانی ناو ئێرانەوەو بەو جۆرەی پێشمەرگەو کادرەکانی ئەم دوو مەڵبەندە زۆر نزیکی و تێکەڵاویان لەگەڵ یەکتریدا هەبوو هەروەها لەهاتنە خوارەوەیشدا بۆ سنورەکانی شارباژێرو سلێمانی و کۆمەڵگا زۆرەملێکانی شارەزوور، چەندەها جار پێکەوەو بەشارەزایی و ڕێنمایی هاوکاری یەکتریان کردووە، بۆ هاتنەخوارەوەو سەرکەوتنەوە زۆر ب سەرکەوتوویی، بەتایبەت لەدوای ناوەڕاستی مانگەکانی ساڵی (١٩٨٩) ەوە لەوانەیش بەزۆری ئەم کادرو پێشمەرگانە بوون:-

١- کاک دلاوەر عوسمان و کمال حەمە ڕەشیدو کاوە کوێخا مەجید، ئەمانە هەر سیانیان پێنجوێنی بوون چەندەها جار لەسنورەکانی بلەکێ وە هاتوونەتە شارباژێرو سەردانی سلێمانیان کردوەو ماونەتەوە تیایداو کارەکانیان ئەنجام داوەو گەڕاونەتەوە زۆر بوێرانەو ئاسایی بوو لایان.

٢- کاک دڵشاد قرگەیی لەگەڵ بەختیار محمد، حەمە کەریم قوربانی کە ئەمانیش قرگەیین، چەندەها جار ئەم سیانە پێکەوەو جەند جار لەگەڵ کاک شێخ کەریم سیتەکی و کاك شێخ مستەفا سیتەکی کە کاك شێخ مستەفا پێشمەرگەیەکی زۆر ڕۆح سووك و چالاك و بەتوانا بوو، ئەمانە پێکەوەو بەجیا لەسنورەکانی مەریوان و بلەکێ و شارباژێرەوە ئەهاتنە

دێی پوشـێن و نـاو شـاری سـلێمانی و کۆمـەڵگا زۆرەملێکـانی شـارەزوور، ئەگەڕانـەوەو کارەکانیـان ئەنجامـداوە، هەنـدێ جاریش کـاك حەمـە بۆر قرگـەیی فەرمانـدەی کـەرت بـوو پێشترو عمر چەوتانی لەگەڵیانـدا بـوون، ئەمانـە لـە ڕێکخستنەکانی شۆڕشگێڕان بـوون، لەجارێکدا کاك حەمەبۆر قرگەیی لەنزیك مجمعی برایەتی و عەربەتەوە دەستگیرکرا، لەلایەن پیاوەکانی ڕژێمـەوە، کـەس بەهیوای نەما، بەڵام بەخۆڕاگری و ئازایەتی خۆی لەزینداندا خـۆی بەسـەربازی هـەڵتوو دانـابوو، بـەوجۆرە لـەدوای ڕاپـەڕین، ڕزگـاری بـوو ئـازادکرا لەزیندانی ڕژێمی عێراق دوای ڕاپەڕین، هەروەها کاك عباس سیتەکی، کاك احمد محمد ڕەشید ناسراو بەمامۆستا احمد لەگەڵ شێخ کەریم و شێخ مستەفا سیتەکی، ئەمانیش بەڕاستی ڕۆڵی سەرەکی و دیاریان هەبوو لەم کاتە دژوارەدا.

٣- وە لە ڕۆژەکانی ٩/١٥ و ١٩٨٩/١٠/١٥ بەچەند جارێك ئەم پێشمەرگانە چوونە خوارەوە، دەستەیەکی چەند پێشمەرگەیەکی تر بریتی بوون لەکاك حمە عەلی بەرزنجی، ئەرسەلان غەفور، مام ڕەئوف و ئەوزادو جەزا گێلدەرەیی و حەمە ڕەزا بەردەزەردی و هەندێ جار لەگەڵ شێخ حەمە زیادو شێخ سالار شێخ جەلال و مام مچەی برای کاك حەمە زیادو عمری مەلا محمودی ممند ئاواو عوسمان حاجی عەلی مکڵی و مام تەهاو عومەر چەوتانی و خالد مام مەجید کانی پانکەیی، جار بەجار لە سورێنەوە بۆ چەمی گەڵاڵ و شاربازێڕ، لە دەستەیەکدا بۆ ناو شاری سلێمانی کاك شێخ سالار شێخ جەلال و کاك شێخ مستەفا (مام مچەی) برای کاك حەمەزیاد گیران، لە جارێکیشدا عمر چەوتانی مینی شەخصی لێی دا بەپەلە گەڕانیانەوە بەشاخی سورێن دا، گەیاندنیانەوە نەخۆشخانەکانی ئێران و قاچێکی لەدەست دا هەروەها تایەری حاجی سعید حاجی مامندی و شێخ سەردارو جبارو جمال حاجی مامەند وە لەو کادرە عەسکەریە بەتوانانە کە زۆر بێ منەتانە لە بلەکێوە لەسنوری شاربازێڕەوە چەندەها جار ئەگەیشتنەوە ناو شاری سلێمانی و کۆمەڵگاکانی شارەزوور، کارەکانیـان ئـەنجام ئـەداو زۆر جار سەرپەرشتی و ڕێنمایی پێشمەرگەو دەستەکانیشیان ئەکرد، ئەوانیش بریتی بوون، لەکاك ئازاد عبدالله و جەمال چاوشین وەنگەرێنەیی سەر بەمەڵبەندی دووی بلەکێ بوون و چەندەها جار بەناو هێزەکانی ڕژێمدا ڕۆیشتوون، یان ڕێیان پێ‌گیراوە توانیویانە خۆیان دەرباز بکەن، ئەمانە هاتنە خوارەوە زۆر ئاسایی بوو لایان و بەڕاستی زۆر بەتواناو ورەبەرز بوون..

٤- دەستەیکی زۆر بەتواناو لێهاتووی چەند پێشمەرگەیی کە زیاتر لە تیپی ١٥ی شـارەزوورو سـنورەکانی هەڵەبجە بوون، زۆر مەردانـەو بـە ئەوپـەڕی هیمەتـەوە بووبوونـە چاوساغ و ڕێ نیشاندەری ئەو دەستە پێشمەرگە پارتیزانانەی ئاڵ و گۆڕیان پێ‌ئەکرا، کە

ئەوانیش ئەمانە بوون: ١- شەهید فازل شێرەمەڕی ٢- مامە ناجی ٣- شەهید مامە ڕەئوف قاینەجەیی کە بەڕاستی پێشمەرگەیەکی لێهاتوو خۆشەویست و ڕەوشت بەرزو جوان و بەڕێز بوو ٤- عزیز کوڵکنی ٥- خلیل سەرکانی ٦- شەهید فایەقی ڕابە، هەروەها کاک فەلاحی حەمە بۆرو بورهانە ڕیشەو زۆر پێشمەرگەی تر چەند جار بەمەفرەزە ئەچووە ناو شارۆچکەی هەڵەبجەو ئەو سنورانەی شارەزوورەوە، لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگەی بەتوانا وە پێشمەرگەکانی تیپی (١١)ی هەورامان کە زۆربەی بارەگاو شوێن و ماڵەکانیان لەناو ئێراندا، لە سنورەکانی پاوەو جوانڕۆو ڕەوانسەر بوون، و شەهیدی فەرماندە کاک قادر کۆکۆیی فەرماندەی تیپیان بوو، خاوەنی کادری بەتواناو لێهاتوو بوون، بەزۆری هاتوچۆی سنورەکانی هەورامان و هاوارو دەوروپشتی هەڵەبجەیان، ئەکردو چەند دەستەیەکیش بەسەر شاخی سورێنەوە بەسەرماو سۆڵەی زستاندا لە ئەشکەوتەکاندا ئەمانەوە، بۆ چاودێری و پەیوەندی لەگەڵ پێشمەرگە پارتیزانەکانی گەرمیان قەرەداغ و شارەزوورو گەیاندنی هەواڵەکانیان بەمەڵبەندی یەک، لەمەریوان دزڵی وەکو حەلقەیەکی پەیوەندی ئەمە بەردەوام بوو هەتا ڕاپەڕینی ١٩٩١.

٥- دەستەیەک کادری سیاسی و عەسکەری دڵسۆز لە (١٩٨٩/١١/١٣) بە مهمەیەک پێکەوە لەسنوری مەریوانی مەڵبەندی یەک و بلەکۆی مەڵبەندی دووەوە، بۆ شاربازێڕ، هەتا ئەگەنە سنوری دەوروپشتی نێوان دێی قرگەو وێڵەدەر، لەوێدا پیاوەکانی ڕژێم پێیان ئەزانن و بەهێزێکەوە چواردەوریان ئەدەن، دەستگیریان ئەکەن، کە ئەمە بوو بەداخێکی زۆر گەورەو لەو کاتەدا بەزیان و یەکجار ناخۆشیەکی ناو هێزی پێشمەرگەدانرا، دوای ئازارو ئەشکەنجە دانیان لەلایەن دەزگاکانی ئەمن و هێنەکانی ڕژێمەوە حوکمیان دان هەریەکەی بەحوکمی (هەتاهەتایی) دوایی ئازادکران لە ١٩٩٥/٥/٨ دا، ئەوانەیش ئەم کادرانە بوون:-

١- فخرالدین عبداللە حەمە سەعید هەورامی/تەوێڵەیی

٢- محمد ڕۆستەم محمد (حمە سیاسی)

٣- د. محمود کاکەبرا محمد کە بەداخەوە دوایی بەکارەساتێک شەهید بوو

٤- سەرکەوت قاجری

٥- کمال شێخ صادق پێنجوێنی

٦- مەلا بەکر ڕەسول موانی کە دوایی لە شەڕی ناوخۆ زۆر بەداخەوە شەهید بوو لە ساڵی (١٩٩٧) دا.

**پێشمەرگە پارتیزانەکانی سنوری شاربازێر:**

۱) ئەم پێشمەرگە پارتیزانانە بەچەند مانگێك پێش راپەڕین چوونە ئەم سنورەو بەرپرس و کادرو پێشمەرگەکانیش ئەمانە بوون:

۱- کاك سەرکەوتی کوبە بەرپرسی یەکەمی رەتڵی شاربازێر.

۲- کاك عەلی چەلەبی کە پێشتر وا بریار بوو لەگەڵ کاك رەئیس بڕوات.

۳- کاك رزگاری حەمەی کایش.  ٤- کاك نەوزاد محمد غەفور هەڵەبجەیی

٥- کاك دلێر مایاوایی.  ٦- اسماعیل.

۷- عەلی سۆیبە.  ۸- کاك هەڵۆ.

۹- دلێر.  ۱۰- شەهید باقی.

هەروەها دەستەیەکی تر کەئەم پێشمەرگە چاونەترسانە بوون:-

۱- کاك جەمال حاجی مامەندی

۲- شەهید مامۆستا یاسین کە بەداخەوە هەر لەو سنورەدا بەئەلغام شەهیدبوو.

۳- هێرش  ٤- شێخ ستار شێخ صاڵح

٥- وەستا جەبار  ٦- محمد مەجید (محمد شوکەیی)

وە مەفرەزەیەکی تر کە لەمانە پێك هاتبوون:-

۱- کاك کامل نوری  ۲- کاك یاسین سیتەکی

۳- هێرش  ٤- بێستون

٥- جوتیار  ٦- جەمال

۷- عبدالله  ۸- شەهید خالە بەکر کەڵەکنی

۹- حسێن  ۱۱- خالد

۱۲- سۆران

۲) وە لەم سنورەدا کاك عەبەرەق لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك لەوانە کاك صلاح و کاك سۆران، ئەمانە حەڵقەی پەیوەندی بوون لەنێوان سەرکردایەتی (کاك نەوشیروان)و رێکخراوی سلێمانیداو هەتا سازدانی راپەڕین دەوری خۆیان بینی زۆر ئازایانە..*

---

* چاوپێکەوتن لەگەل بەرێزان کاك رەئیس ،کاك دلاوەرو کاوەو کەمال پێنجوێنی، کاك سەرکەوتی ئاسایش. علی چەلەبی، شێخ مستەفا سیتەکی، دڵشاد قرگەیی، بەختیارو حمە کریم قرگەیی، ئازادو جەمال چاو شین وەنگەرێنەیی.

## پێشمەرگە پارتیزانەکانی ڕەتڵی سورداش

ئەم پێشمەرگەو کادرو فەرماندەییانە سەر بەسنورەکانی مەڵبەندی دوو بوون، لەو بەش و جۆرە پارتیزانانەی دوای ئەنفال بوون، کە لەماوەیەکی کەمدا دوای کشانەوەی هێزەکانی مەڵبەندەکەیان لەسنورەکانی قاسمە ڕەش و بناری قەندیل و لەسەر ڕۆشنایی فەرمانی سەرکردایەتی و بەتایبەت بەڕێز کاك نەوشیروان مستەفا بۆ ئاگاداری و چاودێری هێزەکانی ڕژێم و سنورەکانی ژێر دەسەڵاتیان، بۆ ئەم مەبەستانەو پێویستی ئەوکاتە، لە ڕۆژی (١/٦/١٩٨٨) شەهید غەریب هەڵەدنی ڕاسپاردەکرا کە بچێتەوە ناوچەکانی دۆڵی جافایەتی و سنوری سورداش، دەست پێکردنی قۆناغی پارتیزانی، ئەویش بە ئەوپەڕی ئلتزام و هەست بە لێپرسینەوە، بڕیاری گەڕانەوەی داو لەگەڵ ئەم کادرو پێشمەرگانەدا بەڕێ کەوتن کە ئەمانەن:-

١- شەهید غەریب هەڵەدنی (غريب عبدالقادر حاجی) بەرپرسی یەکەم (ڕەتڵ).
٢- عوسمان حەمە کاکی
٣- محمد حاجی کەریم ناسراو بە (سالار) هەڵەدنی
٤- د. تەها عبدالرحمن عزيز حاجی تانی
٥- ڕەسول محمد صاڵح هەڵەدنی
٦- جەلال حەمە صاڵح کاکە سوور تەلانی
٧- صاڵح احمد خالد یاخسەمەری
٨- خليل عمر محمد یاخسەمەری
٩- عەلی حەمە ڕەش یاخسەمەری
١٠- فەریق محمود بەگ هەڵەدنی، ف/دەستە

ئەم دەستە پارتیزانانە ماوەی (١٠) ڕۆژ لە گویزیلەو بناری ژیلوان و دۆڵی گەورە دێ و کانی پەڵك بوون، دوایی لە (٢٠/٦/١٩٨٨) گەڕاونەتەوە بۆ سنوری مەڵبەندی ٣ی هەولێرو جاری دووەم بەمەبەستی دەستەیەکی تری پێشمەرگەی پارتیزانی بۆ هەمان سنوروو لە ڕۆژی (١٠/١٠/١٩٨٨) لە پیرشێخی سەردەشتەوەو بۆ بێتوش و سنورەکانی هەرزنەو بێ ترخێ و شاخی ئاسۆس و بناری ژیلوان، ئەمانە هەتا (٨/٧/١٩٨٩) لەو سنورانەی دۆڵی جافایەتی و سورداش مانەوە، کارو چالاکی پارتیزان و سەردانی ڕێکخستنەکان و دۆستەکانیان داوە ئەوانیش بریتین لە:-

١- شەهید غەریب هەڵەدنی بەرپرسی دەستەکە (ڕەتڵ)

٢- عوسمان گێچینەیی ف/دەستە

٣- محمد حاجی کەریم

٤- علی حەمە محمد عەزیز

٥- جلال صالح کاکە سور

٦- بەرزان قادر خەڵوز

٧- خدر محمود جاف

٨- کامل صابر (سلێمانی)

٩- نوری عبدالله عبدالرحمن تەلانی

١٠- عابد علی خدر

وە لە ڕۆژی (١٩٨٩/٢/١٧) ئەم چەند پێشمەرگەیە لەهەمان سنورەوە گەیشتنە لایان، کە بریتی بوون لەم پێشمەرگە بەهیمەتو دڵسۆزانە لەو کاتە پێویستیەدا:-

١- عوسمان حەمە کاکی خاڵۆزای شەهید غەریب هەڵەدنی

٢- عومەر حەمە کاکی (برای)

٣- عوسمان محمد عەزیز هەڵەدنی

ئەمانە هەموو پێکەوەبوون، بەرنامەی پارتیزانیو ڕۆیشتنو پەیداکردنی خۆراك، چوون بۆ شوێنە مەبەستەکان، پاراستنی حەشارگەکانو پەیوەندی بە سەرکردایەتی بەم جۆرە ماونەتەوە هەتا(١٩٨٩/٧/١٤) گەڕاونەتەوە بۆ سەردەشت، ئەو ڕۆژەی د. قاسملۆی تیا شەهیدکراوە وەکو یادگارێکی پڕ لەکارەسات لەناو دەفتەری بەر باخەڵەکانیاندا نووسیویانە، دوایی بەمەبەستی حەوانەوە چونەتەوە لای خێزانو کەسوکاریان لەئوردوگای پیرشێخ لەنزیکی سەردەشتی ئێران، دەستەی سێیەمی پێشمەرگە پارتیزانەکانی ئەم سنورانە، لەڕۆژی (١٩٨٩/١٢/٢٠)ەوە جارێکی تر ماندوونەناسانە گەڕاونەتەوە کە ئەوانیش ئەم کادرو پێشمەرگانە بوون:-

١- شەهید غەریب هەڵەدنی هەروەکو بەرپرسی یەکەمو پاڵەوانی پێشمەرگەو فەرماندەی پارتیزانی.

٢- عوسمان گێچینەیی ئەم فەرماندەیەش لێهاتوانە ڕۆڵی خۆی بینیوە، لەگەڵ شەهید غەریبدا.

٣- د. تەها عبدالرحمن عەزیز حاجی تانی بەڕاستی پێشمەرگەی ڕۆژی سەخت بووە.

٤- تۆفیق محمد عبدالله ناسراو بە (توانا سوور) هەڵەدنی.

٥- جمعە حسێن فەرەج حاجی تانی.

٦- مەلا بەهادین سورداشی.

٧- نامیق حسێن یاخسەمەری.

٨- صدیق احمد خالد یاخسەمەری.

٩- خالە یاسین کەریم فەرەج حاجی تانی.

ئەم دەستە پارتیزانانەیش بۆ هەمان سنورەکانی دۆڵی جافایەتیو سورداش زۆر سەرکەوتوانە بەشداریان کردووە، هەتا ڕۆژی (١٩/١١/١٩٩٠) گەڕاونەتەوە بۆ سنورەکانی ئێران بۆ پشودان، جگە لەو دەستە پێشمەرگە پارتیزانانەی ئەم سنورە، ئەم پێشمەرگانە وەکو فەرماندەیەکی سەردەستە، هەمیشە لەو ماوانەدا لەو سنورەدا بوون بەخۆیانو چەند پێشمەرگەیەکی بەو توانا، لەئاستی باوەڕو متمانەدا بوون بەیەکتریو ئەو سەردەستانەیش ئەمانە بوون:-

١- عوسمان مام کەریم

٢- شوانە شەریف کەریم (شوانە موغاغی)

٣- فەریق محمود بەگ ف/دەستە

٤- عوسمان حەمە کاکی

٥- شەهید ئاکۆ سوور

٦- محمد سنگری

ئەم فەرماندەیە لەڕەتڵی کەرکوکەوە گەیشتنەوە ئەم سنورە، لەو ناوچانەدا پارتیزانیو هاتووچۆیان ئەکرد، ناوی پێشمەرگەکانی دەستەکەی عوسمانی مام کەریم ئەمانەن:-

١- صاڵح شارستێنەیی

٢- ڕزگار عمر یاخیانی

٣- زایر شارستێنەیی

٤- زایرە بچکۆل

وە پێشمەرگەکانی دەستەی کاك شوان موغاغی ئەم پێشمەرگانە بوون:-

١- ڕزگارە سوور جاسەنەیی

٢- ئاری مام ڕەزا جافەرانی ئێستا ئاری ئاسایش (ئەفسەر)

٣- هیوا

٤- محی الدین محمود جاسەنەیی

٥- ئاسۆس دوکانی

پێشمەرگەکانی دەستەی کاك عوسمان حەمە کاکی ئەم پێشمەرگانەن:-

١- بەکر مەجید حاجی هەڵەدنی

٢- ڕەسول محمد صالح هەڵەدنی

٣- تالب عبدالله خدر چالاوەیی

٤- هێمن حەمە صالح ئاوەژێ، دەستەکەی کاك فەریق محمود بەگیش ئەمانە بوون:-

١- حەمە خدر گا پیلونی

٢- ئەنوەر عوسمان یاخسەمەری

٣- تۆفیق سور هەڵەدنی ( توانا )

٤- بەکر مەجید

٥- صدیق احمد (سردار) یاخسەمەری

٦- صلاح محمد سەرگەلۆیی

دەستەکەی حەمە سنگری کە ئێستا فەرماندەیەکی عەسکەریە لەفەرماندەی شارباژێر ئەمانەن:-

١- شەهید بەکر محمود گەورەدێیی

٢- احمد صالح باڵخەیی

٣- وەستا صالح

٤- مام بەکر

٥- برهان عبدالرحمن مجید

٦- شەهید شەوکەت خدرحمە امین کانی مێویی.

دوایی ئەمانیش کۆمەڵێك کادری سیاسیو عەسکەری چونەتە خوارەوە، بۆ پەیوەندی کردن بەجەماوەرەو ڕۆڵی چاکیان هەبووە لەو سنورانەدا، هەتا سازدانی ڕاپەڕین لەوێ بوون کە ئەمانەن:-

١- کاك بێستون صابوراوایی چەند جارێك چوەتە خوارەوە.

٢- حەیدەر سەعید ڕەشید حاجی تانی

٣- ئەحمەد برنەو

٤- مامە قالە دۆڵەیی

٥- محمود صاڵح کاکە سوور تەلانی

٦- خاڵە کەریم سێکانیانی

٧- عوسمان شارستێنەیی

٨- محمد عبدالقادر حاجی برای شەهید غەریب هەڵەدنی.

هەروەها بەسەرپەرشتی هاوڕێ نوری و هاوکاری کاك محمد سەنگەری لە ساڵ و هاوینی ١٩٨٩ لە سنورەکانی بێدەڵان و سونێ کۆمەڵێك ئیشیان پێسپێردراوە، حەیدەر حاجی تانی، دوایی گەیشتۆتە لایان، پێشمەرگەکانی شەهید کاك ئاکۆ سوریش بریتی بوون لەم پێشمەرگانە:-

١- فخرالدین ناوشوانی

٢- نقیب کەرکوکی

٣- شەهید ئاواتە ڕەش

٤- شەهید وریا گەرمیانی

٥- خاڵە بەخە (بەختیار) گەرمیانی

کۆمەڵێك پێشمەرگەو کادری بەهیمەت هاوکاری تەواوی ئەم پێشمەرگە پارتیزانانە بوون، بۆ بەڕێ کردنیان و شارەزاییان و گەیاندن و ئامادەکردنی پێویستیەکانیان، ئەو ڕۆڵە دڵسۆزانەیش ئەمانە بوون:-

١- شەهید بەکر قادر ئیسیۆیی

٢- شەهید مامۆستا مەهدی قەڵادزەیی

٣- عبداللە گەناوی

٤- حەمە هەژار گەناوی

٥- هێدی چاوشین گەناوی

٦- حەسەن گەناوی

بەم جۆرە پێشمەرگە پارتیزانەکانی ئەم سنورە بەناوی (ڕەتڵی سورداش) بەردەوام لەسنورەکانی خۆیاندا بوون، بەسەرپەرشتی و فەرماندەیی شەهیدی پارتیزانی کاك غەریب هەڵەدنی، کە لەو کاتانەشدا بوو ئەو بەردە بە شوێنەوارە مێژووییە دێرینەی دۆزیەوە، بە ئەوپەڕی چاوی بەئومێدی ئازادی کوردستان و بەکارهێنانی لەشوێن و مۆزەخانەکانیدا، زۆر لەئاستی مرۆڤێکی زانست و پێشکەوتووخواز پاراستی، ئاواتەکەی هاتەدی و هەموو کوردو شۆڕش شانازی بەخەباتی ئەم فەرماندە پارتیزانەوە کرد کە لەخێزانێکی جوتیاری هەژاری ئەم گەلەیەو ئەوەندە دووربین و دڵسۆزی گەلەکەی بووە، درێژەیشی بەخەباتی

خۆی داوە، لەگەڵ کادرو هاوڕێ پێشمەرگەکانیدا بەگشتی بونەتە بنەمایەك و گیانێکی پڕ لە هەستی بزوێنەر، بۆ یەکەم پزیسکەی ڕاپەڕین تەنیا ڕاگەیاندنەکەی کاتەکەی دیاری بکرێت، هەر ئەو هەموو ماندوبون و بەسەربردنی ڕۆژگارە سەختەی پارتیزانەکان بوو بەفاکتەری ڕاپەڕین و سەرکەوتنی، بەیەك دەنگ و یەك ڕیزی جەماوەرو بە کەمترین هۆکاری پێویستی بەگژا چونەوە، لەیەك ساتدا توانیان گەورەترین هێزو توانای ڕژێمی داگیرکەر لەسەر خاکی نیشتیمان پاك بکەنەوە..*

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێز عوسمان حمە کاکی.

# پێشمەرگە پارتیزانەکانی دوای ئەنفال (ڕەتڵی کەرکوك)

ئەم پێشمەرگەو فەرماندەو کادرە سیاسیانە سەر بەتیپی ٢١ی کەرکوك بوون، کە کاك (سیروان ی کوێخا نەجم) فەرماندەی تیپیان بووە، لەکاتی پارتیزانەکەیشدا هەر کاك سیروان سەرپەرشتی پارتیزانەکانی ئەم سنورە بووە، بەناوی پارتیزانەکانی (ڕەتڵی کەرکوك) کە سنورەکەیان بریتی بووە لەناوچەکانی: هەردوو شوانی خاسە، ناوچەی چەمچەماڵ، ئاغجەلەر، قەڵا سێوکە، هەردوو شێخ بزەینی خواروو سەروو، ساڵەیی، لەدوای هێرشەکانی ئەنفالی ٤ ی سنورەکانی دەشتی کۆیە بەگشتی چونەتە سنوری مەڵبەندی ٣ بەمەبەستی هاوکاری و بەرگری لە شەڕو هێرشەکانی ڕژێم لە ئەنفالی (٥،٦،٧) ی ئەو سنورەدا، لەناوچەی شێخ وەسانان و دەرەشێرو شاخی کەژ وەست، لە مانگی ١٩٨٨/٥ بۆمانگی ١٩٨٨/٧ بەشداریان کردوە، بارەگای تیپیان لە مەلەکان بووە، لەم هێرش و بەرگریانەدا لەگەڵ تیپەکانی کاك عبداللە بۆرو کاك سعیدی حمەزیادی ئەوکاتە بوون کە فەرماندەی تیپ بوون.

لە (١٩٨٨/٧/٦) چەند دەستەیەکی ئەم تیپە بەفەرماندەو کادرو چەندەها پێشمەرگەوە زۆر مەردانە گەڕانەوە سنورەکانی پێشوی خۆیان، لەسنوری کەرکوك، لەشوان و شێخ بزەینی و شوێنەکانی کەیان، هەندێ حەشارگەیان چاك کرد بۆ کاتی خۆشاردنەوە، لە کێوماڵەکانی هێزەکانی ڕژێم دا لەبەر ئەوەی ئەم سنورە لەسنورەکانی شاری کەرکوکەوە نزیك بوو، لەهەموو شوێنەکانی تر زیاتر هێزی ڕژێمی تیابوو، هەروەها پێویستی حەشارگەکانیان بۆ پاراستنی پێویستی خۆراکیان و دوای ئەوەی پێکهاتەی ڕەتڵەکەیان سازدا، بەپێی لێهاتوویی، تواناو شارەزایی پێشووی کادرەکان و خۆڕاگری لە ئەزموونی پارتیزانی دا، بەتایبەت لەم کاتە سەخت و شوێنە چۆڵەوانیەدا، بەو شێوەیە هەموو ڕەتڵەکەیان کرد بەم چەند دەستەیەوە، بەسەرپەرشتی کاك سیروانی کوێخا نەجم و لەم چەند دەستانە پێك هاتن :-

١) دەستەی یەکەم: دەستەی وەستا سابر کە پێشتر فەرماندەی کەرت بوو لەگەڵ ئەم پێشمەرگانە:

١- لەتیف ناصح احمد
٢- حسن عبدالرحمن (حسن شورتە)
٣- علی محمد
٤- یونس احمد (یونس قەنات شەوگێری)

٥- خدر امین
٦- محمد که‌ریم گه‌لۆزی
٧- ته‌یمور صالح (جوامێر) برای وه‌ستا صابر
٨- ڕه‌زا ناروجه‌یی
٩- عمر مغرب
١٠- ڕه‌نجه عمر صدیق (رابه‌ر سیاسی تیپ) بوو پێشتر
١١- محمد تۆفیق که‌رکوکی
١٢- لاوه کوێخایابه
١٣- جاسم صالح صالح
١٤- کاکه ئه‌حه
١٥- رفعت اسعد (عدد جهان)
١٦- عمر احمد ناسراو به (عوته)

٢) ده‌سته‌ی دووه‌م: به به‌رپرسێتی حاجی هه‌ڵمه‌ت که فه‌رمانده‌ی که‌رت بوه له‌تیپ و پێشمه‌رگه‌کانیش ئه‌مانه بوون :-

١- محمد که‌ریم
٢- کاکه مه‌د محمد صالح ( خاڵه به‌خه )
٣- تحسین یاسین ( ئالاّ )
٤- فوئاد قادر
٥- صباح که‌رکوکی
٦- عوبێد ( جوتیار )
٧- نازم عوسمان بیره سپانی
٨- سامان که‌رکوکی
٩- عمر زه‌علان

٣) ده‌سته‌ی سێیه‌م: به‌سه‌رپه‌رشتی عه‌لی چیمه‌نی که پێشتر فه‌رمانده‌ی ده‌سته بوو له‌گه‌ڵ ئه‌م پێشمه‌رگانه‌دا:-

١- ئارام چیمه‌نی
٢- خلیل عبدالله تۆماری
٣- ابراهیم فازل ئیباو
٤- عبدالله ته‌په کوره‌یی

٥- زاد چیمەنی
٦- سلاح چیمەنی
٧- سەرکەوت چیمەنی
٨- خلیل مام ڕەش
٩- محی الدین مام ڕەش
١٠- عەبە خڕە

٤) دەستەی کاک سیروان خۆی: کە چەند پێشمەرگەیەکی بەتوانای لەگەڵدا بوو، بەمەبەستی باشتر هەڵسوڕاندن و سەردانی دەستەکانی ترو ئەم پێشمەرگانەیش بریتی بوون لە: -

١- سەربەستە درێژ
٢- عمر کۆچەکی
٣- شەهید خیرالله سعید(جوتیار)
٤- شەهید نەجات کۆچەکی
٥- شەهید ابراهیم احمد خدر کادری ڕێکخستن (سەرکەوت)
٦- شەهید نیزام الدین محمد
٧- حمە تیژەیی
٨- شەهید شەوکەت عبدالله حمە ڕەش
٩- عوسمان عبدالرحمن (کوردۆ)
١٠- جمال حسێن میرزا

جگە لەم دەستانە چەند دەستەیەکی تری پێشمەرگەی پارتیزانی، لە سنورەکانی خاڵخاڵان، بەناوی (یەکەی خاڵخاڵان)، هەریەکە بەناوی ژمارە یەك، ئەوانیش بریتی بوون لەم دەستەی کادرو پێشمەرگانە:-

١- عادل شەریف بەرپرسی یەکەکە
٢- وریا ئاغجەلەری بەرپرسی ڕێکخستن
٣- سیروان گۆگجەیی کە پێشتر فەرماندە کەرت بوو
٤- هیوا ڕەش عبدالله
٥- شەماڵ حسێن مەجید (بەرپرسی ڕێکخستنی شۆڕشگێڕان)
٦- اسماعیل شەریف
٧- محمد سەلیم (هێمن)

٨- شێرزاد عریف ڕەمەزان: لەدواییدا لەگەڵ مام ڕۆستەم چوە سنوری گەرمیان، لەلێدانی كاك ئازادی سەرگرمەدا بەفڕۆكە شەهید بوو.

٩- حەمە تەیارە

١٠- تایەر عوسمان صاڵح (د٠ تایەر)

١١- غەریب بێدەری

دوای تەواوبوونی هێرشەكانی ئەنفالی مەڵبەندی ٣ ی هەولێر، نزیكەی (١٢٥) پێشمەرگە چونەتە خوارەوە، بۆ هەمان سنور بەسەرپەرشتی كاك (ڕەوەند)، كە ئەو كاتە فەرماندەی كەرت بوو، لەگەڵ سەرباز كاكە ڕەش، جێگر كەرتو دلێرە قەڵەوو شۆڕش علی محمود جێگر كەرتو كاروان دوبزی، دوای ماوەیەك لەم چەند دەستەو یەكەو پێشمەرگەی ئەم سنورە بەگشتی لەگەڵ (كاك سیروان كوێخا نەجم) ئەم كادرو پێشمەرگانە مانەوە:-

١- سەربەستە درێژ

٢- جمال حسێن میرزا

٣- كاروان دبسی

٤- عوسمان عبدالرحمن (كوردۆ)

٥- جمال حەسەن میرزا

٦- شەهید ئاكۆ سور (ڕەمەزان احمد) ئاكۆ سوور فەرماندەی یەكەی شێخ بزەینی بوو.

٧- نقیب ناسیح

٨- شەهید یونس احمد

٩- شەهید خاڵە بەخە

١٠- علی ئارونجەیی

١١- حەسەن شورتە

١٢- ڕەحمان عومەر سەربیریە

١٣- كاروان عبدالله دبس

١٤- نەهرۆ محمد

١٥- تالیب فاروق

١٦- هێرش حەسەن

١٧- هیوا محمد

ئەمانە بەگشتی هەتا مانگی ١٩٨٨/١٢ مانەوە، دوا دەستەی سەر خاصە کە کاک حەمە سەقەر بەرپرسیان بوو، ئارام چیمەنی جێگری بوو، دەستەکەیش بریتی بوون لە:-

١- مدیر حەسەن حسێن چیمەنی
٢- ئیباو (ابراهیم فازل)
٣- خلیل تۆماری
٤- پۆلا هەیبەتی

ئەمانیش لەمانگی ١٩٨٨/١٢ گەڕانەوە بۆ ناو سنورەکانی ئێران، لە ساڵی ١٩٨٩ لە هاویندا دەستەیەك هاتنە خوارەوە بۆ هەمان سنورو سەردانی سنورەکانی سورداش‌و دۆڵی جافایەتی، بۆ زیاتر حەوانەوە لەگەڵ پارتیزانەکانی شەهید غەریب هەڵەدنی، ئەم دەستەیەش بریتی بوون لەم پێشمەرگانە:-

١- ئاکۆ سور بەرپرسی دەستە (یەکە)
٢- نقیب ناسح
٣- حەسەن شورتە
٤- شەهید ئاوات ڕەشید
٥- تالیب فاروق
٦- شەهید یونس احمد
٧- وریا قەفاری
٨- خاڵە بەخە (بەختیار محمد صالح)

بۆ مێژوو ئەم پێشمەرگەو کادرانە لەو کاتانەی پێشمەرگە پارتیزانەکانی ئەم سنورانە زۆر هاوکاری تەواویان کردوون، بەڕۆڵێکی دیارو ئاشکرایان بووە ئەوانیش بریتی بوون لە: ١- شەهید سوارە ئیلینجاخی ٢- لەتیف ناسیح ٣- چەتۆ ساڵح برای شەهید د ٠ هادی کرکوکی، کە خاوەنی زۆرترین برای شەهیدە لەم شۆڕشەدا، بەگشتی شەهید فەرماندەی ڕەتلی سورداش شەهید (غەریب هەڵەدنی) هاوکاری‌و ڕێنمایی ئەکردن لەکاتی هاتنە خوارەوەو چوونە سەرەوەیان‌و حەوانەوەیان لە سنورەکەدا.*

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێزان سیروان کوێخا نەجم، کاک کوردە.

## پێشمەرگە پارتیزانەکانی
## سنورەکانی مەڵبەندی ٣ ی هەولێر ( رەتڵی هەولێر )

دوای ئەوەی بە بەرنامەیەکی گونجاو، بەدراسەو راوێژکردنی چەند کۆبوونەوەی بەرپرسان و فەرمانەدەو کادرە سیاسی و عەسکەریەکانی سنوری مەڵبەندی ٣ی هەولێر، لەهەمان کاتدا دەربازکردنی تەواوی جەماوەری هاوڵاتی و دانیشتوانی دێکانی سنورەکەو رزگاربوونیان لەمەترسی هێرشی رژێم، ئینجا سەرکردایەتی و بەرپرسانی مەڵبەند بریاری کشانەوەی هێزەکانیان دا، بە بەرنامەیەکی رێك و پێك، ئاگاداری هەموو هێزەکان لە (١٩٨٨/٨/٢٨) بەتەواوی دەستیان پێکرد بە پەرینەوە لەجادەی خانەقاوە، بۆ بناری قەندیل و سەر شاخی کونەکۆترو سەرکەوتوانە ئەنجامیان دا، لەگەڵ دارشتنی بەرنامەی کشانەوەیانداو لەهەمان کاتدا بریاری مانەوەی چەند فەرمانەدەو کادرێکی سیاسی و عەسکەری، هەریەکە بە دەستەیەکی پێشمەرگەی بەتواناو خۆراگرەیاندا، بەمانەوەیان هەر دەستە بەپێی شوێن و سنوری شیاو بۆ ئیشەکانی و توانای مانەوە، خۆپاراستنیان تیایاندا لەو سەرکردەو کادرو دەستانەش ئەمانە بوون، کە بەکاری پێشمەرگایەتی پارتیزانی راستەوخۆ مانەوە بریتی بوون لە:-

١- شەهیدی سەکردە حەسەن کوێستانی لەگەڵ شەهید رەحمان سەیدەو صلاح دیلمانی لەسنورەکانی شاخی کاروخ و مەلەکان، بەنزیکی (٣٠) سی پێشمەرگەوە، بەجۆری پێکهێنانی چەند دەستەیەك.

٢- مامۆستا رێبوار اسماعیل بەچەند پێشمەرگەیەکەوە، لەسەرەتادا ئەرکی شاردنەوەی چەند پارچە چەکێکی پێ سپێردراوە، دوایی پەیوەندی بە رێکخستنە نهێنیەکانی ئەو سنورەوەو دارشتنی بەرنامەی ئیشکردنی پێویست لەوکاتەدا.

٣- رەحمان حاجی خدر ئەوکاتە جێگری تیپی کاروخ بوو بەنهێنی ژمارەیەك لە سنوری هەڵەموون.

٤- هەر لەسەرەتاشدا مامۆستا بێستون (خدر)و کاك رێبین و کاك وشیارە سوور. ئەمانە بەزۆری کادری وریای سیاسی و رێکخستن بوون، توانیان ئەو ماوەیە بە سەرکەوتوویی بمێننەوەو ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام بدەن.

٥- شەهید رێبازیش وەکو فەرمانەدەیەکی عەسکەری لێهاتوو سەرپەرشتی کۆمەڵێك کادری عەسکەری و چەند دەستە پێشمەرگەی خاوەن ئەزموون و بەتوانا، هەر لە

(١٩٨٨/٨/٢٧)ەوە بەرێکەوتن لەدەشتی هەولێرو زۆربەی سنورەکاندا، ئەو کادرانەیش بریتی بوون لە:

| | |
|---|---|
| شەهید مەلا سلێمان | ئەحمەد خدر |
| جەلال ئیلینجاغی | ئازاد محمد |
| هاشمی جهاز (بێ سیم) | ئارام چاوشین |
| برهان سعید صۆفی | سەید غەوسە |
| ئاسۆ معلیم | عەباس عەوێنە |
| ئاسۆ ئەڵمانی | محمد سوسەیی |
| ئەبو زەید تەها | ئیدریس مەسیفی |
| مامۆستا ڕەنجە | غازۆ عەدۆ |
| شەهید سۆران | |

ئەمانە بەدەستە دەستەی بچوک، پەیوەندی بەردەوامی پێکەوە جەولەی تەواویان بەسنورەکاندا ئەکردو پەیوەندیان بەجەماوەرەوە ئەکرد، تەنانەت سەردانی کۆمەڵگا زۆرەملێکانیان ئەکرد، لەوانە:- (بەستۆرە، بنەسڵاوە، دارەتوو، مەلا ئۆمەر، پیرزین، کەسنەزان)، پەیوەندیان بەکەسانی دڵسۆزو کوردپەروەرەوە ئەکرد، هەندێ جاریش کۆبوونەوەیان ساز ئەداو تا ڕادەیەك ورەی جەماوەرەکەیان بەرز کردبووەوەو ترپیان بەشەوەزەنگی ترس و تۆقاندنی دەزگاکانی ڕژێم هێنا بوو، ئەمانە هەرچەند بەیناو بەین ئەگەڕانەوە بۆ لای سەرکردایەتی لە قاسمەڕەش، بەڵام بەردەوام هەتا کاتی ڕاپەڕین سەریان لەم سنورانە ئەدایەوە، بەشێوەی پارتیزانی هەمیشە ترس و لەرزیان خستبووە ناو هێزەکانی ڕژێم..*

---

چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێزان مامۆستا رێبوار ، بێستون.

## پێكهێنانی سوپای رزگاری كوردستان ( سرك )

له‌دوای كۆتایی هێرشه‌كانی ئه‌نفالی ڕژێمی عێراق و ڕۆیشتنی هێزه‌كانی پێشمه‌رگه‌ی كوردستان بۆ دیوی سنوره‌كانی ئێران‌و سازدانه‌وه‌یان، بۆ هه‌ندێ جوڵاندن‌و كاری ڕێكخستنه‌كانی ناوه‌وه‌ی ژێر ده‌سه‌ڵاتی ڕژێم، بیر له‌پێكهێنانی ده‌زگایه‌كی شێوه چه‌كداری حزبی له‌ناو ڕێكخستنه به‌تواناكاندا كرایه‌وه، له‌لایه‌ن سه‌ركردایه‌تی (ی.ن.ك)ه‌وه به‌تایبه‌ت به‌ڕێزان كاك نه‌وشیروان مسته‌فا سه‌رپه‌رشتی ئه‌كردن، دوایش كاك مسته‌فای سه‌ید قادر، له‌ده‌سته‌و پێشمه‌رگه‌كانی شاره‌زووردا ئه‌مانه به‌شێوه‌ی تیپ‌و ده‌سته ڕێك‌و سازكران، هه‌ر ده‌سته‌یه‌ك به‌رپرسی خۆی هه‌بوو، ئه‌مانه به‌ناوی سوپای ڕزگاری كوردستان (سرك) ده‌ست به‌كاربوون، ل ڕۆژی (١٩٨٨/١١/١٥) دا بڕیاری دروست بونیان درا، له‌سنوره‌كانی شاره‌زوور به‌ناوی تیپی سركی ژماره (٣) ی تایبه‌ت، كه له‌لایه‌ن شه‌هید هاوڕێ شه‌ماڵ (حه‌مه ڕه‌حیم حه‌سه‌ن) سه‌رپه‌رشتی ئه‌كرا، له‌گه‌ڵ لیژنه‌یه‌ك‌و چه‌ند ده‌سته‌یه‌ك به‌م جۆره بوو:-

١- هاوڕێ شه‌ماڵ: شه‌هید حه‌مه ڕه‌حیم حه‌سه‌ن ڕه‌سوڵ، پێنجوێنی به‌رپرسی یه‌كه‌م بوو بۆ كڕینی چه‌ك له‌جۆری میكارۆف‌و كاك شه‌ماڵ ڕۆیشت بۆ (كه‌لاری گه‌رمیان)، له ڕۆژی (١٩٨٩/٧/٧) له‌وێ له‌لایه‌ن خۆفرۆشێكه‌وه ده‌ستنیشان كراو گیرا، له ده‌زگای ئه‌منی كه‌لار، دوایی له‌گه‌ڵ ئه‌و كۆمه‌ڵه كادره‌ی له‌ناو شاری سلێمانیدا یه‌كیان پێ‌گرتنه‌وه، ئه‌م هاوڕێیه به‌تواناو دڵسۆزه‌یان حوكمی له سێداره‌دان دا، له‌گه‌ڵ كاك جه‌باری حاجی ڕه‌شیدو هاوڕێكانی، دوای ئه‌وه سه‌رپه‌رشتی سركه‌كان له‌ناو سه‌رپه‌رشتی ڕێكخستنی پۆلی شاره‌زوور به‌سه‌رپه‌رشتی حه‌مه نوری‌و حه‌مه ڕه‌شید باریكه‌یی‌و فارس عه‌زیزو عوسمان ئه‌مه‌لی هه‌تا نزیكی ڕاپه‌ڕین، له‌كاتی ئاماده‌یی‌و سازدانی ڕاپه‌ڕینیش، له‌ناو جه‌ماوه‌ری ئه‌و سنوره‌ی شاره‌زوورو دۆسته چه‌كداره‌كان توانیان (١٤) ده‌سته‌ی چه‌كدار دروست بكه‌ن به‌مه‌به‌ستی سازدانی ڕاپه‌ڕین، به‌ناوی ده‌سته چه‌كداره‌كانی (شاڵاو) وه له‌كۆمه‌ڵێك كه‌سانی به‌هیمه‌ت‌و خاوه‌ن دڵسۆزی ئه‌وكاته له‌ناویاندا:

١- به‌كری ده‌لاك ٢- حه‌سه‌ن مامه‌قادر گه‌رمیانی سه‌یدسادقی ٣- مامۆستا عه‌زیز حه‌مه ئه‌مین ٤- به‌كر سه‌رسپی ٥-ئه‌حمه‌د كوڵكنی كه‌ڕۆڵی چاكی هه‌بووه ٦-حاجی قادر ئه‌مه‌لی ٧- جلال حاجی كاكه‌لی شانه‌ده‌ری ٩- ناجح حاجی قادر گرده‌نازێیی.

ئه‌مانه له‌كاتی ده‌سته چه‌كداره‌كانیشدا هاوكاریان كردووه، له‌ناو شاری سلێمانیشدا كاك سامی جافه‌رانی‌و خێزانه‌كه‌ی‌و شێخ تایه‌ر سوڵه‌یی ڕۆڵی به‌رچاوو مه‌ردانه‌یان هه‌بوو، له‌نێوان ڕێكخستنه نهێنیه‌كان‌و سركه‌كاندا، له ٧(١٩٨٩/٣/) له ناو شاری

سلێمانیدا دەزگا ئەمنە سەرکوت کەرەکانی ڕژێمی بەعسی عێراق (٥) پێنج هاوڵاتیان گوللەباران کرد، هەریەکە بە (١٨) هەژدە فیشەك، لەخوار زیندانیەکەی سلێمانی بە بەرچاوی خەڵکەوە، زۆر بێئابڕوانە، کەسە خۆفرۆشەکانی ناو ڕژێم بە دەسکەوتەوە خۆیان پێوە هەڵ ئەکێشا، هەروەکو پیشەی خۆفرۆشیان و خەڵکی شارەکەیش نەفرەتیان لێ ئەکردن.. وە بۆ مێژووی بزووتنەوەی ڕزگاری گەلی کوردمان ڕۆڵی جوامێرانەو بوێرانەی کاك حەمە ڕەشید حاجی شەریف باریکەیی شارەزووری بەدوایدا کاك حەمە نوری گەرمیانی، کە حەلقەیەکی پەیوەندی زۆر پتەوو هاوکاری بوون لەنێوان ڕێکخستنە سرکەکان و سەرکردایەتی ئەوکاتەو پێشمەرگە پارتیزانەکانی ناو سنورەکانی گەرمیان و قەرەداخ، گەیاندنی هەموو هاوکاری و پێداویستیەکی خواردەمەنی و پزیشکی و شتی تر، هەروەها ڕۆڵی بەتواناى کاك شێخ صدیق بەرزنجی وەکو برین پێچێك بەناوی (دکتۆر محمود) بۆ چارەسەرکردنی برینەکانی کاك ئازادی سەگرمە بۆ ماوەی نزیکەی ٣ هەفتەکە، بووە هۆی سەندنەوەی ژیانی لەمەرگ، لەوکاتە سەخت و ناهەموارەدا، ئەم هاوکاریانەی دەستە پارتیزانەکان لەرێگای دەواجنەکەی کاکە حەمەی وەلی کەلاری و ئازایەتی مامە خەلیفە کەلاری و ئەبو عەلی خەڵکی کفری و چەند کەسانێکی زۆر بەهیمەت و دڵسۆزانی کوردو شۆڕش و پێشمەرگە لەوکاتەدا بۆ مێژوو.

هەر ئەم دەستە سرکە توانیان بەهاوکاری کاك (صالح حمە خان) کە کاك ئازادی سەگرمە بگەیەننە بەغداد بۆ چارەسەرکردن و هێناوەیی و گەیاندنی بەسنوری ئێران، بەسەرکردایەتی پێشمەرگەی کوردستان (ی.ن.ك)وە، لەوێشەوە توانیان بیگەیەننە دەرەوەی وڵات، بۆ چارەسەرکردنی تەواوی، چونکە برینەکانی زۆر سەخت بوو، کاتێك گەیشتە ئێران و ناو هێزی پێشمەرگە، بەسەرکەوتنێکی زۆر گەورە تۆمارکراو مایەی دڵخۆشی و ئومێدێکی سەرکەوتن بوو، بۆ هێزی پێشمەرگەو جەماوەری گەلی کورد زیندوو کرایەوە.

ئەم داستانە تەنیا لەتوانای ئەم ڕۆڵە بەهیمەت و تێکۆشەرو دڵسۆزانەی کوردو قاڵبووی خەبات و گیانی شۆڕشگێڕی ئەو کاتەدا بەدی ئەکرێت. لێرەدا گەلی کوردو کادرەکانی دڵیان زیاتر بەپاشە ڕۆژی گەل و شۆڕشەکەیان خۆشتربوو، ئاسۆی ڕووناکترو سەرکەوتن تیا بەدی کرا، لێرەدا بەڕاستی ڕۆڵی هەرە دڵسۆزی و توانای کەسانی وەکو (صالح حمە خان) و براکانی و ئەو کادرە پڕ لە وورانە دەرئەکەوێت بۆ مێژوو.

## ناوی سیانی پێشمەرگەکانی سوپای ڕزگاری کوردستان (سرك)
## لەسنوری سلێمانی - دەربەندیخان – کەلار

| ز | ناوی سیانی | شوێن | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١ | نوری احمد حمید گەرمیانی | کلار | فەرماندەی سوپای سرك |
| ٢ | فارس عزیز محمود | سلێمانی/شارەزوور | فەرماندەی تیپ |
| ٣ | محمود حاجی صالح | سلێمانی | ج/یەکەم تیپ |
| ٤ | عوسمان مجیدحسن نەمەلی | سلێمانی | ج/دووەم تیپ |
| ٥ | خالید قادر محمد | سلێمانی | فەرماندەیی مەفرەزە |
| ٦ | عومەر رحیم محمود | سلێمانی | پ.م |
| ٧ | عیمان حمەرشید احمەد | سلێمانی | پ.م |
| ٨ | ناصرمحمود شریف | سلێمانی | پ.م |
| ٩ | صدیق عوسمان معروف | سلێمانی | فەرماندەی مەفرەزە |
| ١٠ | شێخ صدیق بەرزنجی | سلێمانی | پ.م |
| ١١ | عومر عزیز محمود | سلێمانی | پ.م |
| ١٢ | ئیبراهیم محمەد ئەمین محمود | سلێمانی | پ.م |
| ١٣ | جەزا حمە فتاح کریم | سلێمانی | پ.م |
| ١٤ | عومەر احمد محمد سەعید | سلێمانی | فەرماندەی مەفرەزە |
| ١٥ | محەمەد احمد مستەفا | سلێمانی | پ.م |
| ١٦ | کەریم عوسمان حمە سور | سلێمانی | پ.م |
| ١٧ | احمد عوسمان احمد | سلێمانی | پ.م |
| ١٨ | توفیق عزیز حمە | سلێمانی | پ.م |
| ١٩ | عبدالله عبدالرحمن کەریم | سلێمانی | پ.م |
| ٢٠ | عومەر عبدالله عزیز | سلێمانی | پ.م |
| ٢١ | عبدالله احمد عبدالقادر | سلێمانی | پ.م |
| ٢٢ | سامی جمال قەرەداغی | قەرەداغ/ جافەران | فەرماندەیی تیپ |
| ٢٣ | هیوا محمود | سلێمانی | پ.م |
| ٢٤ | لەتیف ئەحمەد قادر | سلێمانی | پ.م |
| ٢٥ | حەیدەر محمەد قادر | سلێمانی | پ.م |
| ٢٦ | سیروان صادق محەمەد | سلێمانی | پ.م |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٧ | ڕزگار ئەحمەد قادر | سلێمانی | پ.م |
| ٢٨ | تاهیر لەتیف کاکە حمە | سلێمانی | فەرماندەیی تیپ |
| ٢٩ | علی حمە شریف | سلێمانی | پ.م |
| ٣٠ | هێرش حسن محی الدین | سلێمانی | پ.م |
| ٣١ | قادر احمد بارام | سلێمانی | پ.م |
| ٣٢ | صدیق سەعید ئەحمەد | کفری | ج/فەرماندەیی تیپ |
| ٣٣ | شەهاب ئەحمەد محی الدین | کفری | فەرماندەیی مەفرەزە |
| ٣٤ | مجید قادر علی | کفری | پ.م |
| ٣٥ | نوری سعید احمد | کفری | پ.م |
| ٣٦ | ئەنوەر محمد عبدالرحمن | کفری | پ.م |
| ٣٧ | خەلیل ابراهیم | کفری | پ.م |
| ٣٨ | محەمەد حمە ئەمین | کفری | پ.م |
| ٣٩ | فایەق حسن ئەحمەد | کفری | پ.م |
| ٤٠ | نازم محەمەد سلێمان | کفری | پ.م |
| ٤١ | ساڵح حمەخان کریم | دەربەندیخان | فەرماندەیی تیپ |
| ٤٢ | قادر صالح عزیز | دەربەندیخان | پ.م |
| ٤٣ | کەمال قادر فەتاح | دەربەندیخان | پ.م |
| ٤٤ | علی قادر فەتاح | دەربەندیخان | |
| ٤٥ | مجید حمە خان کریم | دەربەندیخان | پ.م |
| ٤٦ | یەحیا ئەحمەد حمە | دەربەندیخان | پ.م |
| ٤٧ | فەتاح شەوکەت ڕەشید | دەربەندیخان | پ.م |
| ٤٨ | نوری حمە خان کریم | دەربەندیخان | پ.م |
| ٤٩ | سەلاح ئەحمەد حمە | دەربەندیخان | پ.م |
| ٥٠ | ئیبراهیم عەزیز فارس | دەربەندیخان | پ.م |
| ٥١ | محەمەد جلال | دەربەندیخان | پ.م |
| ٥٢ | بورهان حسێن علی | دەربەندیخان | پ.م |
| ٥٣ | ئەحمەد حمە خان کریم | دەربەندیخان | پ.م |
| ٥٤ | واحید حمە خان کریم | دەربەندیخان | پ.م |
| ٥٥ | علی محەمەد شاسوار | کەلار | ف/تیپ |
| ٥٦ | فایەق توفیق | کەلار | ف/مەفرەزە |
| ٥٧ | جومعە مجید | کەلار | ف/مەفرەزە |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٥٨ | حەمید علی محمەد | کەلار | پ.م/مام نەریمان |
| ٥٩ | کەریم حسن ئەحمەد | کەلار | پ.م |
| ٦٠ | ئەحمەد علی عوسمان | کەلار | پ.م |
| ٦١ | کەریم ڕۆستەم | کەلار | پ.م |
| ٦٢ | کامەران عبدالله | کەلار | پ.م |
| ٦٣ | فاروق محمەد | کەلار | پ.م |
| ٦٤ | ئەحمەد حسن محمەد | کەلار | پ.م |
| ٦٥ | حەمید علی محمەد | کەلار | پ.م |
| ٦٦ | جەلال ئەحمەد | کەلار | پ.م |
| ٦٧ | حسن ئیبراهیم ئەحمەد | کەلار | ف/مەفرەزە |
| ٦٨ | بەختیار محمەد سالح | کەلار | پ.م |
| ٦٩ | ئەبوبەکر ئەحمەد محمود | کەلار | پ.م |
| ٧٠ | علی عبالقادر حسن | کەلار | پ.م |
| ٧١ | ئیسماعیل ئیبراهیم مەردان | کەلار | پ.م |
| ٧٢ | کامەران عباللە محمەد | کەلار | پ.م |
| ٧٣ | جەلال عبداالله محمەد | کەلار | پ.م |
| ٧٤ | جەلال عبدالله محمەد | کەلار | پ.م |
| ٧٥ | ئەحمەد شەوکەت ڕۆستەم | کەلار | پ.م |
| ٧٦ | محمەد محمود ئەمین | کەلار | پ.م |
| ٧٧ | کەریم عبدالمجید | کەلار | ف/مەفرەزە |
| ٧٨ | عومەر مام فەیزولا | عەربەت (زەردەشت) | پ.م |
| ٧٩ | عەبدولا رەشید پوشێنی | | |

# پێکهێنانی ( سرك ) لە سنوری شاری هەولێر

هەروەکو شوێنەکانی تری کوردستان لەمانگی (١٩٨٨/١١) پێکهێنانی (سرك) لەسنوری شاری هەولێریش بڕیار درا، لەناو هەڵبژاردەی ڕێکخستنە چۆنایەتیە بە تواناکاندا بۆ ئەم بوارە، لەم کاتەدا کاك (مەلا قادر) سەرپەرشتی ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناوشار بوو، کاك مستەفای سەید قادر بەگشتی سەرپەرشتی دەستەکانی (سرك)ی ئەکرد لەکوردستاندا لەلایەن سەرکردایەتیەوە لەسنوری هەولێریشدا چەند دەستەیەکیش دروست کرا، لەسەرەتادا وا بڕیار بوو، هەر چەند دەستەیەك بکرێت بە تیپێك، بەگشتی (٢) تیپ دوو پێك بهێنرێت، یەکێکیان لەلایەن (کاکە زیاد) و ئەوی تریان لەلایەن شەهید (خولە)وە سەرپەرشتی بکرێن، بەڵام گرتنی کاکە زیادی بەسەرداهات، بەشێوەی مەفرەزە مایەوەو هەر بەوجۆرە سەرپەرشتی ئەکران و ئەبینران، دواییش گرتنی کاك (مستەفای سەید قادر)یش لەلایەن ڕژێمەوە، مایەوە کاك مەلا قادرو شەهید خولە سەرپەرشتیان ئەکردن، هەتا سازدانی ڕاپەرین، لە بەهاری (١٩٩١) وە لەو کەسانەی کە بەچاکی هاوکاری کاك مەلا قادریان ئەکرد، بۆ دەستەکانی کاکە زیاد دوو هاوڕێی زۆر بەتوانا بوون ئەوانیش: کاك (هونەرو کاك ئارام) بوون، هەر ئەم مەفرەزانەیش بوونە هەوێنی ڕاپەرین، کە بەشێوەیەکی دەستەی چەکدار مابونەوەو جموجۆڵی خۆیان ئەکرد، لەناو جەماوەردا، کە شانەی چەکداری باشیان دروست کردبوو، لەنزیك ڕاپەرین دا بەشانە چەکدارەکانی (بروسك) ناسران لەسەرەتای سازدانی ڕاپەرینو هەندێ لە چەکدارەکانی لای ڕژێم هاوکاریان ئەکردن، وە لە فەرماندە دەستەکانی (سرك) ئەمانە ناوی چەند کەسێکیانە:-

١- لالە حەکیم
٢- ڕێباز
٣- هونەر اسماعیل
٤- ئارام
٥- مستەفا چاوشین
٦- ئەبوبەکر ڕەشید (شۆڕش)

پێشمەرگەی ناو دەستەکانیش زیاتر لە (٧٠) حەفتا کەس ئەبوون..*

---

* چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرێز مەلا قادر.

## كۆتایی سالّی (١٩٩٠) و ئاسۆی راپه‌ڕین

له‌ كاتێكدا ڕژێمی عێراق هه‌موو تواناكانی خستبووه‌ ناو (كوێت)، له‌به‌رده‌م هه‌رهه‌شه‌ی لێدانی ئه‌مریكاو هاوپه‌یمانه‌كانیدا بوو، له‌ناوخۆدا باری به‌ره‌و لاوازیو بێده‌سه‌لاّتی ئه‌ڕۆیشت، له‌ناو داموده‌زگاكانیدا ده‌سته‌ چه‌كداره‌كانیش به‌ره‌و زیاتر چالاكیو سازدانی جه‌ماوه‌ر بوون، بۆ راپه‌ڕینو به‌چه‌ند ڕۆژێك پێش راپه‌رین بیر له‌ ڕزگاركردنی زیندانیه‌كانی ناو شاری موسلّ كرایه‌وه‌، به‌هۆی په‌یوه‌ندی چه‌ند كه‌سێكی نزیكی زیندانه‌كه‌وه‌، به‌لاّم زیندانیه‌كان خۆیان ئه‌و هه‌له‌یان قۆستبووه‌وه‌و توانیبویان زیندان بشكێننو ده‌ربازبن، ئه‌مه‌ له‌ (٤- ٣ /١٩٩١/٣) دا، هه‌ر ئه‌م بارودۆخه‌ وای كرد كه‌ جه‌ماوه‌ری ناحیه‌ی خه‌بات (ئاسكی كه‌لّه‌ك) به‌هه‌لّچونی خۆیان له‌گه‌لّ ڕێكخستنه‌كانیان راپه‌ڕینیان به‌رپاكرد پێش وه‌خت له‌ ڕۆژی (١٩٩١/٣/٤) دا، به‌لاّم ڕژێم چوارده‌وری گرتنو لێیاندان، تیایدا (٢) دوو ڕێكخستنو هه‌ندێك له‌ جه‌ماوه‌ر شه‌هید بوون، ئه‌م جموجۆڵه‌و خۆده‌رخستنه‌ی جه‌ماوه‌ره‌ وایكرد كه‌ ڕێكخستنه‌كانو ده‌سته‌و شانه‌ چه‌كداره‌كان زیاتر هه‌وڵبده‌ن بۆ ده‌ست پێشخه‌ری سازدانی راپه‌رین، سوود وه‌رگرتن له‌و هه‌لّچوونه‌ جه‌ماوه‌ریه‌ كه‌ ئه‌بینرا، بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌ به‌رنامه‌یان دارِشت، له‌ ڕۆژی (١٩٩١/٣/٤) چه‌ند كادرێكی ڕێكخستنیان ره‌وانه‌ی هه‌ریه‌ك له‌ سنوره‌كان كرد، له‌وانه‌:

١- كاك ئه‌حمه‌ده‌ بچكۆل بۆ سنوری ڕانیه‌.

٢- محمد قادر بۆ سنوری بازیان.

به‌ په‌یوه‌ندی كردن به‌ ڕێكخستنه‌كانو شانه‌ چه‌كداره‌كان، سازدانی راپه‌ڕین له‌شاری رانیه‌ بۆ یه‌كه‌م جار هه‌تا گه‌یشتنی هێزی پێشمه‌رگه‌ به‌م سنوره‌، هه‌رچه‌ند هه‌ندێ پارێزگاری ئه‌كرا له‌سه‌ر ئه‌و راپه‌رینه‌ی ئاسكی كه‌لّه‌ك، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی مه‌ترسی هه‌بوو كه‌ڕژێم ده‌ست بوه‌شێنێت، له‌كوشتنو گرتنی جه‌ماوه‌ره‌كه‌ به‌لاّم هه‌والّ گه‌یشت كه‌هیچی نه‌كردووه‌، ئیتر به‌رنامه‌ی راپه‌رینه‌كان له‌هه‌موو شوێنه‌كان دارِێژراو بریاریان له‌سه‌ر درا، به‌تایبه‌ت له‌ گه‌یشتنی هێزی پێشمه‌رگه‌دا به‌ته‌واوی كلّپه‌ی سه‌ند، هه‌موو شوێنه‌كانی گرته‌وه‌، هه‌تا ئه‌م كاته‌ی راپه‌رین سه‌رپه‌رشتی ڕێكخستنه‌ نهێنیه‌كانی سنوری هه‌ولێر له‌لایه‌ن كاك مه‌لا قادره‌وه‌ ئه‌كرا، دوایی به‌رێزان: شه‌هید عبدالرزاقو كاك كۆسره‌تو كاك بێستونو شه‌هید محمد قادر كه‌ له‌سێداره‌درا، گه‌یشتنه‌ سنوره‌كه‌و به‌ته‌واوی به‌ڕێز كاك كۆسره‌ت سه‌رپه‌رشتی مه‌یدانی كرد.

## گرتنی کوێت لەلایەن ڕژێمی عێراقەوەو گۆڕانکاری لە بەرنامەی پێشمەرگایەتی و سیاسیدا

داڕشتنی بەرنامەی تازە لەلایەن سەرکردایەتی (ی.ن.ك)، لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرکردایەتی (ی.ن.ك) بەگشتیی و لەسەرو هەموویانەوە هەڤاڵانی بەڕێز: مام جەلال و کاك نەوشیروان و کاك کۆسرەت و ئەندامانی (م.س) هەمیشە لەدراسەو داڕشتنی بەرنامەی واقعی و گونجاو بوون، بۆ بەڕێوەبردن و گۆڕانکاری پێشکەوتوو بزوتنەوە کوردایەتیەکە پاراستن و بەکارهێنانی هێزەکانی پێشمەرگە بە پێی پێویست و گونجاو و بەردەوامی پەیوەندی بەرێکخستنەکانی خوارەوە، کەسانی پێشکەوتووی کوردپەروەرەکان و چاودێری گۆڕانکاریە دەرەکیەکان و نێودەوڵەتیەکانی گونجاوی سەردەم، لەگەڵ بزووتنەوەکەو مافی گەلانداو بەکارهێنان و سەرپەرشتی دەستەکانی پێشمەرگە پارتیزانەکان، بۆ هەموو سنورەکانی کوردستان و وەرگرتنی زانیاری و هەواڵی گۆڕانکاریەکانی ناوخۆی کوردستان و عێراق و دەوڵەتانی دەوروبەری جیهان، بەتایبەت لەدوای شەڕی ٨ ساڵەی عێراق ئێران و ڕەنگدانەوەی لەسەر ناوچەکەو جهان و دەوڵەتانی ڕۆژئاوا، دەرکەوتنی عێراق وەکو خاوەن سوپاو هەموو جۆرە چەکە کۆکوژو ئاستی مەترسی لەدەوروپشتی و بەرژەوەندیەکانی کەنداوو ڕۆژئاواو لەسەرو هەموویانەوە دەوڵەتی ئەمریکای زل هێزو بڕیار بەدەستی جیهانی، چاودێری و دراسەو متابعەی ئەم بارودۆخە هەمیشە لەناو بەرنامەکانی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) و حزبە کوردستانی و نیشتمانیەکانی ئەوکاتەی دوای هێرشەکانی ئەنفالدا ڕۆژانە بوو، بەتایبەت هەڤاڵ مام جەلال لەو کاتانەدا وەکو دیبلۆمات و سیاسەتمەدارێکی بەتوانا هەمیشە سەردانی وڵاتانی دەرەوەی ئەکرد هەم بۆ گەیاندنی کێشەو بارودۆخی مەترسیداری کورد لە کوردستانی عێراقدا، لەبەردەم هەڕەشەی پاکتاوکردنی ڕەگەزی و سڕینەوەی تەواوی ئاسەواری نەتەوایەتی گەلی کورد لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە، بەتایبەت لەوکاتەدا تا ڕادەیەك ڕژێمی عێراق زەمینەی بۆ لەبار بوو، بۆ بەڕاگواستنی تەواوی دێهات نشینەکان بۆ کۆمەڵگا زۆرەملێکان، سەپاندنی تەواوی دەسەڵات بەسەریاندا بۆ شوێنی نادیاری، تەنانەت لەناو شارو شارۆچکەکانیشداو ڕۆژانەیش دەرکردنی خێزان و ماڵە کوردەکان لەشارەکانی کەرکوك و خانەقین و سنورەکانی شاری موسڵ و شوێنی تر، کە ڕژێم مەبەستی بوو بێت بۆ جێگیرکردنی ماڵە عەرەبەکان و نیشتەجێ کردنیان لەسەر زەوی و خاکی کوردستان، ئەمانە

هەموو بووبوونە بەڵگەیەكی دیارو ئاشكرا بەدەست سەركردە كوردەكانەوە كە لەجهان و ڕاگەیاندنە نێودەوڵەتی و مرۆیی و خێرخوازەكاندا، بەڕاپۆرت و سكاڵاو یاداشت و بەشداری لە كۆبوونەوەكانیان، ڕۆڵی كاریگەری هەبوو، بەڕاكێشان ویژدانی گەل و دەوڵەتانی دونیا بۆ لای كێشەی كوردو مافە ڕەواكانی، كە پشتگیری لێ بكرێت و بەرگری لەپاكتاوكردنی ڕەگەزی نەتەوەیی لەسەر بوەستێنرێت، لەلایەن دەسەڵات و دەزگا بەرپرسەكانی تایبەت بەم كردارانەی دژی كورد، لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە تەرخان و بەرپرس كرابوون، جگە لە دەركەوتن و بەرزبونەوەی دنیایەك نارەزایی لە بەكارهێنانی چەكی كیمیاوی لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە بۆ شاری هەڵەبجەی كوردستانی عێراق، كە بەڕاستی هەڵەبجە بوو بەناوی هەموو كوردستان، لەناو هەموو گەلانی مرۆڤ پەروەرو ماف ناسان و دەوڵەتە خاوەن بەزەییەكاندا، كە بەتەواوی سیاسەتی جهان گۆڕا بەرامبەر بەسەرۆك و سەركردایەتی عێراق و دەسەڵاتدارەكانیەوە، لەسەرو هەموویانەوە (سەدام حسێن) بە تاوانبارێكی زۆر گەورەی ئەنجامدەری بەكارهێنانی گەورەترین چەكی كۆكوژی قەدەغەكراوی نێودەوڵەتی (كیمیاوی) دانرا، ئەم گۆرانكاریە لەسیاسەت و ڕاگەیاندنی جیهاندا ڕۆڵێكی زۆر ئیجابی و گونجاوی پەیداكرد بەرامبەر بەپشتیوانی لە مافەكانی گەلی كوردو كێشە ڕەواكەی لە كوردستانی عێراقدا، كۆمەڵێك دۆست و لایەنگیری بەتواناو دڵسۆزی بۆ هێنایە پێشەوە، لەسەروو هەموویانەوە دەوڵەتی فەرەنساو سەرۆكی دڵسۆزی (فرانسومیتران و دانیال میتران)ی ژنە هەرە دڵسۆزو هاوغەمی گەلی كورد، كە لەبەردەم كۆنگریسی ئەمریكادا باسی كێشەی كوردی كردو خستیە ناو كێشەكانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زۆر بەگەورە نرخاندی، لەناو ئەم هەموو گۆرانكاری و هەوڵە بەردەوامانەی سەركردەكانی كورد، بەرامبەر سیاسەت و بەرپرسە نێودەوڵەتیەكانی جیهان و لەسەر ڕۆشنایی و نەخشەی گونجاوی لەبار بەرامبەر بە ڕەخساندن و دۆزینەوەی هەلێكی لەبار بەمەبەستی دەربازكردن و ڕزگاركردنی بزووتنەوەی شۆڕش و ڕزگاریخوازی گەلی كوردو كێشەكەی لەو بارودۆخە ناسكەو دژوارەدا، و دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك بۆ پێشەوەبردنی بواری لەباری بزووتنەوەی كورد بەئاقارێكی بەرژەوەندی گەلی كوردو هەڵسانەوەی شۆڕش و پێشمەرگایەتی گەیشتنەوە بۆ ناو جەماوەری گەلی كورد لە كوردستان و خاكی نیشتیماندا، لەم كاتە سەرقاڵیە گەرم و دراسەی چارەنوس سازیەدا بۆ كورد كە ڕۆژانە سەركردەكانی (ی.ن.ك) و حزبە كوردستانی و نیشتمانیەكان لەچاودێری و بیركردنەوەدا بوون و هەر هەموشیان تێبینی ئەوەیان هەبوو زۆر بەئومێدەوە كە ئەبێ سەرۆك و ڕژێمی عێراق لەم ساڵانەدا لەئاستی گۆرانكاریەك یان هەنگاوێكی ملهوڕیانە بنێت، ببێتە مایەی

گۆڕانکاری لەسیاسەت و جۆری تێڕوانینی دەوڵەتانی دراوسێ و عەرەبی و جیهانی، ئەمەیش ببێتە هێنانە پێشەوەی بوارێکی گونجاو بۆ هەڵسانەوەی بزووتنەوە شۆڕشگێڕیە کوردیەکان، ئەمە بەئاشکرا لەسەردان و کۆبوونەوەکەی هەڤاڵ مام جەلال دا ڕوونی کردەوە لەبەردەم کادرو پێشمەرگەکانی مەڵبەندەکاندا، لە کۆبوونەوەی ساڵی (١٩٨٩) بۆ مەڵبەندی یەك لەبەردەم دەربەند دزڵی –مەریوان، کە بارەگاکانی پێشمەرگەی مەڵبەندی یەکی لێ بوو، لەم کاتەدا ورەیەکی زۆر بەرزو پڕ لەئومێدو دڵخۆشکاری دا بەهەموو پێشمەرگەکان، هەموو گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە لە ساڵی داهاتوودا واتە نەوەدەکان ڕژێمی عێراق و سەرکردە دکتاتۆرەکەی (صدام حسێن) سەرکێشی و ملهوریەك ئەکات، دڵنیابوون کە لەدوای شەڕی ٨ ساڵەی ئێران هەروا بەئاسانی دانانیشێ و ئەبێ پەلاماری شوێنێك بدات یان شەڕێك بە شوێنێك بفرۆشێت و نەیەڵێ لەشکری عێراقی هەروا بێ شەڕو بێ سەرقاڵی بێت.. لەپڕ لە ٨/٢ ئاب/١٩٩٠ کاتێك زانیمان لە بەیانیەکی زووی شەوەکیدا لەشکری عێراق بەئەمری صدام حسێنی سەرۆکی داویە بەسەر وڵاتی کوێتی میرنشیندا، بەجۆرێکی زۆر نارەواو وێرانکاری دەستی کێشاوە بەسەر هەموو ئیدارەکانی، سامانی و خاك و گەلەکەی دا، بەپارێزگایەکی عێراقی بەرەسمی خۆیان ناساند، لە ئعلامەکانی عێراقەوە، بەو جۆرەی بەوڵاتانی هەموو جیهانی ڕاگەیاند زۆر لەخۆبایی و بێ‌منەتانە ئەم پەلامارو هێرشەی ڕژێمی عێراق، وەکو داگیرکردنی کوێت بوو بەسەرچاوەی هەموو کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، هەواڵەکانی ڕۆژانەی هەموو جیهان، بەگشتی جێگای مەترسی و درێژەدان بەپێشرەوی، سەرەڕوی ڕژێمی عێراق بوو، بەرەو دەوڵەتی کەنداوو لەپێش هەموویانەوە دەوڵەتی عەرەبی سعودی، لەبەر ئەوە لەو کۆمەڵە نارەزاییە دەوڵەتیانەی جیهان بەهەمان شێوەی نارەزایی کۆمەڵەی دەوڵەتانی عەرەبیش، وەکو یاساو بەرنامەو بەرگری لەمافی یاساو سیادەی دەوڵەتانیش ئەنجومەنی نەتەوەکانیش ڕاستەوخۆ کەوتنە ناو دراسەو کۆبوونەوەو دەرکردنی بڕیارەکانیان، بە زۆرترین دەنگی دەوڵەتە بەشدارەکان، بەمەبەستی کشانەوەی لەشکری عێراقی و گەڕانەوەی دەسەلات بۆ میرو حکومەتی کوێت، گەڕانەوەی دیل و قەرەبووی سامانەکانیان کە هەموویان بەتاڵان بردبوون، هەروەکو پیشەو کردارەکانیان کە لەگەڵ کوردی هەژارو لەخانوو ماڵی کوردستانیان کردبوو ئەم کردەوەیەی ڕژێمی عێراق لەگرتنی کومیت دا، بەتەواوی پەردەی دڕندەیەتی ڕژێمی عێراقی هەڵدایەوە لە ڕووی هەموو جیهان و ئەنجومەنی نێونەتەوەیی و مرۆییەکاندا، ئینجا بەتەواوی کردەوە نامرۆڤانەکەیان بەسەر گەلی کوردا کە ئەنجامیان دابوو لەچەندەها ساڵی پێشترەوە تا ئەوکاتە خستیانە پاڵ ئەم تاوانە داگیرکردن و

کوشتن‌و بڕین‌و ماڵ بەتاڵان بردن، ئەمە بوو بەبنەمای دارشتنی هەوڵ‌و بەرنامەی سیاسی، بەرەی سەربازی نێودەوڵەتی لەلایەن زۆرترین دەوڵەتانی جیهان‌و ئەورووپاو ڕۆژئاواو بەتایبەت هەردوو دەوڵەتی ئەمریکاو بەریتانیا بەسەرپەرشتی تەواوی ئەمریکا پێکهات، لە بەر ئەوەی تەواوی بەرژەوەندیەکانیان، لەکەنداودا کەوتە بەر مەترسیەوە، هەموو هەوڵە دیبلۆماسی‌و بەرنامەکانیشی لەنێوان ڕۆژی داگیرکردن هەتا لێدانی لەشکری عێراق لە کوێت هەمووی بەپەیوەندی‌و بەستنەوە بە ئەنجومەنی نێونەتەوەییەکان، لەسەر ڕۆشنایی‌و بەرنامەو بڕیارە یاساییە نێودەوڵەتانە بەسرایەوەو ئەچوو بەڕێوە، کە ئەوکاتە سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان (پتروس پتروس غالی) بوو، لەملاشەوە لەناو کوردستان، بەگشتی‌و لەناو هێزی پێشمەرگەو خێزانی ئاوارەی ناو سنوری ئێران‌و پێشمەرگە پارتیزانەکانی ناو کوردستان هەلێکی زۆرباش‌و بوو بەمایەی خۆشی‌و شادی‌و چاوی پڕ لەئومێدی ڕزگاربوون لەئاوارەیی‌و گەڕانەوە بە سەرکەوتنەوە بۆ شوێن‌و خاکی کوردستانی عێراق‌و ناو کەسوکار، کە چەند ساڵ بوو لەیەکتر دابڕابوون.. سەرکردایەتی (ی.ن.ك)یش وەکو هاتنە پێشەوەی گۆڕانکاریەکی مێژوویی گەورەو چارەنوسسازی کوردو شۆڕشەکەی دیاری کرد، هەروەکو پێشترو هەمیشە لە چاودێری‌و چاوەڕوانیدا بوون، بەمەبەستی قۆستنەوەو سوود وەرگرتن لەم گۆڕانکاریە، بەکارهێنانی بوارێك لەناو هەلێکی گونجاوو لەباردا، کەوتنە دراسەو کۆبوونەوە لەناو کۆمەڵێك ئەگەردا، بەرامبەر بەرەنگدانەوەی کرداری داگیرکاری ڕژێمی عێراق لە کوەیت، بەرامبەر بەرەتدانەوەو جۆری لەلایەن دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بەسەرپەرشتی زل هێزی دنیا (ئەمریکا)، لەناو ئەو ئەگەرانەی کە بەهەلێکی باش دانرا بۆ گەلی کوردو شۆڕشەکەی ئەگەری بەردەوامی ملهوڕی سەدام‌و ڕژێمەکەی‌و بڕیاری مانەوەو نەکشانەوەی لەشکرەکەی لە مێرنشین‌و خاکی کوەیت.

## سازدانی بەرنامە بۆ ڕاپەڕین لەلایەن سەرکردایەتی (ی.ن.ك)

لەئەنجامی هەوڵ‌و سازدانی کۆبونەوەکانیاندا بۆ سنوری مەڵبەندەکان، لەناو سنورەکانی ئێراندا، لەناو ئەندامانی (م.س) و فەرماندە عەسکەریەکاندا چەند جارێك سەریان لەسنوری مەڵبەندی یەکی ئەوکاتەدا، کە لەسنوری مەریوان–دزلی بوو، لەلایەن بەڕێزان کاك عمر فەتاح‌و کاك شێخ جەعفەر، جارێك وە جارێکی کە لەلایەن بەڕێزان کاك کۆسرەت‌و کاك شێخ جەعفەر کە زۆر باش‌و بەهەستی لێپرسینەوەو بەمەبەست‌و دڵسۆزی بەسازدان‌و سەرکەوتنی ئەو ڕاپەرینە جەماوەریەوە پێ‌ی لێ دائەگیرا بەتایبەت

بەکارهێنان و ئەنجامدانی ئەم دروشمانە وەکو زامن و پیرۆزی ڕەچاوکردنی بەئەمانەتی مێژووییـــەوە، لـــەپێناوی ســـەرکەوتنی ڕاپەرینەکـــەدا، کـــە ئـــەویش یەکـــەم دروشـــم: (ئاشتبوونەوەی گشتی) بوو، زۆر بە بەرزی ڕابگیرێت، دوور لەهەموو دوژمنایەتی و کینەو ناحەزی کەسی بەئاشکرا ڕاگەیەنرا، ئەوی کارێکی تایبەتی ئەنجام بدات لەئاستی تۆڵە یان مافی کەسی بڕیاری سزای توند ئەدرێ، بەهەمان کردارو لەهەمان شوێن دا، کە ئەم بڕیارە هەر بۆ ئەم مەبەستەیەش هەر زوو دەستکرا بە دروستکردنی دەستەی چەکداری بچوک بچوك، بەسەرپەرشتی کادری عەسکەری و سیاسی لێهاتوو بەتوانا، هەرچەند دەستەیەك بۆ ئەو سنورەی لەئاستی جەماوەری خزمی و ناسیاوی و پەیوەندی و ناسراویان هەبوو، هەتا تێکەڵاوی بەمەبەستی زیاترو بەئاسانترو زووتر پەیوەندی دروست کردن و گەیاندنی پەیامەکەو داڕشتنی بەرنامەکە پێش وەخت، لەکاتی خۆی دا، هەر لەو سات و وەختانەشدا لەلایەن (م.س)و سەرکردایەتیەوە پەیوەندی تایبەت و لەکاتی خۆی بەچاکی ئەنجامدرا، کادرو پێویستی تایبەت، لەوانە جهازی پەیوەندی گەیەنرا بەشوێن و جێگای لەبار بۆ ڕێنمایی و داڕشتنی بەرنامەو گەیاندنی ئامۆژگاریەکانی ڕۆژانە، دروست کردنی دەستەی چەکداری لەناو ڕێکخستن و چەکدارە کوردەکاندا، داڕشتن و دانانی نەخشەو پلانی لەبار، دیاریکردنی دام و دەزگاکانی ڕژێم لەهەموو شوێن و بارەگاو سەربازگەکان و ڕەبایەکانی ناوشارو شارۆچکەو کۆمەڵگاکاندا، پەیوەندی ڕۆژانە لەچۆنیەتی پێشەوەچوونی بەرنامەکان، بەپێویستیان و ڕۆژانەیش تا ئەهات بەرنامەکانی ڕاپەرین لەپەیوەندی و هاوکاری ڕێکخستن و هێزی پێشمەرگە پێشکەوتوو ترو زیاتر گەشەی ئەکرد، بەتایبەت لەبەرامبەریشدا هێزو دەزگاکانی ڕژێمیش بەرەو باری نائاسایی و پاشاگەردانی و شپرزەیی ئەڕۆیشت، بەجۆرێك بەرەو لەیەکتر ترازان و لەدەستدانی دەسەڵاتیان و بێئومێدیان لە کوردستاندا، بەجۆرێك بوو زیاتر بیریان لە خۆپاراستن و دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك ئەکردەوە، پیاوەکانی ڕژێم بۆ ڕزگاربوونی گیانیان و مناڵ و خێزانیان و دەربازبوونیان و لەولاشەوە چەکدارە کوردەکانیش زۆربەیان بەپەرۆشەوە بەرنامەکەیان قبوڵ کردو بەدەمیەوە هاتن، بەتایبەت ئەو دروشمەی ئاشتبوونەوەی گشتی بوو بەچەترێك هەموو کورد لەژێر سایەیدا یەکی گرت و ڕیزەکانی ڕێکخست و لەناو یەك سەنگەرەوە پەلاماری هێزەکانی ڕژێمی داگیرکەری کوردستانیاندا هەر بۆیە ووتراوە یەکگرتن هێزە، کە لەبەرامبەریشدا پێشێل کردنی سیادەی کوێتی و ڕەتدانەوەی بڕیارە نێودەوڵەتیەکان، کە لەم کاتەدا ڕێگا بەدەوڵەتە هاوپەیمانەکان ئەدرێ بەجۆری یاسایی نێودەوڵەتی و بڕیاری ئەنجومەنی دەوڵەتە یەکگرتوەکان کە هێرشی

هاوپه‌یمانی به‌هه‌موو جۆری به‌كارهێنانی چه‌كه‌كانیان بكه‌نه سه‌ر له‌شكری عێراق، لێره‌دا ته‌نیا به‌مه‌به‌ستی ده‌رپه‌ڕاندنی له‌شكری عێراق له‌كوێت و گه‌ڕانه‌وه‌ی سیاده به‌میرو حكومه‌تی پێشوویان، له‌ناو ئه‌م ئه‌گه‌ره به‌ئومێده‌دا سه‌ركرده‌كانی (ی.ن.ك) كه‌وتنه دراسه‌و كۆبوونه‌وه‌ی به‌رده‌وام به‌مه‌به‌ستی داڕشتنی به‌رنامه‌ی (ڕاپه‌ڕین) به جه‌ماوه‌ری گه‌لی كورد له كوردستانی عێراقدا، به‌سه‌رپه‌رشتی و به‌كارهێنانی هێزی پێشمه‌رگه وه‌كو هه‌وێن و پێشڕه‌وایه‌تی و سه‌كردایه‌تی ئه‌و ڕاپه‌ڕینه جه‌ماوه‌ریه، كه له‌ئه‌نجامی لێدانی له‌شكرو سوپای عێراق و له‌یه‌ك هه‌ڵوه‌شان و شپرزه‌یی و پشێوی له‌ناو ده‌زگاكانی ڕژێمی عێراقدا دروست ئه‌بێت، له عێراق به‌گشتی و له كوردستاندا به‌تایبه‌تی، توانای ده‌سه‌ڵاتی نامێنیٚ و له‌ده‌ستی ئه‌دا، به‌م جۆره ناوو ووشه‌ی(ڕاپه‌ڕین) كه‌وته ناو به‌رنامه‌كانی سه‌ركردایه‌تی (ی.ن.ك) و به‌مه‌به‌ست و په‌رۆشی قۆزتنه‌وه‌ی ئه‌م هه‌له‌و زامنكردنی سه‌ركه‌وتنی و چۆنیه‌تی سازدانی جه‌ماوه‌رو ئاگاداركردنه‌وه‌ی ڕێكخستنه‌كانی ناو شارو هه‌موو شوێنه‌كانی كوردستان، له‌سه‌رو هه‌موو به‌رنامه‌كه‌وه چۆنیه‌تی میكانیزمێك بۆ به‌كارهێنانی ئه‌و هه‌موو چه‌كداره كورده‌ی لای ڕژێم كه زیاتر له (٢٥٠) هه‌زار كه‌س ئه‌بوون له فه‌وجه سوكه‌كاندا بۆ ئه‌م مه‌به‌سته‌یه‌ش سه‌ركه‌وترین و له‌بارترین دروشم به‌رزكرایه‌وه‌و بڕیاری له‌سه‌ردراو ڕاگه‌یه‌نرا ئه‌ویش دروشمی (ئاشتبوونه‌وه‌ی گشتی) بوو، بۆ هه‌موو گه‌لی كورد به‌هه‌موو چین و توێژو بیرو بۆچوون و حزب و چه‌كداره‌كانی لای ڕژێم، به‌هه‌مان سۆزی برایه‌تی و هاوسه‌نگه‌ری و هاوبه‌رپرسێتی مێژوویی له‌و هه‌له مه‌زنه‌دا كه سازدان و سه‌ركه‌وتنی ڕاپه‌ڕینی جه‌ماوه‌ری و سه‌رتاسه‌ری گه‌لی كورده له كوردستانی عێراقدا، ده‌رنانی ته‌واوی ده‌سه‌ڵاتی ڕژێمی عێراقه‌و پاك كردنه‌وه‌یان له‌سه‌ر خاك و نیشتمانی كوردستان و نیشتیمانی هه‌موو كورد بێ‌جیاوازی، له مناڵێكه‌وه هه‌تا گه‌وره‌یه‌ك، له‌كوڕو كچ له‌ژن و پیاو له پێشمه‌رگه‌و له‌چه‌كداری پێشووی لای ڕژێم، كورد له‌هه‌ر ده‌زگایه‌كدا، به‌یه‌ك به‌رنامه به‌یه‌ك چاو، به‌یه‌ك هه‌ست به به‌رپرسیاریه‌ت زانین، یه‌ك په‌یام به‌رامبه‌ر به‌مێژوو، له‌به‌ر ڕۆشنایی داڕشتنی ئه‌م به‌رنامه‌ی (ڕاپه‌ڕینی جه‌ماوه‌ری یه)و به‌رزكردنه‌وه‌ی ئه‌و دروشمه پیرۆزه‌ی (ئاشتبوونه‌وه‌ی گشتی)یه له‌ناو هه‌موو جه‌ماوه‌ری گه‌لی كوردا له كوردستانی عێراقدا، به‌مه‌به‌ستی گه‌یاندنی به‌رنامه‌كه به‌هه‌موو هێزه‌كانی پێشمه‌رگه‌و ده‌زگاكانی شۆڕش له‌سنوری مه‌ڵبه‌نده‌كاندا، زۆربه‌ی ئه‌ندامانی (م.س) و سه‌ركردایه‌تی و هه‌ندیٚ له‌فه‌رمانده عه‌سكه‌ریه‌كان كه‌وتنه سه‌ردانی مه‌ڵبه‌نده‌كان، هه‌ر چه‌ند كه‌سێكیان بۆ لایه‌ك و بۆ مه‌ڵبه‌ندێك و به‌ووردی و له‌سه‌رخۆیی له‌ئاستی ناو چه‌ند كۆبوونه‌وه‌یه‌ك به‌هێزه‌كانی پێشمه‌رگه‌و به‌كادره پێشكه‌وتوه‌كانی خاڵه‌كانی به‌رنامه‌ی

سـازدانی (ڕاپـەرین) شـی ئەکرایـەوە، لـەهێزی پێـشمەرگە ئەگەیـەنرا، بـۆ تـەواو لێ تێگەیشتنی و دەستکردن بەکرداری سازدانی بەرنامەکە، ئەویش هەر زوو پەیوەندی کردن بەجـەماوەری کوردسـتان، لـەپێش هەموویانـەوە ڕێنمـایی و دەسـت بـەکاربوونی کـادرو ڕێکخـستنە نهێنیـەکانی، کەسـایەتیە ڕۆشـنبیرو بـەتواناو کـورد پـەروەرەکان، خـاوەن نفوسەکان، چۆنیەتی پەیوەندی بەبەرپرس و چەکدارە کوردەکانی لای ڕژێم، هـەر شوێنەو سنورە بەپێی گونجاندنی نزیکی و پەیوەندی تایبـەتی کادرە عەسکەری و سیاسیەکان و پێشمەرگەکانەوە، هەندێکیش پێویستی بەنامەی تایبەتی ئەندامانی (م.س) و هـەتا بـەڕێز مـام جـەلال تـا سـەرکردایەتی و فەرمانـدە سـەربازیەکانەوە هـەبوو، هـەر هـەموو لـەو چـەند مانگـەی نێـوان( ٢/٨/١٩٩٠)، هـەتا نزیکـی لێـدان لـەڕژێمی عێـراق لـە شـەوی ١٦-١٩٩١/١/١٧، ئەو چەند مانگەی تەواو پشێویەکەی ناو عێراق ئەنجامدرا، تەواو جـەماوەرو هێـزی پێـشمەرگەو چـەکداری کـورد سـازو ئامـادەکرا، بـۆ ڕۆژی ڕاگەیانـدنی ڕاپـەرین و دەربڕینی ووشەی ڕاپەرین بەبانگەوازی (زەماوەندە) بووبووە مەبەست و دروشمێکی زۆر گـەورەو مەبەسـتی سـەرکەوتنی ئەوکاتـەی گـەلی کـورد، بـەو ڕاپەرینـە پـڕ لەشکۆدارە کـە تێکڕای گەلی کوردو شۆڕشەکەی و هێزی پێشمەرگەی لەلێواری لەناوچونەوە خستەوە نـاو دنیـای واقـع و سـەروەری سـەرکەوتن و خـۆش و دەسـت لـەملان و یەکپارچـەیی کـورد، لەگۆڕانی تـەواوی بەرنامـەو نەخشە گڵاوو کورد بەکۆمـەڵ کوشتنە لـەناوبردنی تـەواوی گەلی کوردە لەلایـەن ڕژێمـی عێراقەوە، کە لـەماوەی چەند ساڵی دوای هەرەسـەوە بەهـەموو توانـــای ســـەربازی و مادیـــەوە دەســـتی پـــێکردبوو، لـــەناو هـــەر ســـێ سیاســـەتە ڕەگەزپەرستیەکەیدا کـە ئـەویش:- سیاسـەتەکانی ( بەعـەرەب کـردن، بـە بـەعس کـردن، ڕاگواستن) بوو، بۆیە لەم ڕاپەرینـە مەزنـەدا لـەماوەی چەند ڕۆژێکدا سـەرجەم دەزگاکـانی شـیرازەی نـەماو لـەگۆڕنرا بەسیاسـەت و بەرپرسـە دەزگـا بـەجێ هێنەرەکانیانـەوە لـە کوردسـتاندا، بەبانگـەوازە پـڕ لەسـۆزو هەسـت بزوێنـەرە گیـانی شۆڕشـگێڕیەکەی ڕادیـۆی دەنگـی گـەلی کوردسـتان و مارشـە کاریگـەریەکـەی، بەوشـەی (زەماوەنـدە) هـەموو کـوردی خرۆشاند.

## سازدان و بەرپابوونی (راپەڕین)ی جەماوەری کوردستان
## لەرۆژی ٥/٣/١٩٩١ بۆ ٣٠/٣/١٩٩١)

دوای ئەوەی بەتەواوی بەرنامە داڕێژراوەکانی سەرکردایەتی سیاسی (ی.ن.ك) سەرکەوتنی بەدەست هێنا، لەسەر ڕۆشنایی بیروبۆچونی ڕەنگدانەوەی داگیرکردنی کوێت لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە، و هاوکات بەئەنجام گەیاندنی ئەو ئەگەرەی کە بەردەوامی ملهوڕی و لاساری سەدامی دیکتاتۆری تیا بگاتە ئەنجام، لەبەرامبەریدا زەمینە لەبارکردن بۆ لێدانی عەسکەری ئەمەریکاو بریتانیاو هەموو دەوڵەتە هاوپەیمانەکان، لەهەمان کاتیشدا ئەو خۆسازدانە پێشبینیەو دەستپێشخەریەی بەهێزی پێشمەرگە کرا، بەسەرپەرشتی هەڤاڵانی تەواوی (م.س)، (ی.ن.ك) لەسەروو هەمویانەوە بەڕێز مام جلال، بەناردنەوەی زیاترو زۆرتری دەستەی پێشمەرگە، هەر دەستەیەك بۆ سنورو ناوچەکانی خۆیان، لەکۆمەڵگە زۆرەملێ و ناو شارو شارۆچکەکان، هاوکاری تەواوی پێشمەرگەو کادرە سیاسی و عەسکەریە پارتیزانەکانی خوارەوە، ڕۆڵی سەرەکیان هەبوو، هەروەوو پەلەکردن بەپەیوەندیکردن بەچەکدارو فەوجە سوکەکانەوە، هەریەکە بەپێی بۆچوون و پێویست و جۆری قەناعەت پێکردنی بەپەیوەندی ناسراوی خزمایەتی و دۆستایەتی، یان بەنوسراوی سەرکردایەتی، هاوکات سازدانی دەستەی چەکداری بچوکی زۆر، لەناو دڵسۆزان و ڕێکخستنەکان و سرکەکاندا، سازادنیان و ئامادەکردنێکی یەکپارچەیی هەموو جەماوەری کورد، تەنانەت بەفەرمانبەرو مامۆستاو خوێنکارەکانیشەوە، بۆ ڕۆژی ئاگاداری و هاوکات ڕۆڵی تەواوو جۆشداری بێوێنەی ڕادیۆی دەنگی شۆرشی گەلی کوردستان، و دەربڕینی نهێنی ووشەی (زەماوەندە) کە ئەمە ووروژاندنێکی تەواوی هەموو جەماوەری کوردبوو، هەر لە شەوی(١٦-١٧/١/١٩٩١) لەکات ژمێر (٢)ی شەودا کە لە لەشکری عێراق درا لەکوێت، گەیاندنەوەی هەموو هێزی پێشمەرگەو گەیشتنیان بەو سنورانەی بۆیان دیاریکرابوو، لەو ڕۆژە زستانە ساردەو بەفراویەدا شێر ئاساو بە ئەوپەڕی خۆشی و شادیەوە بۆ گەورەترین ئاوات و بەدیهاتنی خەونەکان گەیشتن، هاوکات لەژێر دروشمی ئەو پەیامە پیرۆزەی ئاشتبوونەوەی گشتی، لەچەند ڕۆژێکدا ڕاپەڕین زۆربەی خاکی کوردستانی ئازادکرد بەکەرکوکی کوردستانیشەوە، کە ڕۆڵەکانی جەماوەر لەپێشەوەی هەڵمەتی ڕاپەڕینەکدا بوون، بێ هیچ سڵکردنەوەیەکی لەچەك و دەزگا جۆربەجۆرەکانی ڕژێم، هەر لە سەربازگاکانیان و تانك و زرێ پۆشەکانیان و ئەمن و

ئیستیخباراتەکانیان، لەسەروو بەرنامەی هەموو ڕاپەڕینەوە هێزی پێشمەرگە هەوێنی تەواوی ڕاپەڕینەکە بوو، کە هەردەستەیەك پێشمەرگە ئەگەیشتنە ناو جەماوەرە ڕاپەڕیوەکە، پێناسە ناکرێت لەچ ئاستێکی خۆش و سەروەریدا جەماوەری ڕاپەڕیو بەپێشوازیانەوە ئەچوون، ئەوەندەی تر کڵپەو بڵێسەی ڕاپەڕین پەرەی ئەسەند، داموو دازگاکانی ڕژێمیان ئەگرت، پیاوەکانیان بەچ جۆرە بێ دەسەڵاتیەك زەلیل و دەستگیر ئەکرد، لەدادگایەکی واقعی و هەرکەس بەپێی لاپەڕەی تاوانەکانی لێی ئەپرسرایەوەو دادگای شۆڕشگێڕانەی جەماوەری و هاوسۆزی و ئەنجامی ئێش و ئازارەکانی دەرونیان بۆ ئەهێنایە بەرچاو، بۆ مێژوو گەلی ژێردەستە توانی خاکی نیشتمانی کوردستان پاك بکاتەوە، لەجێ پۆستاڵی دوژمنی داگیرکەر، برینەکانی جەستەی خۆی سارێژ بکات، بەم جۆرە هەتا کەرکوکی خەونی گەلی کورد ڕزگارکراو، بۆ یەکەمجار تۆڵەی دەها شەهیدو ئازارو ئەشکەنجەو سیاسەتی بەعەرەبکردن و دەرکردنی چەندەها خێزانی کوردی تیا کرایەوە، لەناو ڕاپەڕینەکان و ئازادکردنی شوێن و شارۆچکەکاندا، شارۆچکەی ڕانیەی بیتوین بوو بەبوك و سەرمەشق و ناوی پیرۆزی دەروازەی ڕاپەڕینی لەمێژوودا تۆمارکرد، کە لەڕۆژی (١٩٩١/٣/٥)،(١٩٩١/٣/٧) شاری سلێمانی هەڵمەت و قوربانی، (١٩٩١/٣/٨) چەمچەماڵ و بازیان و ئەڵڵایی و تەکیە، (١٩٩١/٣/٩) کۆیە، کەلار، دەربەندیخان شەقڵاوە(١٩٩١/٣/١١) شاری هەولێری هۆلاکۆبەزین و خانقین و دوز، (١٩٩١/٣/١٤) شاری دهۆك و دەورو بەری، (١٩٩١/٣/٢١) شاری کەرکوکی هەموو ئاواتی کوردو چارەنوسی کێشەکەی، (١٩٩١/٣/١٠) ڕەواندوزو سۆران.

## دروستبونی كۆڕه‌وی جه‌ماوه‌ری گه‌لی كورد

زۆر به‌داخه‌وه ئه‌م ڕاپه‌ڕینه مه‌زنه زوو به‌رپه‌رچی پیلانی بۆ دانرا، گه‌لی كورد به‌هه‌مان یه‌ككگرتوویی خسته ناو تراژیدیایه‌كی پڕ له مه‌ینه‌ت، له‌كۆتایی مانگی (٣/١٩٩١) كه ئه‌ویش به‌په‌لاماری ڕژێمی عێراق و دروستكردنی كۆڕه‌وێ مێژوویی چه‌ند ملیۆنی بوو، به‌هه‌مان شێوه‌ی ڕاپه‌ڕین یه‌كڕیزی به‌ڵام له‌بوارێكی پێچه‌وانه‌دا، هه‌موو كوردی لێكه‌وته‌وه كه هه‌رچه‌ند گه‌لی كوردی سه‌رجه‌م خسته بارێكی زۆر نائاسایی سه‌ختی ژیان له‌ڕۆژی (٣١/٣/١٩٩١) به‌دواوه، دوای گرتنه‌وه‌ی شاری كركوك به‌ده‌ستی ڕژێم ئه‌م ڕوداوه به‌چۆڵكردنی هه‌موو شارۆچكه‌و كۆمه‌ڵگاكان، به‌شاره گه‌وره‌كانیشه‌وه، ڕێگای دوورو درێژی سه‌خت و به‌رده‌م سه‌رماو باران و به‌فری هه‌موو شوێنه‌كانی كوردستانیان گرته‌به‌ر، بێگوێدانه ناله‌باری ڕێگاو سه‌رشاخ و چاڵ و چۆڵی و ناو ئه‌لْغام، ئه‌مه به‌جۆرێك ویژدانی هه‌موو ده‌وڵه‌تانی جهانی هه‌ژاندو هاوارو كێشه‌ی گه‌لی كوردی گه‌یانده سه‌ر مێزو به‌رده‌م كۆبونه‌وه‌كانی ئه‌نجومه‌نی ئاسایشی نه‌ته‌وه یه‌ككگرتووه‌كان و كه‌وتنه‌وه‌ی بڕیاری نێوده‌وڵه‌تی ژماره (٦٨٨) له‌ڕۆژی (٥/٤/١٩٩١)ی به‌پێویست لێ كه‌وته‌وه، به‌دیاریكرنی ناوچه‌یه‌كی ئارام و ئاسایش بۆ گه‌لی كورد له‌خاك و نیشتمانه‌كه‌ی خۆیدا، ئه‌مه هۆكاری دامه‌زراندنی ئیداره‌یه‌كی كورد خۆی بوو، له‌به‌ر سازدانێكی ئه‌زموونی به‌ڕێوه‌بردنی، خۆی له‌به‌رده‌م هه‌موو جهان و به‌پارێزگارو پاراستنی نێوده‌وڵه‌تی و دانانی بنكه‌ی ئینچه‌رلیك له توركیا، به‌م جۆره گه‌لی كورد كه‌وته ناو سازدانی ژیانێكی نوێ و داڕشتنی به‌رنامه‌ی له‌بارو گونجاو بۆ پێشه‌وه‌چوونی كێشه ڕه‌واكه‌ی، زیاتر له‌به‌رده‌م هه‌موو جهاندا، به‌م هه‌له ڕه‌خساوه، به‌ڵام ئه‌م ده‌سكه‌وته مه‌زنه به‌م بڕیاره نێوده‌وڵه‌تیه به‌هیمه‌ت و ده‌ستپێشخه‌ری فرانسوا میتران بوو. هه‌رچه‌ند به‌داخێكی زۆره‌وه گه‌لی كوردو شۆڕشه‌كه‌ی له‌م ڕاپه‌ڕینه‌دا چه‌نده‌ها فه‌رمانده‌و كادری سیاسی و عه‌سكه‌ری مه‌یدانی چه‌ند ساڵه‌ی له‌ده‌ستداو شه‌هید بوون له‌وانه:-

شه‌هیدی فه‌رمانده حه‌مه‌ڕه‌ش گه‌رمیانی و شه‌هید عبالرزاق و شه‌هید سالار حاجی قادرو شه‌هیدانی چیمه‌ن زیاتر له ٤٠ شه‌هید، به‌شه‌هید حه‌مه علی به‌رخانه‌قاو شه‌هید شۆڕشی حه‌پسه‌و شه‌هید ته‌های حاجی علی، سه‌رحه‌د قاره‌مان و شه‌هید علی ڕه‌سول و عوسمان ماوه‌تی و شێخ كه‌ریمی باخ و برهان حه‌مه‌ی مینه‌و حاجی محمودو عمر گه‌رمیانی كوڕی و شه‌هید جه‌وهه‌ری كۆیه‌و كه‌ماله سورو صلاح و فه‌لاح كوێخا عزیزو.....هتد.

جگە لەدەستدانی چەندەها منداڵی ساواو پیرو پەککەوتەو نەخۆش، لەبەر سەرماو ڕێگای دوورو سەخت گیانیان لەدەست دا، بەڵام ئەم تراژیدیایە لەبەرژەوەندی تەواوی گەلی کورد گەڕایەوە لەبەر ئەوەی تەنیا بەیەك پارچەیی و یەکڕیزی گەلی کورد بوو، هەرهەموو پێکەوە پشتیان لەدەستەڵاتی ڕەشی داگیرکەری ڕژێمی بەعس کرد، بەیەك دەنگ و بەو وەرچەرخانە مێژوییە سەختە ژێردەستیان ڕەت کردەوە. بەم دوو هەنگاوە بەنرخەی یەکڕیزیەی کورد لە (ڕاپەڕین و کۆڕەو) گەلی کوردو شۆڕشە ڕزگاریخوازەکەی دوو وەرچەرخانی مێژویی زۆر گرنگی تۆمارکرد، بوو بەسەرەتای بنەماو بنچینەیەکی پتەو بۆ داڕشتنی خواست و ئاواتەکانی لەئامێزی یەك پەیامی یەکتریدا، لێرەوە دروشمی خەباتی جەماوەری (ی.ن.ك) و حزبە کوردستانیەکان دەستی پێکرد.

## بۆچونەکان لەساتەکانی پێش هێرشی ئەنفالەکان دا:

سەرەتای مانگەکانی ساڵی (١٩٨٨) لەدوا مانگەکانی ساڵی (١٩٨٧)ەوە بەبارودۆخێکی تەمو مژاوی هاتە کایەوە، لەبەردەم هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان دا، چونکە تا دەهات سنورە ئازادکراوەکانیان تەسك ئەبوەوە، بەهۆی بەرفراوانی شەڕی عێراق – ئێران و گەیشتنی هێزی سەربازی ڕژێمی عێراق بەشوێنە سنوری و شاخاویەکان، کە لەوکاتەدا هێز لە بەرژەوەندی عێراق بەدی ئەکرا، لە بەرامبەر هاوکاری دەوڵەتیدا، لەسنورە ئازادکراوەکانی بەردەم هێزی پێشمەرگەی هەر سێ مەڵبەندەکەوە مەڵبەندی یەك بەتایبەت لەو چەند سەد دێهاتێکی هەموو گەرمیان هەتا چەمچەماڵ و بازیان و ناو حەوزەی قەرەداغ، بۆ مێژوو چەند دێیەکی شارەزوور لەبناردا مابوونەوە بە ئەوپەڕی خۆڕاگری و بە شانازیەوە ژیانیان ئەبردەسەر، لەبەردەم ڕۆژانەی تۆپ و هاوەن و لێدانی کۆپتەرو فڕۆکەی پیلادۆزو فڕۆکەی سیخۆ بە ناپاڵم و ڕاجیمەی کیمیاویدا، هەتا دوا ڕۆژی هێرشی بەدناوو شومی ئەنفالی ٢ی قەرەداغ و ٣ی گەرمیاندا، لەگەڵ بەرگری پێشمەرگەو ئاواتی مانەوەی شوێنەکانیاندا ململانێی مەرگیان کرد، بەهەموو منداڵ و خێزانەکانیانەوە، لەدوا بڕینی ئومێددا لەگەڵ کشانەوەی هێزی پێشمەرگەدا پێکەوە لەیەکتری دابڕان، بۆ ناو کارەساتێکی نادیاری چارەنوسدا. لەو دێهاتە خۆڕاگرانەی بناری شارەزوور کە تا دواسات مابونەوەو ئەو ژیانە پڕ لەمەترسیەیان هەڵبژارد بوو، لەهەمان کاتدا شەوو ڕۆژ لەخزمەتی پێشمەرگەو میوان و سەردانی کەسوکارەکانیان دا بوون، دێکانی: کۆرەی سەروو، ئاوەکەڵەی کوێخا قادر، دەربەند فقرە، شەمەو وێڵەکە، هەردوو قسرت بەپیاوی بەهیمەت حاجی حەمە خورشیدەوە دێی قەراڵ کە نزیکترین دێی

کۆمەڵگەی برایەتی و باریکە بوو، یەخی ماڵی تا ماوەیەك دژی ڕەمەزان، کانی هەنجیرو چەند دێیەکی نزیك برجەکەی دارە ڕەش و چەند دەواجینێك لەو ناوەدا خاوەنی زۆر خزمەتی پێشمەرگەو حەوانەیان بوون، زۆر لەدێهاتەکانی تر خانومکانیان چۆڵکرا بوون، هێشتا تێك نەدرابوون بارەگای تیپی ١٥ی شارەزووروو ماڵی پێشمەرگەکان لە کۆرەی سەروو بوون، زۆرترین هێزەکانی پێشمەرگە لەو ماوەیەدا بۆ چەند جارێك ڕەوانەی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) کران، کە لەسنورەکانی دژی سەرگەڵوو بەرگەلووی خۆڕاگردا بوون، کە کورد بۆ مێژوو قەرزاریانن، بەدژی هەڵەدن و دێکانی دۆڵی جافایەتیەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ساڵە زۆر باراناوی بوو لەگەڵ سەرماو سۆڵەو بەفردا، بۆ بەختی هێزی پێشمەرگەو خێزان و گوندنشینەکان کە ئەوە زۆربەی ساڵەکانی لێ قەومانی گەلی کوردە، کە بەو جۆرە بووە هەر لەساڵەکانی کۆتایی ١٩٧٤ و ١٩٨٨ و١٩٩١ ی کۆرەوە ملیۆنەکەی کورد کە ئەمجارەیان بەتەواوی لەشانس و سەرکەوتنی کوردا گەڕایەوە کە ئەویش ئەنجامی یەکگرتنی تەواویان بوو، بۆ ئێمە ماڵەکەمان لەدژی (شیوی قازی بوو) لەگەڵ ماڵی کاك عەلی حاجی عبدالله پێنجوێنی (علی بچکۆل) کادری کۆمەڵایەتی تیپی ٥٥ ی قەرەداخ، ئەو لەگەڵ خالدی برازاو پێشمەرگەکان گەیشتبوونە سەرکردایەتی، بۆ جاری سێیەمی ڕەوانەکردنیان.

## دەستپێکردنی هێرشی ئەنفال

هێرشی بەربڵاوی ڕژێمی عێراق بەناوی (ئەنفال) دەستی پێکرد، تا ئەوکاتە ناوی (ئەنفال) بەو جۆرە نەبیسترابوو، کاتێکیش هێرشی ئەنفالی ١ ی ڕژێم دەستی پێکرد ماوەی مانگێکی خایاند، سنورەکانی قەرەداخ و گەرمیان تا ڕادەیەك لەو کاتەدا هێمن بوو، جگە لەپەژارەو هەمیشە لەهەواڵی پێشمەرگەکانی ناو شەڕەکەدا هیچی تر نەبوو، چونکە هەموو خێزانەکانیان لەو دێیانەدا بوون و لەچاوەڕوانی گەڕانەوەیاندا بوون، بەجەماوەرەکەیشەوە، لەکۆتایی ئەنفالی یەکدا، لەپڕ ئازادکردنی شارۆچکەی هەڵەبجەو دەوروپشتی باسکرا، بەلام هەرزوو بێدەنگیەك کشا بەسەریدا، ڕۆژانە بەسرب فڕۆکەی جەنگی بەسەر ئاسمانی قەرەداغدا لەگەڕانەوەو ڕۆیشتن بوون، بۆ سەر هەڵەبجەو سنورەکە، دوای چەند ڕۆژ بێدەنگی مقۆ مقۆی لێدانی کیمیاوی بەسەر هەڵەبجەو ناوچەکەدا بڵاوبوبوەوە، لەسەرەتادا کارەساتەکە وەکو خۆی باس نەئەکرا بەتایبەت بۆ ناو جەماوەرەکە، لەڕۆژی (١٩٨٨/٣/٢٢) دا لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك، لەوانە کاك شێخ احمد شێخ عەبدول بەرزنجی کە بەرپرسی بەشی کۆمەڵایەتی سنورەکە بوو، هەروەها حاجی

عبدالله پێنجوێنی باوکی کاک عەلی بچکۆلمان لەگەڵدا بوو، ڕۆیشتن بۆ دێی سۆڵەی شارەزوور بۆ پرسەی پێشمەرگە (عمری کاکە حەمە شارەزووری) کە بەهۆی کیمیاویەکەی هەڵەبجە شەهیدبوو لەگەڕانەوەماندا بەلای ماڵی لالە سەرحەدا هاتین، کە بەخۆیو خێزانو کەسوکارو کوڕەکانیانەوەو براکانی سەرپەرشتی تیپی ٢٩ ی خنجەرەیان ئەکردو ماڵەکانیان لەم دێیەدا بوون، لەم کاتەدا دوو پیاو لە پێشمانەوە بەهەڵەداوان گەیشتنە لای لالە سەرحەدو نامەیەکیان دایە، کاك سەرحەد لەبەردەم دەرگای مەرقەدەکەدا دەستی بە خوێندنەوەی کرد، لەوکاتەدا ژنو منالەکان شڵەژانو یەکێکیان بەدەنگی بەرز ووتی یاخوا خێربێت، ئەویش ووتی خێر ئەبێتو ئێمەی بانگ کردو ووتی ئەم نامەیە بۆم هاتووە کە بەیانی هێرش لەچوار لاوە دێت بۆ سەر ناوچەی قەرەداخ بەڵکو لە دوکانەوە بەجهازەکەی تیپی ٥٥ ئاگاداری مەڵبەند (کاك عمر فەتاح) بکەن ئێمەیش لە هاتنەوەماندا زوو پەیوەندیمان کرد لەوەڵامدا کاك عمر فەتاح ووتی زانیاریمان هەیە ئێمە گەڕاینەوە ماڵەکەمان لەدێی شیوی قازی، لەگەڵ حاجی عبدالله دا بەبێ دەنگی دانیشتین، هەرچەند لەرێگادا دوو بەدوو لەگەڵ حاجی عبداللەدا هەندێ تەکبیرو قسەمان کرد، بۆ ئایندەی خێزانەکان (ئەڵماس)ی هاوسەرم تازە گەڕابوەوە بۆ لەدایك بوونی (دیار)ی کوڕمان، لەشەودا ئەڵماسو سێوەی ژنی مامۆستا عەلی یاری دۆمینەیان ئەکرد بێئاگا لەدنیای ڕووداوەکان هەتا کات ژمێر ٣٠ر١١ی شەو لە پڕ مقۆ مقۆی لێدانی کیمیاوی بڵاوبۆوە لەبارەگای پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی، مامۆستا شێخ جەمیل، کە لەدێی دوکانی داوەو بەئاشکرا باسکرا، کە لەدێی سێوسێنانیش لەئێوارەدا دراوەو کارەسات ڕوویداوە، لەوکاتە بەدواوە چەند پێشمەرگەو کەسانی دێی دوکان، گەیشتن بەزامداریو نیوە کوێری کیمیاویەکەی دوکان، لەوانە کاك حەمە ڕەزای مام برایمو کاك بەهزاد خانەقینی، بۆ بەیانی (١٩٨٨/٣/٢٣) هێزەکانی ڕژێمی بەعس لەهەموو لاکانەوە دەستی بەهێرش کردن کرد، بەرەو ناوچەو سنورەکانی هێزی پێشمەرگە لەبناری شارەزوورو ناوچەکانی قەرەداخ بەرەو شاخەکانی دەوروپشتی، لەسەرەتادا هێرشەکان لەسەرخۆ بوون، هێزەکانی پێشمەرگە ئەوەی لەسنورەکەدا مابونەوە، بەسەرپەرشتی کاك (عمر فەتاح) دامەزراندن لەهەموو شوێنە پێویستە بەرگریەکان، هێزی پێشمەرگەی سنوری قەرەداخ زۆر مەردانە هاتنە پێشەوە شان بەشانی پێشمەرگە، خێزانەکانی دێکان لەناو دێکاندا دەرچوون بەرەو چاڵو چۆڵیە نادیارەکان، بەئومێدی مانەوەیانو خۆپاراستنیان لەچوونە کۆمەڵگاکانی ڕژێم، ئێمە بۆ چەند ڕۆژێك ژنو منداڵەکانمان ناردە شوێنێکی نادیاری بەردەم دێی شیوی قازی، بەڵام تا ئەهات هێرشەکەی ڕژێم کە بەناوی (ئەنفالی ٢)ی قەرەداخ بوو زیاتر

چڕ تر ئەبوو، بەتایبەت تۆپی قورس‌و دوور هاوێژی بەکار ئەهێنا، فڕۆکەو خەڵکەکەیش مەترسی کیمیاوی زۆر لەسەر بوو، ناچار بڕیارماندا کە ژن‌و منالەکان دەرباز بکەین بەرەو کۆمەڵگاکان‌و ناو شارۆچکەی سلێمانی، من لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵمدا بوون کە کاک غەفور مۆریاسی‌و شەهیدان حەمەخان‌و ناصر مۆریاسی بوون، هەموو پێکەوەو ولاخی گوێدرێژمان بۆ گرتن، لەگەڵ خەڵکی دێی (فەقیرە)و کەسانی بەهیمەت (سەعدەخان)و کاک مستەفا کوێخا قادر، بە ئەمانەتەوە دامانە دەستیان‌و کاکە (دیاری) چەند مانگەمان جارێکی تر لەناو هێرشی ئەنفال‌و تۆپ‌و هاوەندا لەدێی فەقیرە خواحافیزیمان لێکردن، منیش لە ماڵەکەمدا تەنیا یەك دەستە گوێزان‌و تاقمی ڕیش تاشینەکەم خستە گیرفانی قەمسەڵەکەم.

## جیابونەوەی پێشمەرگەو خێزانەکانیان و جەماوەرەکە

لێرەدا پێشمەرگەو خێزان‌و جەماوەر لەیەکتری دابڕان، بێزانینی چارەنووس، بەڵام بەزۆری لە بناری قەندیل‌و دێکانی سورە دێ‌و قرناقا بەیەکتری گەیشتینەوە، دوای نزیکەی ۳ مانگ‌و بڕینی چەندەها کیلۆمەتر ڕێگای دوورو سەختی ناهەموار، ژن‌و منالیش خۆشاردنەوەی ناو شارو لەناو ماڵە خزم‌و دۆستەکاندا، بەدڵە لەرزێ‌و دڵە ڕاوکێی بەردەم (منع التجول) و کێومالی (ئەنفال) ی ناو شار، بەبڵند گۆی کۆپتەرو دەستەکانی دەزگاکانی ئەمن‌و بەناو (جیش الشعبیەوە) ڕژێم بەمەبەستی دەستگیرکردنی خێزانەکانی پێشمەرگە، ئەو خێزانانەی کە لەسنورە ئازادکراوەکانەوە گەڕابونەوە ناو شار، ئێمە بەهەرحاڵ دوای هێرشی بەدناوی ئەنفالی ۲ ی گەرمیان‌و گەڕانەوەمان بۆ سەر قۆپی‌و دەربازبوونمان لە قازانقایەوە بەجادەی ئەڵڵایی دا، بۆ چەمی ڕێزان‌و دەشتی کۆیە، من‌و چەند پێشمەرگەیەك فەرمانی ڕۆیشتنمان پێدرا لەدوا نیوەڕۆی (۱۹۸۸/٤/۲۷) ی کات ژمێر ۳۰ر٤ ی عەسردا بە ڕێکەوتین لەدێی (مەلا زیاد) ی دەشتی کۆیەوە لەگەڵ ئەم کادرو پێشمەرگانە: مامۆستا سۆران خانەقینی (مامۆستا محسن عەلی خان)، کاك مەلا ئەحمەد دەلوجە، حاجی عبدالله ئەوپەڕی، شەهید جەمال حاجی قادر خوشکەزای حەمە ڕەزا، کە بریندار بوو، کاك مەجید خانەقینی، خالد مام مەجید کانی پانکەیی برازام، کاك یاسین برای شەهید مام هێرش، بۆ شەو گەیشتنە دێی (مەرزان)، ئەوبەری جادەی تەقتەق، لەرۆژدا بۆ نیوەڕۆ چوینە دێی (دارا بەسەر) و ماڵی مامە (صابر) باوکی شەهید، نیوەڕۆ بردینیە ماڵەوە خزمەتی کردین لەناو چاویدا چەندەها یادگاری کوڕە شەهیدەکەی بەدی ئەکرا، کە جار جار بەهەمومانی ئەڕوانی، دوایی بەڕێی کردین، لەعەسردا بە

ڕێکەوتین لەلای دێی گۆپتەپەی جادەی کۆیە هەولێردا کە ئەبوایە لەکات ژمێر(٣٠ر٤) بۆ پێنجی ئێوارە لەجادەکە بدرێت لەبەر فڕۆکە، لەڕێگادا پێش پەڕینەوەمان بەلای ماڵی باوکی کاک کۆسرەتدا ڕۆیشتین لەناو تیغە شاخێکدا بوون، براکەی ڕێگاکەی پیشاندایین، دوایی ئەوانیش و هەموو هێزی پێشمەرگە سنورەکەیان بەجێ هێلا، ئێمە ئەو شەوە بەرەو دێی سماقولی هەر ئەڕۆیشتین، بارانێکی زۆر لێی داین و زۆر ماندوو بووین، بەدوای شوێنێکدا ئەگەڕاین کە پشویەك بدەین، و زۆریش تەڕو برسی بووین، بیرمان لەجێگایەك ئەکردەوە لەپڕ دەنگی سەگێك هاتە گوێمان، کە ئاوڕمان دایەوە ڕوناکی چەند چرایەك لەشیوێکدا ئەبینرا، ڕاستەوخۆ ڕوومان تێکرد، کاتێ گەیشتین چەند ماڵێکی ڕەش دەواری مەڕداری ئەو سنورە بوون، هەر زوو هاتن بەدەممانەوەو ئاگریان بۆ کردینەوە لەناو دەوارێکیاندا، ژنەکانیشیان بردە دەوارێکی تر، خواردنی ئێوارەیان بۆ گەرم کردینەوە زۆرمان خوارد، دوایی نوستین لە بەیانیدا خواردنی لۆرکیان داینێ، دواخزمەتی ناو خێزانەکان بوو، بەڕێیان کردین بەرەو سماقولی، لێرەدا هەستمان بەدڵنیایی لەخۆمان کرد چونکە گەیشتینە ناو هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندی ٣ ی هەولێر، لەدێکانی: سماقولی، نازەنین، کاموسەك چەند ڕۆژ ماینەوە، خۆمان شۆرد کە یەك کەڵ و پەلمان پێ نەبوو، جگە لەوەی بەرمان ئەبوایە لەپێشدا فانیلەو دەرپێکەی ژێرەوەمان بشۆردایە، هەتا ووشك ئەبووەوە، ئینجا خۆمان بشۆردایە، بەم جۆرە ڕۆیشتین هەتا دێکانی: کونە فلوسەو چێوێ و خەتێ و بارەگای مەڵبەندی ٣و شیرێ و مەلەکان و وەرتێی نزیك شاخی کاروخ، لەدێی شیرێ کاک حسێن ژاژڵەییمان پێگەیشت، کە ئەوکاتە ئەندامی مەکتەبی ڕێکخستنی شۆڕشگێڕان بوو لەگەڵ پێشمەرگەی برینداز کاك سەمەدە درێژ هێسرێکمان بۆ بەکرێ گرت هەتا بەشاخی شیرەدا سەرکەوێت، ڕێگاکەی وەکو پلەکانی دروست کرابوو، بەچەند سەعاتێك بڕیمان، گەیشتینە دێی وەرتێ لەماڵێکدا نان و چایەکیان داینێ، بۆ شەو چووینە بارەگای تیپی ٧٨ ی کاروخ، هەتا نیوەڕۆژی دوایی.

# ڕۆیشتنمان بەرەو بناری قەندیل

ئەو ڕۆژە (١٩٨٨/٥/٤) بوو هێرشی ڕژێم بەناوی ئەنفالی ٤ بۆ دەشتی کۆیە دەستی پێکردبوو، چەند هاوڕێیەکی خۆشەویستمان شەهیدبوو بوون، لەوانە شەهیدان: ئەنوەری خەلیفە خورشیدو وەستا تایەر سورو کاکە حەمە دسکەرەیی کە هاوڕێم بوون، چەند شەهیدێکی تر، لە عەسرێکی درەنگدا بەمەبەستی ڕۆیشتن چووینە ئەودیوی دێی وەرتێ، زۆر کۆبووینەوە لەوانە کاک حەمە ڕەحیم تۆفیق بوو، لەگەڵ دەستەیەکی پێشمەرگەی تیپی ٧٨ ی کاروخ و ٤٤ ی چەکوج بەمەبەستی شارەزایی و دەربازبوونمان هاتبوون، چەند ماڵێکی ناوچەی جەباری بەباری گوێدرێژ بەمناڵ و خێزانەکانیان، کات بەرەو تاریکی ئەڕۆیشت، هەموو سەیری سەرجادەی بناری شاخی کونە کۆترمان ئەکرد، کە ڕەبایەی ڕژێمی لەسەربوو، لەپڕ فیشەکێکی گڕدار بە درێژایی جادەکە تەقی و هەموو پێشمەرگەکان کەوتنە جموجۆڵ، دیاربوو نیشانەی چەکدارە کوردەکانی ئەو ناوە بوون، بۆ ڕۆیشتنی پێشمەرگەو پەڕینەوەیان، کاتێك لە ئاوەکەمان دا بۆ چوارجار بێ خۆهەڵکردن بێ پێڵاو داکەندن، هەتا گەیشتینە نزیکی چەکدارەکان کە بەچەکەوە پارێزگاریان لە پەڕینەوەی پێشمەرگە ئەکرد، لەکاتێکدا کە هێزی عەسکەری ڕژێم بەشەودا نەئەما، کە بەڕاستی خاوەنی خزمەت بوون لەو کاتەدا، شەو چووینە دێی ئینزێ و لێوژێ گیانمان هەموو تەڕبوو، بۆ چەند سەعات بەنان خواردن و خەوتنەوە ڕێگامان پێدرا لەکاتژمێر ٤ ی شەودا هەڵساین هەتا ڕەبایەکانی عەسکەری ڕژێم نەمان بینێ، کە هەموو کوردستانی تەنی بوو، چەند کیلۆمەترێك ڕێگامان بڕی، نزیك بارەگای دەفتەری سیاسی دیموکراتی ئێران بوینەوە، ڕێگایان نەدا بەجادەکەدا بەناویاندا بڕۆین، بەناچاری هەڵگەڕاینەوە بۆ بناری شاخی کونە کۆتر، بەبەردەم تاڤگەیەکدا ڕۆیشتین کە ڕقمان لەئاوو لەو دیمەنە جوانە سروشتیەی کوردستان ئەبوەوە، ئەوەندە ماندووبوین بێ‌خواردن بێ‌جێگا بێ‌حەوانەوە شەوو ڕۆژ ڕێگامان ئەبڕی بەحساب کە گەیشتینە دێی (پشت ئاشان) گوایە ڕزگارمان بووە لەهێزی ڕژێمی بەعس، کە ئاوڕمان دایەوە بەرامبەر بەو دێیانە چەندەها ڕەبایەی ڕژێمی لێ بوو، بەڵام ئەوەی کە لەباروو چاکبوو بۆمان زیاتر چەکداری کوردی ئەوناوە بوون، بەڕاستی هاوکاریان ئەکردین. لەیەکەم ماڵی پشت ئاشان جێیان نەکردین تەنانەت بۆ هەندێك خەویش، ناچار چووینە سەر بانیجەی (بانی) بەردەم ماڵێك، هێشتا هەڵنەسابوون لەخەو، ئێمە لە چاوەڕوانی هەڵسانیاندا لەسەر بانیجەکەیان بەو سەرمایە خەومان لێ کەوتبوو، لە هەڵسانماندا ژنێکی بەتەمەن هەندێ نان و ماست و چای بۆ

هێنایانە دەرەوەو خواردمان، ئینجا ناچار چووینە بارەگای کۆمیتە شارستانی (نەغەدە) ی دیموکراتی ئێران، هەرچی بارەگاکانیانە لەو سنورەدا کەوتنە خزمەتی بەرچاوو هاوکاری برایانەیان کردین بێ سڵ کردنەوە.

## بەیەك گەیشتنەوەی پێشمەرگەو خێزانەکانیان

لێرەدا هەر پێشمەرگەبوو کەوتنە بیرکردنەوە لەهێنانی ژن‌و منداڵەکانیان لەناو شارو شارۆچکەکانی بەردەستی ڕژێم بۆ ئەم سنوری دێیانەی بناری قەندیل، خەڵکی ئەم دێیانە هەتا دێکانی سنووری چوارقورنەو حاجیاواو قەڵادزێ‌و ڕانیە، بەهەموو چەکدارەکانیانەوە زۆر هاوکاری گەیاندنی خێزان‌و منداڵەکانی پێشمەرگەو کەسوکاریان کرد، بەسەیارەی خۆیان‌و بەوڵاخ، تەنانەت چەندەها کادرو پێشمەرگەشیان دەربازکرد، بەناو هێزی ڕژێمدا بەم سنورە بەسەلامەتی، جگە لە هاوکاری پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران کە درێخیان نەکرد لێمان، هەر پێشمەرگەیەك ژن‌و منداڵەکانی نەگەیشت زۆر دڵی خۆش نەبوو چەند ڕۆژێك لەوناوەدا پشویان ئەداو خواردنیان پەیدا ئەکرد، ئینجا وڵاخی ئێرانیان ئەگرت، بەرەو سنورەکانی ئێران هەر لە قاسمە ڕەشەوە هەتا بادیناوای پیرانشهر (خانە)، بەقەندیلی بەفریندا ئەڕۆیشتین، ئێمە لەسەرەتای مانگی ٦ دا ئەڵماس‌و منداڵەکانمان لەناو توبەرەی سەر وڵاخدا گەیشت، هەریەکە بەبنە گونیەکی کەلوپەلێکی بەریاندا لە(١٩٨٨/٦/٦)دا کاکە مجیدم بەخۆی‌و خێزانیەوە گەیشت، دوای ئەوەی خێزانەکەی کاك قادری حاجی عەلی (سەبیحە خان) ئەوی ئێمەی بەخوالێخۆش بوو کاك شێخ جەبارو کاك سەید عبداللەداو عومەری مامە ڕەشە ڕەوانە کرد، کە بەڕاستی لەوکاتەدا ئەم چەند پیاوە بۆ مێژوو بەهیمەت بوون، لەگەیاندنی چەندەها ژن‌و خێزانی پێشمەرگە، لەناو شاری سلێمانیەوە بەبناری قەندیل، بە ماندووبوونی خۆیان، ئێمە دوای چەند ڕۆژ پشودان‌و بەیەك شادبوونەوەی چەند مانگ‌و ساڵانمان، هەندێ خواردن‌و چوار بەتانیمان پێ بوو بۆ (١٦) سەر خێزان‌و بەدوو منداڵی ساواوەو دوو پێشمەرگە کە ئەوانیش کاك کەریم برای کاك محمود سەنگاوی‌و شەهید بەختیاری کاکە حەمە کوردستانی بوو، کە خوالێخۆش بووی باوکی بۆ شارەزایی ناردی لەگەڵمان تەکبیری ڕۆیشتنمان بۆ ئێران کرد، لە ڕۆژی (٩-١٠ /١٩٨٨/٦) شەش وڵاخمان گرت لەوڵاخدارەکانی سنوری پیرانشهر (خانە)، لەسەر قسەی وڵاخدارەکان بڕیارماندا دوای نیوەڕۆ بەڕێکەوتین بۆ ناوەڕاستی شاخەکەی پشتی قڕناقاو شەو لە هەوارێکیانداماینەوە، گیایەکی بەناوی (گەونیان) هێنا بۆ سوتاندن، هەتا بەیانی زوو گڕاندیان‌و چایان لێنا، ئێمە (دیارو ژینۆمان) منداڵ بوون‌و خستنمانە کونە

بەردەکانەوە، لەبەردەم ئاگرەکەدا، بەیانی زوو هەڵساین بەرێکەوتین، لەزۆر بەرزایی زنجیرە شـاخە بەفراویـەکانی قەنـدیل دا ئەبوایـە بەقنگـە خلیـسکێ برۆیـشتیایەتە خـوارەوە، لەنزمایی و چاڵاییەکاندا سواری وڵاخەکان بونایە، منداڵەکان هەرچەند دوانە بچوکەکە لەناو جامانـە بـە ملمـان و بەدەستمانەوە هـەڵمان ئەگرتن، لەشوێنە سـەختەکاندا، لـەرێگا وڵاخ بکەوتایەتە خوارەوە ئەکەوتە ناو تواوەی بەفرەکە کە جۆگایەکی ساردی دروست کردبوو، چـەند وڵاخ گیانیـان لەدەسـت دابـوو، لـەزۆر شـوێندا بەسـەر بەسـتەڵەکی بـەفری سـەر جۆگاکەدا ئەپەڕینەوە، ئێمەیش وڵاخێکمان ترازاو کەوتە خوارەوە، بەرێکەوت ئەو گونیە کەلوپەلەی بەسەرەوە بوو کە جلە تازەکانی منی تیابوو، لە قەرەداغەوە ناردبومەوە، دوایی بە بەردێکـەوە گیرابوەوە، خالدی برازام و شەهید بەختیار چوون هێنایانەوە لەخوارەوە، دوای هەندێ پشوو نانخواردنی نیوەڕۆ لەنیوەی ڕێگاماندا، ئینجا وڵاخێکی ترمان گرت و بەرێکـەوتین لەدەمـەو ئێـوارەدا گەیـشتینە سـەر بـەرزایی بـەڕوی دێی بادینـاوا، لێـرەدا ئەوەندە ماندوو بووبووین من بە دەممدا هات ووتم وەعدبێت ئەگەر امام خمینی بەخۆی و دارعاساکەی دەرم کات لەئێران ئەبێ بەم ڕێگایەدا نەگەڕێمەوە، ئەوەندە سەخت و ناخۆش بوو، بەتایبەت بۆ ژن و منداڵ، کە لەو کاتانەشدا بەتایبەتی مانگەکانی ٤ بۆ ١٩٨٨/٩ ئەم سنورانەی دێی سورە دێی بناری قەندیل بووبووە مەیدانی ئاڵۆزی و هاتوچۆی دەرەوە دەهـا خێـزان لەهاتنـە دەرەوە لەسـنورەکانی سلێمانی و ڕانیـەو قـەڵادزەو کۆمـەڵگاکانی و هـەڵاتنی بـەخێزانی چـەکدارەکانیان بـە چـەکەوە، لەهـەمان کاتـدا زۆر لەخێزانـەکانی پێـشمەرگەو خـەڵکی سـنوری مەڵبەنـدی ٢ی هـەولێر بەگشتی و بەتایبـەت دێی وەرتـێ، بەخێزان و ماڵ و ئاژەڵیانـەوە هـاتبوون، لەولاشـەوە لەئێرانـەوە چەندەها خێزانی سنوری هەڵەبجەیی کە لـەکاتی لێدانی کیمیاویەکـەدا پەرتـەوازەی ئێران ببووبوون، لێرەوە بەپێ و بـەوڵاخی سـواری ئەگەڕانـەوە دیمـەنێکی زۆر سـەیری نـاو گێـژاوی بـێ چارەنووسـی لـەم کاتەدا بەسەر گەلی کورد پیشان ئەدا، لەرێگەی قەڵاتوکانـەوە بەهاوەنی سەربازەکانی ڕژێم لە پەڕینەوەیاندا لە مسافەیەکدا ئەیگرتەوە، هەندێ خێزان و منـاڵی هـەڵاتووی شـەهیدکرد، کە زۆر بەداخەوە دوای بڕینی چەندەها سەیتەرەو شوێنی ژێر دەسەڵاتی ڕژێم، بەهەر حاڵ ئێمە لە ڕۆژی(١٩٨٨/٦/١١) لەنزیك گۆڕستانەکەی دێی بادیناوا شوێنمان گرت، دەوڵەتی ئێـران هەنـدێ هاوکـاری نـان و پێویـستی ئامـادەکردبوو بەخەڵکـە ئاوارەکـەی ئـەدا بـەڵام لـەڕووی ئیـدارەوە ئاوارەکـان زۆر شپرزە بوون، دیـارو ژینـۆ کـە منـاڵ بوون لەبـەر سـەرما نەخۆش کـەوتن، ناچار هـەوڵی ژوورێکمـان دا لـەناو دێکـەدا، داوای گراجی تراکتۆرێکمـان کرد لەژنێك ئەویش مەردانە ژورێکی سەر تەنوری داینێ، بۆ ئێمە لە جێگای قەسرێك بوو،

چەند ڕۆژێك تیا بووین، دوایی بەرگەمان کرد لە قاسمە ڕەش و ژوورەکەمان دا بەکادرێك بەناوی (سەلام کوێی)، سەیارەمان گرت بەرەو شاری بانە، ئەوەی لەرێگادا جێگای سەرنجمان بوو سەیری دێهاتەکانی ئەمبەرەوبەری جادەکە بوو، دیمەنی ڕازاوەی دێکان خوێندنگاو ئاوو مزگەوتی ناو دێ، بەری دێکەو هات و چۆی سەیارەو خەڵکەکەی بۆی، چەندەها بەئاواتی شادبوونەوەی دێکانی خۆمانی بە بیرماندا ئەهێنا، بەم شێوەیە گەیشتینە ناو شاری بانەو ماڵی پورە خەجێ، لە دڵەڕاوکێی ئەوەدا شوێنمان نەبێت، بەڵام خۆشبەختانە هەر دەرگامان کردەوە دوو ژوری بەتاڵ بوو بێ پرسی چوینە ناویان و بەتانیەکمان داخست، لەگەڵ کاکە مەجیدمدا چوینە بازاڕ هەندێ پێویستی ماڵمان کڕی، بەڵام حکومەتی ئێران نەیهێشت زۆر بمێنینەوەو پشویەك بدەین، دەستی کرد بەگرتنی ئاوارە، ناچار ئێمەیش بەپەلە پروزە پیکابەکەی کاك صدیق ئامە ڕەشمان گرت کە پیاوێکی زۆر چاکی سنوری پێنجوێن بوو، هەر ئەو ئێوارەیە گەیاندینیانە ناوچەی شلێری ئازاد، کە بەهۆی چونە پێشەوەی هێزەکانی ئێران بۆ گەرمك لەدواوە چەند دێیەك ئاوەدان کرابوەوە، لەوانە (گۆخڵان، وێنە، دارۆخان)، هەروەها بارەگای تیپی ٢٥ی کوڕەکاژاو کە خوالێخۆش بوو کاکە حەمە مۆریاسی فەرماندەی بوو بەزۆربەی پێشمەرگەو خێزانەکانیانەوە لەم دێیانە بوون، ئێمەیش لەدێی (بایەڵان) بە ئومێدێکی زۆرەوە کەپرمان کرد، زۆر مەردانە کاکە حەمەو خێزان و پێشمەرگەکان هاتن بەدەممانەوە، بەڵام مێشولەیەکی یەکجار زۆری لێ بوو، لەگەڵ ئەوەشدا دوای نزیکەی دوو هەفتە مەسەلەی کشانەوەی (عقب نشینی) هێزەکانی ئێران و هاتنە پێشەوەی هێزەکانی عێراق هاتە کایەوە، ئێران دەستی کرد بە تەقاندنەوەی پردو سەربازگەکانی، هەتا سەردەشت و بانەیش، ئەو سنورەی ئێمەیش بەگشتی درایە بەر تۆپ، ناچار تراکتۆرمان لەدێی ساوجی ئێران پەیدا کرد، هەر بەئومێدی مانەوەمان لەناو دێکانی کوردستانی عێراقداو لە شوێنی ئازادا، بەخەیاڵی خۆمان ئەو ڕۆژە بە منداڵەکانمانەوە بەتراکتۆر هەتا دێکانی لارەدەرو شایانی میشیاو ڕۆیشتین لەوێ کەوتینە ناو سەربازگەی ئێرانەوە سەر بەفەرماندەی سەقز بوون گەڕاندینیانەوە بۆ دواوە.

## ژیانی ئاوارەیی ناو ئێران

ناچار خۆمان کرد بەدێی ساوجی ئێراندا، دوای شەوو ڕۆژێك کە چاسرێکمان لەساوجی هەڵدا، ئینجا خۆمان کرد بەگەڕەکی چوارباخی چۆڵی مەریواندا، بە ئارەزووی خۆمان خانوومان ئەگرت، کە هەموویان لەترسی لێدانی فڕۆکەو تۆپی عێراقی چووبوونە شوێنەکانی دەرەوەی مەریوان: جوجەسازی (دەواجنەکە)، کانی دینار، نێ، و لەژێر بەرقەڵاو دزایۆ شوێنی تر، کە پێشتر لێی بوون هەتا وەستانی شەڕ، ئینجا ئێرانیەکان هاتنەوە ناو شارو ئێمە چوینە شوێنەکانی ئەوان، بەم جۆرە ژیانی ئاوارەیی (پەناهندەیی) لەنێوان (٢١/٦/١٩٨٨ بۆ ٢٥/٧/١٩٩١) بەسەربرد، کە خواو گۆڕانکاریەکان والە بەرژەوەندی کوردی گێرا، بەرنامەی گەڕانەوەمان بۆ کوردستان دەست پێکرد. لەدوای ڕاپەرین و کۆرەوی بەهاری ساڵی ١٩٩١ هەموو خێزانەکانمان بە ئەوپەڕی خۆشحاڵی و شانازیەوە بەڕەسمی سەیارەمان گرت بۆ خێزان و کەلوپەلی ماڵەکانمان، لەناو مەریوانەوە بۆ مەرزی سنوری گۆخڵانی کوردستانی عێراق، هەتا سەیارەکان بەئارەزووی خۆیان لەهەردوو دیوەکەدا پشتیان ئەنا پێکەوەو ماڵەکانمان تیا ئەگۆڕی، هاتینەوە ناو شارۆچکەی پێنجوێنی وێرانکراو، کە هێشتا بەچەند هەزار خێزانی ئاوارەی تیابوو ڕێکخراوە دەوڵەتیەکان هاوکاری خواردەمەنیان ئەدانێ و دوای ماوەیەك پشوودان لە پێنجوێن لە ڕۆژی (٥/١٠/١٩٩١) بەتەواوی بەخێزانەوە گەڕاینەوە ناو شاری سلێمانی، بەمەبەستی بەردەوام بوونەوەی خوێندنی مناڵەکانمان و ئیشکردنمان.

## ژیانی نووسەر


نووسەر لەگەڵ سەرۆك مام جەلال

من ناوم (عوسمان کەریم) کانی پانکەیی شارەزووری (شێخ سمایلی)، ناحیەی سەیدسادق، لەدایك بووی ساڵی (١٩٤٨)، دەرچووی پەیمانگای مامۆستایان، مامۆستا بووم لە قوتابخانەکانی دێکانی: بێستانسور، کانی پانکە، شانەدەری، گرێزە، لەپاڵ خزمەتی مامۆستایی و پەیوەندیم بەبزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردمان بووە، لەساڵی ١٩٦٨ لە ڕێگای کادری بەهیمەتی کاك حەمە ڕەشید حاجی شەریف باریکەیی، لەساڵەکانی حەفتاکاندا ئەندامی ڕێکخراوی سەیدسادق و نوێنەری مامۆستایانی ئەو سنورە بووم، بەشداری کۆنگرەی چوارەمی مامۆستایانی کوردستان لەسلێمانی و کۆنگرەی دەیەمی مامۆستایانی عێراق لەبەغدا کردوە، بەشداری شۆڕشی ئەیلوول بووم هەتا کۆتایی لە (١٩٧٥/٣/٢٦). لەڕۆژی (١٩٧٦/٥/١)ەوە پەیوەندیم بە ڕێکخستنی (ی.ن.ك) کرد لەڕێگای کادری پشوودرێژ مامە عبدالخالق هەورامی و دواتر هەڤاڵی سەرکردە شەهید مامۆستا جەمال تایەر، لەگەڵ بەڕێزان: سەلیم سەرسپی و کاك کەمال تایەرو قادری حاجی علی و خوالێخۆش بوو کاك قادری فەقێ عەلی و کاك عوسمان حەمە ڕەزا لەناو شاری سلێمانی و ڕێکخراوی سیروان لەسەید سادقی شارەزوور، بەشداریم کردوەو لەگەڵ شەهید حمە ئەمین فەتاح و حەمەنوری گەرمیانی لەسنوری شارەزوور، لەدوای ساڵەکانی ١٩٧٥ەوە خۆم و خێزانەکەم (ئەڵماس فەرەج) و براو کەسوکارەکەم بەتایبەت کاکە مجیدی برا گەورەم زۆر ئازاریان داین لەلایەن دەزگاکانی ڕژێم بەگشتی و بەتایبەت ئەمنی سەیدسادق و عەسکەری سنورەکە، بەگرتن و چاودێری و لێپرسینەوەمان پێکەوە، هەتا لەساڵی ١٩٨٦ بۆ دواجار دەرکرام لە پیشەکەم، پەیوەندیم بەهێزی پێشمەرگەوە کرد لەسنوری مەڵبەندی یەك، لە تیپی ١٥ ی شارەزوور دوایی تیپی ٥٥ ی قەرەداخ و ٣٥ی کوڕەکاژاو ٣٩ ی خنجەرە بەرپرسی ڕێکخستنی تیپ بووم، بەشداری هەردوو بەرگری لەهێرشی ئەنفالی (٢ - ٣) ی قەرەداخ و گەرمیان کردوە، سێ ساڵ بەئاوارەیی بەرپرسی پەیوەندییەکانی سنوری مەریوانی (ی.ن.ك) بووم ، دوایی بەرپرسی ئیشوکاری

پێشمەرگەو خێزانە ئاوارەکان و ئەندامی ڕێکخراوی کرای بووم هەتا ڕاپەرین، تیپێکیان بۆ دروست کردم، دوایی بەتالیۆنێك بەناوی بەتالیۆنی ۳۱۰ ی کانی پانکەو سپاردم بەبرا گەورەکەم بە ناوی (مام مەجیدی کانی پانکەیی) لەو سنورەداو بەشداری هەموو چالاکیەکان خۆیشم لەسەر پێشنیاری بەڕێز کاك ئاسۆی شێخ نوری چوومە سنوری مەڵبەندی ڕێکخستنی سلێمانی، لە لیژنەی کاسبکارانەوە بووم بەسەرپەرشتیاری کۆمیتەی ۷ و دوایی لێپرسراوی کۆمیتەی۲ی ڕێکخستنی سلێمانی کە لەسەر دابەشکردنی سنوری ناو شارەکە کرابوو، لە ڕۆژی(۱۹۹٤/۷/۱٤) بووم بە کارگێڕی مەڵبەندی سەرپەرشتیاری ڕێکخستن لەگەڵ شەهید ڕزگار محمد عبداللەو حاکم ئیبراهیم و شەماڵ عبدالوفا. پاشان بووم بەلێپرسراوی ئیدارەی لەشکری شارەزوور، دوایی جارێکی تر بەئەندامی مەڵبەندی سلێمانی هەڵبژێرامەوەو کرام بە (لێپرسراوی کاروباری کۆمەلایەتی مەڵبەند) هەتا ۳۱ ی ئاب، لە هاتنەوەکەماندا کرام بە (لێپرسراوی کۆمیتەی شۆفێران)، پاشان لێپرسراوی کۆمیتەی سەید سادق مەڵبەندی شارەزوور، هەروەها کرام بەجێگری بەڕێوەبەری گشتی لەدەزگای شەهیدانی گەلی کوردستان، ئەم ئەرکەم زۆر لا پیرۆزبوو، بەخواستی خۆم بوو بۆ خومەتی کەسوکاری شەهیدە سەربەرزەکانمان، کاك شێخ عەلی (خولە کەشکۆڵ) بەرپرسمان بوو. دوای ئەوە لەسەر داوای خۆم کرام بە کارگێڕی مەڵبەندی پێشمەرگایەتی ئێستا بەپلەی جێگری لێپرسراوی مەڵبەندی پێشمەرگە دەست بەکارم، لەبواری سیاسی و عەسکەریدا خواستی گەورەم ئیش کردنە لەخزمەتی تەواوی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەو پێناوەدا باپیرەم و مامە قادرم شەهیدی ئەو کاتەیەو باوکیشم بەبرینداری شەڕی ئاوباریك هەرزوو کۆچی کردووە چونکە تەنیا لای ژنێکی دەرمانزانی سروشتی ئەو کاتە لەدێی بانی بنوکی سورێن چارەسەر کراوە، ئێمەش زۆرترین ژیانمان ئاوارەیی بووە، هەریەکەمان لە دێیەکی ئەم کوردستانە لەدایك بووین، لەناوچەکانی شاربازێڕو پێنجوێن و شلێرو دوای گەڕانەوەمان بۆ سنووری شارەزوری خۆمان لەدێی کانی پانکەی خواروو. ئاوات و خەونەکانم ئەوەیە کە گەلی کورد بگاتە ڕزگاری تەواوی، خاکی پیرۆزی (کوردستان) لەچوارچێوەی کیان و سنوری دیاریکراو دروشمی ئالای بەرزو شەکاوەی لەسەر نەخشەی جیهان و لەناو ئەنجومەنی نەتەوەیەکگرتوەکاندا بچەسپێت.

**نووسەر**

**مامۆستا عوسمان کانی پانکەیی**

**۲۰۰٦/۳/۵ یەك شەممە**

## زنجیرەی کتێبی ڕووناکبیری

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | کورد و کوردستان | دیرك کینان |
| ٢ | ٢٤ ساڵ خەبات و سەروەری و هەڵوێستی شۆڕشگێڕانە | کۆمەڵە نووسەرێك |
| ٣ | ڕێکخستن و ڕێکخستنی سیاسی | ئەحمەد صالح |
| ٤ | ئازادی، دیموکراسی و کۆمەڵی مەدەنی | دیڤید بیتهام/ کیڤین بیڤل |
| ٥ | کارنامەی ڕێکخراوی لێبوردنی نێو دەوڵەتی چیيە | و.جەبار شێخە |
| ٦ | ڕێبازەکانی ئاسایشی نەتەوەیی | |
| ٧ | ئـــاراستەی گشتی پەرەسەندنی دانیشتوانی | د. شاکر خەسباك |
| | | و.عەتا قەرەداخی |
| ٨ | کۆمەڵی مەدەنی | و. ئەبوبەکر خۆشناو |
| ٩ | ماف مرۆڤ | شێخ عەبدول |
| ١٠ | بەڕێوەبردن، چەند بابەتێکی هەڵبژاردە | رفیق سالح ئەحمەد |
| ١١ | ئیخوان موسلمین | و. ئەمرۆ هەینی |
| ١٢ | ڕاپۆرتی سیاسیی یەکەمین کۆنگرەی گشتی (ی.ن.ك) | فوئاد تاهیر سادق |
| ١٣ | هۆشیاریی ڕامیاری | |
| ١٤ | پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان | و. شێخ عەبدول |
| ١٥ | هەڵسەنگاندنی شێوازی دیموکراسی | و. ئاوات ئەحمەد |
| ١٦ | سیاسەتمەدارانی کورد سیاسەتەکانی Pkk ڕیسوا دەکەن | |
| ١٧ | گریمانە ئەژادیەکان و کۆسپەکانی بەردەم | و. ئازاد گەناوی |
| ١٨ | کتێبی ڕێکخستن | و. بێستون سابوراوایی |
| ١٩ | فەلسەفەی ماف مرۆڤ | سەمەد زەنگەنە |
| ٢٠ | دەربارەی هونەری سەرکردایەتی کردن | و. سابیر بەکر بۆکانی |
| ٢١ | ئیسلام و بە عیلمانیکردن | و. ژیانەوە |
| ٢٢ | دیموکراسی و ماف مرۆڤ | و. ئەبوبەکر خۆشناو |
| ٢٣ | سەید قوتب و تیۆری تەکفیرکردنی کۆمەڵگەو دەوڵەت | شوان ئەحمەد |
| ٢٤ | چەند بابەتێك دەربارەی مێژووی کورد | ئا: ئەژی |
| ٢٥ | ئامانجەکانی سۆسیالیزم | و. سامی قادر |
| ٢٦ | پۆست مارکسیزم | و. ئەکرەم میهرداد |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٧ | سۆسیال دیموكراسی لە چەند دیدێكەوە | چەند نوسەرێك |
| ٢٨ | ڕاپەڕینی ئاگری | و. ئەرسەلان بایز |
| ٢٩ | چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان | |
| ٣٠ | ململانێو گۆڕانكاری ڕێكخراوەیی | و. ئەبوبەكر خۆشناو |
| ٣١ | ناسیۆنالیزم | و. ڕێباز مستەفا |
| ٣٢ | خەباتی ڕزگاریی نەتەوایەتی گەلی كوردستان | سیروان نەجم وعلی قادر |
| ٣٣ | جیهانگیریوداهاتووی دەوڵەتی نەتەوەییو پرسی كورد | رفیق سابیر |
| ٣٤ | دەستووری حزبی و دەستووری هەڵبژاردن | د. محەمەد غەفوری |
| ٣٥ | مێژووی هاوچەرخی كورد | و. ئەبوبەكر خۆشناو |
| ٣٦ | كۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی | |
| ٣٧ | ڕێكخستن | محەمەد مەنگوڕی |
| ٣٨ | ڕۆژنامە و جەنگ | نەوزاد عەلی ئەحمەد |
| ٣٩ | ناسیۆنالیزم | و. ڕێباز مستەفا |
| ٤٠ | میتۆدی لێكۆڵینەوەی زانستی | |
| ٤١ | هەڵبژاردن" شێوە و تایبەتمەندییەكانی | و. ئەبوبەكر خۆشناو |
| ٤٢ | ئیسلامی سیاسی | شوان ئەحمەد |
| ٤٣ | ڕاپەڕینی كەركوك ساڵی ١٩٩١ | پشكۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری |
| ٤٤ | صفحات من تأریخ الاتحاد الوطنی الكردستانی | |
| ٤٥ | كوردستانی بەر ئاگرباران | و. ئەبوبەكر خۆشناو |
| ٤٦ | كتێبی ڕێكخستن | محەمە مەنگوڕی، ئەحمەد ساڵح، بێستون سابوراوایی |
| ٤٧ | فەرهەنگی كادیر | محەمەد فاتیح |
| ٤٨ | دیكتاتۆر | شۆڕش عومەر |
| ٤٩ | هونەرەكانی ئەدەب لە ڕۆژنامەگەری نهێنی كوردیدا ١٩٦١-١٩٩١ | نەوزاد عەلی ئەحمەد |
| ٥٠ | گەشتەكانی ماركۆ پۆلۆ | و. ڕێباز مستەفا |
| ٥١ | ڕۆژانی سەخت | د. ئەرسەلان بایز |
| ٥٢ | سۆشیال دیموكراتی نێودەوڵەتی | ئا: حەمەچاوشین |
| ٥٣ | ململانێی هەڵبژاردن | و. ئەبوبەكر خۆشناو |
| ٥٤ | جیۆپۆلەتیكی ٢٤ وڵات | ئا: عومەر ڕەسوڵ خدر |
| ٥٥ | بەجیهانیبوونی وڵاتانی باشوور | ئا: عومەر ڕەسوڵ خدر |
| ٥٦ | بەجیهانیبوون و ئاراستەی تیرۆر | عومەر ڕەسوڵ |
| ٥٧ | دەروازەیەك بۆ ڕاپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر ١٩٥٣ | سالار سیامەند |
| ٥٨ | جیۆپۆلەتیكی دنیا و بەجیهانیبوون | عومەر ڕەسوڵ خدر |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٩ | هونەری سیاسەت | سەمەد زەنگەنە |
| ٦٠ | جولەكەكانی شاری سلێمانی | بەرزان ئەحمەد كوردە |
| ٦١ | بەرەنگارییەكان و ئامادەكردنی سەركردە | محەمەد فاتح |
| ٦٢ | بەراوردو جیاوازی نێوان ماركسیزم، سۆسیال دیموكرات، سۆسیالیزمی دیموكراسی | ئەكرەم مهرداد |
| ٦٣ | ڕۆڵی نەوت لە چارەنووسی گەلی كوردستاندا | كاوە نادر قادر |

## زنجیرەی نامیلكە

| ژ | ناوی نامیلكە |
|---|---|
| ١ | خوێندنەوەیەكی كتێبی (بارزانی و بزوتنەوەی نەتەوەیی كورد) |
| ٢ | دووبابەت دەربارەی توركیا |
| ٣ | گەلی ئەمازیغ لە نێوان تەعریب و پاراستنی ناسنامەدا |
| ٤ | جاڕی گەردوونیی ماڤی مرۆڤ |
| ٥ | دەربارەی خۆتێ گەیاندنی مرۆڤدۆستانە |
| ٧ | كێشەی كەمینە نەتەوەییەكان لە وڵاتانی عەرەب دا |
| ٧ | مێژووی بزووتنەوەی سەندیكایی |
| ٨ | چەند گوتارێك دەربارەی سیڤرەولۆژان |
| ٩ | كۆماری مهاباد |
| ١٠ | كێشەی ئاو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا |
| ١١ | بەرنامەی (اجندە)ی M.B.C دەربارەی ڕێككەوتننامەی واشنتۆن |
| ١٢ | دروست بوونی دەوڵەتی كوردی |
| ١٣ | لە پێناوی یەكگرتنێكی نیشتمانیدا |
| ١٤ | قۆناغە مێژوویییەكانی ماڤی مرۆڤ |
| ١٥ | عێراق و بڕیارەكانی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان |
| ١٦ | سەربەستییە گشتییەكان و ماڤی مرۆڤ |
| ١٧ | لە گفت و گۆیەكی چەند تەوەریی و هەمە لایەن دا مام جەلال بۆ LBC دەدوێ |
| ١٨ | عەبدولناسرو ئیخوان موسلمین |
| ١٩ | دەقی ڕێككەوتننامەی واشنتۆن |
| ٢٠ | دەقی كۆنگرەی ڕۆژنامە نووسی هەڤاڵ مام جەلال |
| ٢١ | هەڤاڵ مام جەلال بۆ B.B.C و C.N.N دەدوێ |
| ٢٢ | فەلسەفەی سۆشیال دیموكرات |
| ٢٣ | هەڤاڵ مام جەلال بۆ كوردستانی نوێ و لە كوردستانی نوێ دەدوێ |
| ٢٤ | گوتاری هەڤاڵ مام جەلال بەبۆنەی ڕۆژی جیهانیی ژنان |

٢٥ گوتاری هەڤاڵ مام جەلال لە یادی ڕزگارکردنی کەرکوك

٢٦ گوتاری هەڤاڵ مام جەلال لە کۆنفرانسی مەڵبەندی ڕێکخستنی سلێمانی

٢٧ بەڕێوەبردن و سیاسەت

٢٨ گوتاری هەڤاڵ مام جەلال لە یادی (٢٤) ساڵەی دامەزراندنی (ی.ن.ك) دا

٢٩ هەندێ مەسەلەی پێویست لە کاری ڕێکخراوەییدا

٣٠ ئاشتی، دیموکراسی، مافی مرۆڤ، مافی چارەنووس

٣١ دەرزی و مرۆ

٣٢ دەربارەی هەڵبژاردن

٣٣ دەربارەی دیموکراسی

٣٤ نەتەوە و نەتەوایەتی

٣٥ بەڕێوەبردنی گۆڕانکاری ڕێکخراوەیی

٣٦ بەڕێوەبردنی گۆڕانکاری ڕێکخراوەیی

٣٧ بەڕێوەبردنی ململانێی ڕێکخراوەیی

٣٨ پێداچوونەوەیەك بە ئەزموونی (ئیخوان موسلمین)دا

٣٩ بەڕێوەبردنی گەشەسەندنی ڕێکخراوەیی

٤٠ ئیسلامی سیاسی (ئیخوان موسلمین وەك حزب)

٤١ شەبەك: مێژوو، ئاین، سەرژمێر

٤٢ گرووپەکانی "تەکفیر" لە میسر

٤٣ ئیسلام و دیموکراسی

٤٤ ئیسلامی سیاسی و کۆمەڵگای مەدەنی

٤٥ دەروازەیەك بۆ زانستی سیاسی و بیری سیاسی کوردستان

٤٦ مام جەلال ووردەکاری‌و ڕاستی‌یەکانی ڕاپەڕین ڕوون دەکاتەوە

٤٧ پوختەی ژیاننامەی مامۆستا برایم ئەحمەدی نەمر

٤٨ مێژووی بیری کوردی

٤٩ لە یۆبیلی زیوین دا مام جەلال سەروەری‌یەکانی یەکێتی دەگێڕێتەوە

٥٠ لە فەرهەنگی ئابووری‌یەوە

٥١ یەکێتی و پرەنسیپەکانی تیۆری کوردایەتی نوێ

٥٢ ئەنفال لۆناغێکە لە پراکتیك کردنی جینۆساید

٥٣ مێژووی پەرەسەندنی پارەو ئەرکەکانی

٥٤ وتار بێژی و چۆنیەتی خوێندنەوەی گوتاری سیاسی

٥٥ دیدارێك لەگەڵ ئەحمەد ئۆکجو ئۆغلوو کۆنووسی قسەکانی ئۆجەلان

٥٦ ڕەگی دیموکراسی لە کوردستان دا

٥٧ یەکێتی‌ی نیشتمانی‌ی کوردستان بۆچی ...؟

٥٨ کادر کێیە؟

